حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
زانکۆی ڕاپەڕین
فاکەڵتی زانستەمرۆڤایەتیەکان
بەشی مێژوو

# ڕانیە ١٩٥٨-١٩٩١

توێژینەوەیەکی مێژووییە لە بارودۆخی
(سیاسی، کارگێڕی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و ئابووری)

ئەم نامەیە
پێشکەشی فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی ڕاپەڕین کراوە
وەک بەشێک لە پێداویستیەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر
لە مێژووی نوێ و هاوچەرخدا

لەلایەن
**هانا عەلی حەمە**
بەکالۆریۆس لە مێژوو – زانکۆی کۆیە ٢٠١٠-٢٠١١

بەسەرپەرشتی
پ. ی. د. سەروەر عەبدولرەحمان عومەر

گەڵاڕێزانی ٢٧١٦ کوردی                تشرینی دووەمی ٢٠١٦ زاینی

## بەڵێنامە

مـن کە نـاوو واژۆم لەخـوارەوە هـاتووە، بەڵـێن دەدەم، کە ئەو ماسـتەرنامەیە بە ناونیشـانی ڕانیـە ١٩٥٨-١٩٩١ توێژینەوەیـەکی مێژووییـە لـە بـارودۆخی (سیاسـی، کـارگێڕی، کۆمەڵایـەتی، ڕۆشنبیری و ئابووری)، هەمووی کاری ڕەسـەنی خۆمە، جگە لەو شـوێنانەی کە ئامـاژەم پێکردووە، هەموو نوسینەکان وئەنجامەکانی ماستەرنامەکە کاری سـەربەخۆی خۆمە و پێشـتر لە هـیچ شـوێنێک بڵاوم نەکردۆتەوە و پێشکەشی هیچ لایەکم نەکردووە بۆ ئەوەی بڕوانامەیەکی پێ وەربگرم، هەروەهـا پابەندم بەوەی لەهەر شوێنێک شتێکم وەرگرتبێت ئاماژەم بەسەرچاوەکەی کردووە.

واژوو:

ناوی خوێندکار: هانا عەلی حەمە

بەروار: / / ٢٠١٦

## پشتگیری و ڕەزامەندیی سەرپەرشتیار

من کە ناوو واژۆم لەخوارەوە هـاتووە، پشـتگیری ئەوە دەکەم، کە ئەو نـامەیە لەژێر چاودێری مـن لە فـاکەڵتی زانسـتە مرۆڤایەتیەکـان ئامـادەکراوەو نوسـراوەو نێـردراوە، وەک بەشـێک لە پێداویسـتییەکانی پێدانی بڕوانـامەی ماسـتەر لە پسـپۆڕی مێـژووی نـوێ و هـاوچەرخ، مـن پشـتگیری دەکەم و ڕازیم کە بەو شێوەیەی ئێستا پێشکەشی لیژنەی گفتوگۆ بکرێت.

واژوو:

ناوی سەرپەرشتیار: پ.ی.د. سەروەر عبدولڕەحمان عومەر

بەروار: / / ٢٠١٦

## پشتگیری و ڕەزامەندی سەرۆکی بەش

مـن کە نـاوو واژۆم لەخـوارەوە هـاتووە، پشـتگیری ئەوە دەکەم، کە ئەو ماسـتەرنامەیە هەمـوو پێداویستیەکانی جێبەجێ کراوە، هەروەهـا ئامـاژە بە پشـتگیری و ڕەزامەنـدی سەرپەرشـتیار، مـن ئەو ماستەرنامەیە دەنێرم بۆ گفتوگۆ.

واژوو:

ناو: د. دارا تۆفیق کاکەأمین

سەرۆکی بەشی مێژوو

بەروار: / / ٢٠١٦

## پشتگیری و ڕەزامەندی بەرپرسی هۆبەی خوێندنی باڵا

مـن کە نـاوو واژۆم لەخـوارەوە هـاتووە، پشـتگیری دەکەم، کە هەمـوو پێداویسـتیەکانی ئەو ماستەرنامەیە جێبەجێکراوە، بۆیە ڕازیم کە ئەو ماستەرنامەیە بنێردرێت بۆ گفتوگۆ.

واژوو:

د. ساکار محمد حسن

بەرپرسی هۆبەی خوێندنی باڵا

بەروار: / / ٢٠١٦

## بڕیاری لیژنەی گفتوگۆ

ئـــێمە ئەنـــدامانی لیـــژنەی گفتووگـــۆ و هەڵســـەنگاندن، ئەو نامەیەمـــان بـــە ناونیشـــانی: ڕانیــە ١٩٥٨-١٩٩١ توێژینەوەیــەکی مێژووییــە لــە بــارودۆخی (سیاســی، کــارگێڕی، کۆمەڵایــەتی، ڕۆشنبیری و ئابووری)، لەلایەن خوێنکار (هانا عەلی حەمە) وە، وەک بەشێک لە پێداویستیەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامــەی ماســتەر، لــە مێــژووی نــوێ و هاوچەرخــدا، پێشکەشــکراوە، نامەکــەمان خوێنــدەوە و لەگــەڵ خوێندکارەکــەدا گفتوگۆمــان دەربــارەی نــاوەڕۆک و لایەنــەکانی تــری کــردوو، بڕیارماندا بە پلەی (              ) بڕوانامەی ماستەری لەمێژووی نوێ وهاوچەرخ پێبدرێت.

واژۆ:
ناو: پ.ی.د پشکۆ حمە تاهیر
ئەندام
بەروار:      /     / ٢٠١٦

واژۆ:
ناو: پ.ی.د جمال فتح الله طیب
سەرۆکی لیژنە
بەروار:      /     / ٢٠١٦

واژۆ:
ناو: د. دارا توفیق کاکەمین
ئەندام
بەروار:      /     / ٢٠١٦

واژۆ:
ناو: پ.ی.د. سەروەر عبدولرەحمان عومەر
ئەندام و سەرپەرشتیار
بەروار:      /     / ٢٠١٦

---

لە لایەن ئەنجومەنی فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی ڕاپەڕینەوە، پەسندکرا

واژۆ:
ناو: د. پێشەوا حمید عبداللە
ڕاگری فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتیەکان
بەروار:      /     / ٢٠١٦

**پێشکەشە بە**

## ڕانیە

"ئەو شوێنەی تێیدا لە دایک بووم و گەورە بووم"

# سوپاس و پێزانین

١- زۆر سوپاس بۆ سەرپەرشتیاری توێژینەوەکەم (پ. ی. د. سەروەر عەبدولڕەحمان عومەر)، کە لەماوەی توێژینەوەکەدا ئەرک و ماندووبونێکی زۆری لەگەڵم کێشا.

٢- زۆر سوپاس بۆ (د. دارا تۆفیق کاکەمین) سەرۆکی بەشی مێژووی فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی ڕاپەڕین، کە بەتێبینی و سەرنج و ڕەخنەکانی هاوکاری زۆری کردم.

٣- سوپاسی تایبەت بۆ محەمەد ئەمین عارف، بەڕێوەبەری کتێبخانەی ڕانیە، د. پشتیوان شەفیق ئەحمەد، د. ئاراس عەبدولڕەحمان مستەفا، م. ڕێبوار خالید مستەفا، م. ئارام قادر سابیر، م. سەردار عەبدولڕەحمان ئیبراهیم (سەحەری)، م. شاسوار موحەمەد مەحمود، م. هەرێم حەسەن خدر، کۆسرەت خدر ئەبوبەکر، هونەر عەلی حەسەن، م.چنار عومەر محەمەد، م. ڕێبوار حوسێن ڕەسوڵ، م. شەماڵ محەمەد وەسمان، م. یادگار مستەفا ئیبراهیم، کە بەکۆمەڵێک سەرچاوە هاوکاری باشیان کردم.

٤- سوپاسی تایبەت بۆ بەڕێزان: مۆفەق حەمەد مەجید، م. ئیبراهیم سەید فەیزوڵا ڕەشید، نیاز حەمە عەزیز، عومەر ئەحمەد ئیسماعیل(زێڕنگەر)، کە شارەزایەکی باشیان هەبوو لە سەر مێژووی ڕانیە و ڕووداوەکان، سوودێکی زۆرم لە ڕێنماییەکانیان بینی لە توێژینەوەکەدا.

٥- سوپاسی تایبەت بۆ هەردوو بەڕێزان (دانا عەلی تەها، م. محەمەد وەتمان محەمەد)، کە لە ڕووی تەکنیکیەوە هاوکاری زۆریان کردم.

٦- سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم، کە بە وشە یان وتەیەک هاوکاریان کردم، کە لێرەدا بواری ئەوە نییە یەکەبەیەکە ناویان بهێنم.

# کورتکراوەکان

| ناو | هێمای کورتکراوە |
| --- | --- |
| بۆ پارت و رێکخراوەکان | |
| یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان | ینک |
| پارتی دیموکراتی کوردستان | پدک |
| پارتی سۆسیالیستی سەربەخۆی کوردستان | پاسۆک |
| بۆ سەرچاوە کوردییەکان | |
| لاپەڕە | ل |
| چاپ | چ |
| بەرگ | ب |
| ژمارە | ژ |
| وەرگێڕان | و |
| بۆ سەرچاوە عەرەبییەکان | |
| صفحة | ص |
| المصدر السابق | م. ص |
| ترجمة | ت |
| طبعة | ط |

## پوختەی توێژینەوەکە

ئەم نامەیە بریتیە لە توێژینەوەیەکی مێژوویی دەربارەی شارۆچکەی ڕانیە، لە ژێر ناونیشانی: ڕانیە ١٩٥٨-١٩٩١ توێژینەوەیەکی مێژووییە لە بارودۆخی (سیاسی، کارگێڕی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و ئابووری)، هەوڵدراوە بە شێوەیەکی زانستی بەپشت بەستن بە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی کار لە بابەتەکەدا بکرێت، کە پێکهاتووە لە دەروازە و سێ بەشی سەرەکی بەم شێوەی خوارەوە:

دەروازە: بریتییە لە سەرنجێکی گشتی لەبارەی ڕانیە، تا کۆتایی هاتنی سەردەمی پاشایەتی لە عیراق لەڕووی جوگرافی و ژیاری و سیاسییەوە. لە خاڵی یەکەمدا، تیشک خراوەتە سەر پێشینەیەکی جوگرافی و ژیاریی ڕانیە لە ڕووی هەڵکەوتەی جوگرافی و ناوی ڕانیە و شوێنەوارە کۆنەکانی ناوچەکە، لە خاڵی دووەمدا، بە شێوەیەکی پوخت باس لە دۆخی سیاسیی ڕانیە لە سەردەمی میرنشینە کوردییەکانەوە تا دەگاتە شۆڕشی (١٩٥٨) عێراق کراوە.

بەشی یەکەم: بۆ بارودۆخی کارگێڕی و سیاسیی ڕانیە تەرخانکراوە، لە باسی یەکەمدا، بە دوو تەوەر باس لە لایەنی کارگێڕی ڕانیە کراوە لەڕوی ڕێکارە ئیدارییەکانی شارۆچکەکە و ئەرکەکانی، ئەو شارەدێیانەی کەخراونەتەسەری و لێیکراونەتەوە، لەگەڵ مێژووی دامەزراندنی فەرمانگەکانی ڕانیە، لە باسی دووەمیشدا، باس لە کاریگەرییەکانی شۆڕشی (١٩٥٨) عێراق و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول و کاردانەوەکانیان لەسەر ڕانیە و خەڵکی ناوچەکە کراوە، لە باسی سێیەمیشدا بە دوو تەوەر باس لە بارودۆخی سیاسیی کراوە لەماوەی ساڵانی (١٩٧٥-١٩٩١)، لەگەڵ ئەو خۆپیشاندانە سیاسیانەی کە لەو ماوەیە لە ڕانیە ئەنجامدراون.

بەشی دووەم: باس لە باروددۆخی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ڕانیە کراوە، پێکهاتووە لە پێنج باس، لە باسی یەکەمدا، باری ئاوەدانی ڕانیە و گەشەی دانیشتوان و دیمۆگرافیای ناوچەکە باسکراوە. لە باسی دووەمیشدا، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ناوچەکە لە ڕووی هۆز و سیستەمی خێڵایەتی و پێکهاتەی چینە کۆمەڵاتیەکان شیکراوەتەوە، باسی سێیەمیش تەرخانکراوە بۆ نەریت و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی ناوچەکە لە ڕووی خێزان، هاوسەرگیری، منداڵ، جل وبەرگ، پرسە، زمان و هتد... لە باسی چوارەمیشدا، باس لە دۆخی خوێندن و تەندروستی ڕانیە کراوە لە ڕوی جۆر و خزمەتگوزاری و قۆناغی مێژووییەوە، لە باسی پێنجەمیشدا، باس لە دۆخی ڕۆشنبیری ڕانیە کراوە، سەرەتای جوڵانەوەی ڕۆشنبیری ناوچەکە خراوەتە ڕوو، دواتریش باس لە لایەنەکانی میوزیک، شانۆ، شیعر و چالاکییە وەرزشیەکانی ڕانیە کراوە.

بەشی سێیەم: تایبەتە بە باروددۆخی ئابووری ڕانیە و بە سێ باسی سەربەخۆ باس لە چالاکی ئابوری ڕانیە کراوە، لە باسی یەکەمدا، باس لە بنەما سروشتی و مرۆییەکانی ڕانیە کراوە لەڕووی ئاووهەواو، خاک، دەرامەتی ئاویەکان، کانزا و هتد.. لە لە باسی دووەمدا، بە شێوەیەکی فراوان دۆخی کشتوکاڵی ناوچەکە وەک چاکترین کەرتی ئابوری خراوەتە ڕوو لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، لە ڕووی

جۆری بەروبووم و سیاسەتی کشتوکاڵی و موڵکداری زەوی و خزمەتگوزارییەکانی حکومەت لەم بوارەدا، دواتریش باس لە دۆخی سامانی ئاژەڵ ، مەڕ، بزن، گامێش، مانگا، پەلەوەر و ماسی کراوە وەک تەواوکەری کەرتی کشتوکاڵ لە ناوچەکەدا، لە باسی سێیەمیشدا بەدوو تەوەر دۆخی پیشە و پیشەسازی و دۆخی چالاکی بازرگانی لە ڕانیە خراوەتەڕوو، لەتەوەری یەکەمدا، باس لە جۆری پیشەکان و دۆخی پیشەسازی کراوە لەڕووی جۆر و ژمارەوە هەروەها سیاسەتی حکومەت لەم بوارەدا. لە تەوەری دووەمیشدا، ڕەوشی بازرگانی بە هەردوو بواری بازرگانی ناوخۆ و دەرەو جۆری ئەو کاڵاو کەلوپەلانەی مامەڵەیان پێوەکراوە، لەگەڵ ئەو ڕێگرییانەی، کە هاتۆتە بەردەمی. لە کۆتایی بابەتەکەدا، ئەو دەرەنجامانە خراونەتەڕوو، کە توێژەر لە چوارچێوەی نوسینی توێژینەوەکەدا پێیان گەیشتووە، لەگەڵ لیستی سەرچاوە و پاشکۆ و پوختەی توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

# ناوەڕۆک

## پێشەکی

ڕانیە یەکێکە لە شارۆچکە گرنگەکانی باشووری کوردستان، بوونی سەرچاوەیەکی زۆری ئاو و باشی لە جۆری خاکی و دەوڵەمەندی لە بنەما سروشتیەکان، وایکردووە هەر لەکۆنەوە ببێتە شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤ و کۆبوونەوەی دانیشتوان، هەروەها بوونی ژمارەیەکی زۆری پاشماوەی شوێنەواری مرۆڤ لە ناوچەکە گەواهیدەری ئەم ڕاستییەن. هەڵکەوتە جوگرافییەکەی لە ڕووی جیۆپۆلەتیکی و جیۆستراتیژییەوە، پێگەیەکی سیاسی گرنگی بە ناوچەکە بەخشیوە، لە زۆرێک لە قۆناغە مێژووییەکان بۆتە جێگەی ململانێی نێوان هێزە سیاسی و باڵادەستەکان، ئەمە جگە لەوەی ناوچەکە لە ڕووی چالاکییە ئابورییەکانی وەک کشتوکاڵ، ئاژەڵداری و پیشەسازی شوێنێکی زۆر گونجاوە و هاندەرێکی باشە بۆ وەگەڕخستنی ئەم چالاکیە ئابورییانە. بە شێوەیەکی گشتی ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) ی ڕانیە مێژوویەکی گرنگ و هەستیارەو تایبەتمەندیی خۆی هەیە، ئەو ڕووداو و چالاکیانەی لەم ماوەیەدا لە شارۆچکەکەدا ڕوویانداوە، بابەتێکی سادەنین و جێگەی هەڵوەستە لەسەرکردنن و تێگەیشتنیان پێویستی بە توێژینەوەی تایبەت هەیە بە پشت بەستن بە بیرکردنەوەیەکی دروست و تێڕامانێکی زانستیانە.

### گرنگی توێژینەوەکە

شارۆچکەی ڕانیە لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) چەندین گۆڕانکاری گرنگی سیاسی و کارگێڕی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری تیایدا ڕوویداوە، کە کاریگەری لە سەر ناوچەکە و تەواوی عێراقدا هەبووە، بەتایبەتی لە بواری سیاسی، کە هەندێک جار ڕانیە بۆتە چەقی ململانێ سیاسییەکان، ئەمە جگە لە بوارە جۆربەجۆرەکانی تری وەک کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و چالاکی ئابووری، کە لە هەموویاندا ڕانیە خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەبووە بە شێوەیەک کە جیاوازبێت لە ناوچەکانی تری باشووری کوردستان و ئەو مافەی پێ ببەخشرێت، کە توێژینەوەی سەربەخۆی لەسەر ئەنجامبدرێت.

### هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتەکە

هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ کەمی توێژینەوەی زانستی مێژوویی لەسەر ئەم شارۆچکەیە دەگەڕێتەوە، بوونی کەمترین توێژینەوە کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێت بووە هاندەرمان، کە ئەم بابەتە هەڵبژێرین و بە پشت بەستن بە مێژووی زارەکی ئەم کەم و کوڕیانە پڕبکەینەوە و سود لەو کەسانە وەربگرین، کە لەم ماوەیەدا لە ناوچەکەدا ژیاون و تا ئێستا لە ژیاندا ماون، بە توێژینەوەکەمان ڕێگربین لە لەناوچوون و فەرامۆشکردنی ڕووداوە جۆربەجۆرەکان، لە پێناو پاراستن و دەرخستن و بە زیندوو هێشتنەوەی مێژووی ئەم ناوچەیە.

**ئامانجی توێژینەوەکە**

ئامانجی توێژینەوەکە بریتیە لە خستنە ڕووی ئەو دۆخە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەی کە لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا ڕانیە پێیدا تێپەڕبووە، ئەمەش بە ئاوڕدانەوە و تۆمارکردن و وردبوونەوە لە مێژووی ئەم ناوچەیە و دەرخستنی لایەنە شاراوەکانی مێژووی ڕانیە و گەیاندنی ئەم مێژووە بە توێژەر و خوێنەران بە شێوەیەکی بابەتی و ئەکادیمی و زانستی.

**میتۆدی توێژینەوەکە**

بەهۆی هەمەجۆری لە بابەتی توێژینەوەکەمان بە لەبەرچاوگرتنی مێژووی سروشتی شار و گونجاندنی بەو ڕێبازە مێژووییانەی کە لە توێژینەوەی زانستیدا بەکاردەهێنرێن، بە شێوەیەکی گشتی لەم توێژینەوەدا هەوڵدراوە سوود لە ڕێبازە جۆربەجۆرە مێژووییەکان وەربگرین، لەوانە: ڕێبازی گێڕانەوە، زارەکی، بەراوردکاری، شیکاری، بە پێی گونجان لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی کە لە بەردەست بوون و بەکارهاتوون.

**ئاستەنگ و گرفتەکانی توێژینەوەکە**

یەکێک لە گرفتەکانی ئەم توێژینەوەیە کەمی سەرچاوە بووە، لەگەڵ نەبوونی کەمی توێژینەوەی مێژوویی لە سەر شاروچکە، کە ببێتە بەرچاوڕوونی و ڕێبەرێک بۆ کارەکەمان، چونکە ئاشکرایە زۆربەی توێژینەوە مێژووییەکانی کوردستان زیاتر توێژینەوەی سیاسین، جگە لەمەش نەبوونی بەڵگە و دۆکیۆمێنت و لەناوچوونی زۆری بەڵگە مێژووییەکان بە هۆی ناهەمواری دۆخی سیاسی، نەبوونی هۆشیاری مێژوویی لای تاک لە هەڵگرتن و پاراستن و ئەرشیفکردنی بەڵگە نامە و نوسراوەکان. بەشێوەیەکی گشتی کارکردن لە مێژووی شاروچکە کارێکی سەخت و دژوارە و پشوو درێژی و ئارامگرتنی زۆری پێویستە، گەر بەوریاییەکی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵ نەکرێت، ناگەیتە ئەنجام. لەم توێژینەوەیەدا بۆشایی کەمی سەرچاوەی نوسراو بە سەرچاوەی مێژووی زارەکی پڕکراوەتەوە، مێژووی زارەکیش مێژوویەکی پڕکیشە و ئاڵۆزە و وردەکاری زۆری پێویستە، بە تایبەت بۆ مێژوویەک، کە بەتەنها سیاسی نەبێت، لە ڕوویەکی تریشەوە زۆرێک لەو کەسانەی کە پێشتر لە ناوچەکە ژیاون و بەشدار بووی چالاکی ڕووداوەکان بوون، بەشێکیان لە ژیاندا نەماون و بەشێکی تریان ڕوویانکردۆتە دەرەوەی وڵات، جگە لەم گرفتانە گرفتێکی تر گرفتی قەیرانی ئابووری بوو، کە لە ماوەی توێژینەوەکەماندا هەرێمی کوردستان بە قەیرانێکی دارایی دژواردا تێدەپەڕێ، ئەم گرفتەش کاریگەریی خراپی لەسەر دەستکراوەیی ئابووری و سایکۆلۆژیی توێژەر دروست کردبوو، بەشێوەیەک کە ببووە بەربەست لەبەردەم چالاک ڕاپەڕاندنی کارەکاندا.

**پێکهاتەی توێژینەوەکە**

ئەم توێژینەوەیە پێکهاتووە لەدەروازە و پێشەکی و سێ بەش، هەر بە شێکیش لە چەند باسێک پێکهاتووە، لەگەڵ ئەنجام و پاشکۆ و لیستی سەرچاوە و پوختەی توێژینەوەکە بە زمانی کوردی و

عەرەبی و ئینگلیزی. لە دەروازەی توێژینەوەکەدا، بە دووخاڵ سەرنجێکی گشتی دەربارەی ڕانیە تا کۆتایی هاتنی سەردەمی پاشایەتی لە عیراق لە ڕووی جوگرافی و ژیاری و سیاسیەوە خراوەتە ڕوو.

بەشی یەکەمی توێژینەوەکە لە سێ باس پێکهاتووە، لە باسی یەکەمدا، بە دوو تەوەر باس لە لایەنی کارگێڕی ڕانیە کراوە، لەتەوەری یەکەمدا باس لەو گۆڕانکارییە کارگێڕییانەی کە بەسەر ڕانیەدا هاتوون کراوە، لە ڕووی بڕینی قۆناغە کارگێڕییەکانی شارەدێ و شارۆچکە، ئەو شارەدێیانەی خراونەتە سەری و لێی جیاکراونەتەوە. لە تەوەری دووەمدا، باس لە ژمارە و جۆری دامەزراوە و مێژووی ئەو فەرمانگە حکومیانە کراوە کە لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا لە ناوچەکە کراونەتەوە. لە باسی دووەمیشدا، باس لە دۆخی سیاسی ڕانیە کراوە لە سەر ئاستی ڕووداوەکانی عێراق و باشوری کوردستان و کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر ناوچەکە، لە باسی سێیەمیشدا، هەرەسی شۆڕش و کاریگەریەکانی و قۆناغی سیاسی ماوەی ساڵانی (١٩٧٤-١٩٩١) خراوەتەڕوو، لەڕووی چالاکی پارتە سیاسییەکان و ئەو ڕاپەڕین و خۆپیشاندانانەی کە لە ماوەی (١٩٨٢-١٩٩٠) ڕانیەی گرتۆتەوە.

بەشی دووەم، بە پێنج باس لایەنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ڕانیە خراوەتەڕوو، لە باسی یەکەمدا، باس لە باری ئاوەدانی ڕانیە و دیمۆگرافیا و گەشەی دانیشتوان کراوە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ئامارانەی، کە حکومەتی عێراقی ئەنجامیداوە، لە باسی دووەمیشدا باس لە دۆخی چینەکۆمەڵایەتیەکان و هۆزایەتی ڕانیە کراوە، مێژووی هۆزەکانی ( ئاکۆ، بڵباس، جاف، شیلانە، شاور، هتد) خراوەتە ڕوو، لە باسی سێیەمدا، تیشک خراوەتە سەر کلتوور و داب و نەریتی ناوچەکە بە شێوەیەک باس لە خاڵە زەق و گرنگەکانی ئەم بوارە کراوە، لە باسی چوارەمیشدا، باس لە ڕەوشی خوێندن و تەندروستی ڕانیە کراوە، لە ڕووی گەشە و ژمارە و جۆر و شێوازی خزمەتگوزاریەوە، لە کۆتا باسیشدا، کە باسی پێنجەمە، بە شێوەیەکی چڕ و فراوان باس لە دۆخی ڕۆشنبیریی ناوچەکە کراوە لە ڕووی چالاکی ڕۆشنبیری و هونەری بە هەموو لقەکانیەوە لەگەڵ کورتەیەک لە مێژووی چالاکی وەرزشی.

بەشی سێیەمیش، کە کۆتا بەشی توێژینەوەکەمانە باس لە بارودۆخی ئابوری ڕانیە کراوە، لە باسی یەکەمدا، باس لە بنەما سروشتی و مرۆییەکانی ناوچەکە کراوە، لە ڕووی ( ئاوهەوا، خاک، دەرامەتی ئاو، ڕێگاوبان، بازاڕ، دەستی کار، هتد)، لە باسی دووەمیشدا، باس لە چالاکی کشتوکاڵی کراوە بە هەردوو بواری ڕووەکی و ئاژەڵی، سیاسەتی حکومەت لە بواری کشتوکاڵ و ڕەوشی جووتیار، لەگەڵ جۆری ئەو بەروبوومە کشوکاڵیانەی کە لە ناوچەکەدا چێنراون و گرنگیان پێدراوە، جیاکردنەوەی بەروبوومە خۆراکی و پیشەسازییەکان، هەروەها دۆخی گشتی بەخێوکردنی ئاژەڵ لە ناوچەکە لەڕووی جۆر و شێوازی بەخێوکردنەوە لەگەڵ گرنگیدان بە پەلەوەر و ماسی، لە باسی سێیەمیشدا، بەدوو تەوەر باس لە پیشەسازی و بازرگانی کراوە، لە تەوەری یەکەمدا، پیشە و پیشەسازییەکان لە ڕووی جۆری و چۆنیەتیەوە بە پێی قوناغە مێژوویەکان ناسێنراوە، لە تەوەری دووەمیشدا، باس لە بازرگانی ناوخۆ و دەرەوە کراوە، لەگەڵ جۆری بازرگانی و ئەو کەلوپەل و کەرەستانەی، کە بازرگانیان پێوەکراوە، لەگەڵ ئەو ئاستەنگ و گرفتانەی هاتوونەتە بەردەم ئەم کارە.

**شیکردنەوەی سەرچاوەکان**

لەم توێژینەوەیەدا بەهۆی هەمەجۆری لە توێژینەوەکەدا و کەمی سەرچاوە لە سەر بابەتەکە، هەوڵدراوە سوود لە زۆرترین سەرچاوە وەربگیرێت، گەر بە وشەیەکیش بێت، کە، زۆربەیان بە زمانی کوری و عەرەبین، لە دەروازەی توێژینەوەکەدا، سوودێکی زۆر لە کتێبەکەی سیسیل جۆن ئیدمۆنس: کورد، تورک، عەرەب، وەرگیراوە کە خۆی ئەفسەر بووە لە ڕانیە لەگەڵ کۆمەڵێک یاداشت، کە بەشێکیان خۆیان لە ناوچەکەدا ژیاون و بەشداری ڕووداوەکان بوون، لەوانە: ( میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: حەقایقی بەسەرهاتی شێخ محمود لە پەنای ئیستقلالی کوردیدا، ڕەفیق حلمی: یاداشت (کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود)، بەرگی یەکەم و دووەم، ئەحمەد تەقی: بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ محمود و سمکۆ، عبدالرقیب یوسف و سدیق سالح: بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، یاداشتەکانی شاکر فەتاح، ئاوێنەی ژینم، بەرگی یەکەم)، لە بەشی یەکەمیشدا، لە ڕووی کارگێڕییەوە سوودێکی زۆر لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی (الوقائع العراقیە) وەرگیراوە، کە ڕۆژنامەیەکی یاساییە و لە لایەن حکومەتەوە دەردەچێت، لەگەڵ ئەو فەرمانگە حکومیانەی کە لە ڕانیەدا بوونیان هەیە، لە لایەنی سیاسیش سوود لە یاداشتەکانی (عبدللە ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری: یاداشتەکانم، بەشی یەکەم، تۆفیقی مەلا سدیق: بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی حزبایەتی و پێشمەرگایەتی ودوورخرانەوەم، مەسعود بارزانی: بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، دووەم (شۆڕشی ئەیلوول١٩٦١-١٩٧٥)، مەسعود محەمەد: گەشتی ژیانم، میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: بەسەرهاتی سیاسی کورد (١٩٥٨/٧/١٤-١٩٨٥)، بەرگی یەکەم، ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول بنیاتنان و هەڵتەکاندن (١٩٦١-١٩٧٥)، د. عبدالستار تاهر شەریف: ململانێ لەگەڵ ژیاندا (١٩٣٥-١٩٧١، بەرگی یەکەم)، کە ئەم نوسەرانە خۆیان لە ناوچەکە ژیاون و بەشی زۆری ڕووداوەکانیان لە شێوەی یاداشت تۆمارکردووە، هەروەها د.واحید عومەر محێدین: دانوستانەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد و حکومەتەکانی عێراق (١٩٢١-٢٠١٢)، کە لەبنچینەدا تێزێکی دکتۆرایە باسی لەسەرجەم ئەو گفتوگۆ و دانیشتنانە کردووە، کە لە ڕانیە ئەنجامدراون، لەگەڵ ماستەرنامەی هاوکار کەریم حەمە شەریف: شۆڕشی ئەیلوول لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە ڕێکخستن و چالاکییە سەربازییەکان (١٩٦١-١٩٧٠)، کە باسی لە بەشێک لە ڕووداوەکانی ڕانیە کردووە لە ماوەی شۆڕشی ئەیلوولدا. لە بەشی دووەمیشدا، لە ڕووی داب ونەریت و گەشەی دانیشتوان و باری چینایەتی ناوچەکە، سوود لەکۆمەڵێک کتێب و ئامار و سەرژمێری دانیشتوان وەرگیراوە، لەوانە سەرژمێری و ئامارەکانی سالانی (١٩٥٧، ١٩٧٧، ١٩٨٧)، کە کۆمەڵێک داتاو زانیاری گرنگیان تیدایە لەسەر ڕانیە، لەگەڵ عباس العزاوی: عشائرالعراق، ج٢، کە کتێبێکی بەنرخ و بەهادارە و زانیاری باش و گرنگی تێدایە لەسەر تەواوی هۆز و خێڵەکانی ناوچەکە، هەروەها گۆڤاری ڕانیە، کە گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتیی وەرزییە، هەرچەندە ئەم گۆڤارە لە ڕووی زانستیەوە زۆر ئەکادیمی نیە، بەڵام لە ژمارەکانیدا مێژووی بەشێکی ڕانیە تێدا تۆمارکراوە و

سـوودێکی زۆری لێبینـراوە، بـۆ لایەنـی ڕۆشـنبیریش سـوودێکی زۆر لـە ڕۆژنامـەی (هاوکـاری) و (العـراق)، کـە پاشـکۆیەکی بـەزمانی کـوردی هـەبووە وەرگیـراوە، ئـەم دوو ڕۆژنامەیـە لـە ڕێگـەی پەیامنێرەکانیانـەوە بەشـی زۆری چالاکیـە ڕۆشـنبیرییەکانی ناوچەکـەیان تۆمـارکردووە، بەتایبـەت ڕۆژنامەی هاوکاری. لە بەشی سێیەمیشدا، کە تایبەتە بە چالاکی ئابووری لە ڕووی بنەما سروشتی و مرۆییەکانـەوە سـوودێکی زۆر لـە : ( پشـتیوان شـەفیق ئـەحمـەد: شـیکردنەوەی جوگرافیـایی بـۆ دابەشبوونی دانیشتوان لە شارۆچکەی ڕانیە (١٩٥٧-٢٠٠٦)، کە لەبنچینەدا ماستەرنامەیەکی زانستییە، هەروەها تێزی دکتۆرای احمد فلیح فیاض علی الهیبي: حوض دوكان في المنطقة الجبلية من شمال العراق (دراسة جيومورفولوجية تطبيقية)، کە تێزێکی دکتۆرایە هەرچەندە ئەم توێژینەوە تازەیە، بەڵام لـە ڕووی بنـەما سروشـتیەکانی ڕانیـەوە زانیـاری باشـی تێدایـە، لـە ڕووی مێژووییشـەوە دەتوانرێت سـوودی لێوەربگیرێـت، هـەروەها کتێبـی جوگرافیـای هـەرێمی کوردسـتان لـە نووسـینی کۆمـەڵێک مامۆستای زانکۆ، کـە زانیاری باشـی تێدایـە لەسـەر ڕانیـە بەتایبـەت لـە ڕووی بنـەما سروشـتییەکانی ناوچەکە. لـە ڕووی ڕێگاوبانیشـەوە سودێکی زۆر لـە ماسـتەرنامەی شـاد حەمید محەمـەد، ڕێگاکـانی ئۆتۆمبیـل لـە پارێزگـای سـلێمانی، کـە لـەڕووی مێژوویـەوە بەشـێوەیـەکی بـاش بەشـێکی زۆری خزمـەتگوزاری ڕانیـەی تێـدا تۆمـارکراوە، هـەروەها بـەڕێوەبەرایيـەتی ڕێگاوبـانی ڕانیـە. لـە ڕووی کشتوکاڵیشەوە سودێکی زۆر لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە وەرگیراوە لە ڕووی داتا و مێژووی کەرتی کشتوکاڵی لەڕانیە، لەگەڵ کتێبەکەی بەختیار مستەفا محـەمـەد بابان بـەناوی (خاوەنداریـەتی و کێشـەکانی زەوی و زار لەهـەرێمی کوردسـتان و چۆنیـەتی چارەسـەرکردنی)، کـە یەکێکـە لـە کتێبـە زانستیە باشەکان، بەشێوەی قوناغی مێژوویی باسـی لـە کێشـەی زەوی و زاری باشـوری کوردسـتان عێراق کـردووە لـە ناویانـدا شـاروچکەی ڕانیـە، هـەروەها کتێبەکـەی د. سـەلاحـەدین حەفیـد: ئـابوری کوردسـتان، کـە کتێبێکـی ئـابوری گشـتیە زانیـاری زۆری تێدایـە لـە سـەر کشـتوکاڵی ڕانیـە لـە مـاوەی سـاڵانی حـەفتا و هەشـتاکاندا، هـەروەها سـود وەرگـرتن لـەو سـەرژمێریانەی کـە سـاڵانە لـە لایەن وەزارەتـی کشـتوکاڵی عێراقـەوە ئەنجامـدراوە، کـە تاڕادەیـەکی بـاش ڕێـژە و جـۆری بـەروبوومی کشتوکاڵی ڕانیەی تێدا تۆمارکراوە.

بەشێوەیەکی گشتی لەم توێژینـەوەدا، سوودێکی زۆر لـە چاوپێکـەوتن و بـەدواداچوونی مەیـدانی وەرگیراوە، ئەم چاوپێکەوتنانەش بەشێوەیەکی زانستی و لە کەسانی پسـپۆر بـە بوارەکـە و بەشـدار و بـــە ئاگـــا لـــەناو ڕووداو و کاروچالاکییـــەکان تۆمـــارکراوە، بـــۆ تۆمـــارکردنی هـــەر ڕووداو و کاروچالاکییـەکیش وەک پشتراسـتکردنەوە و دڵنیـابوون، سـوود لـە چەنـدین کەسـایەتی و بیـروڕای جیاواز وەرگیراوە، جگە لە بەراورد کردن و بەستنەوەی ئەم چاوپێکەوتنانە بـە سـەرچاوەی نووسـراو و کتێبەکان.

## دەروازە:

## سەرنجێکی گشتی لەبارەی ڕانیە تا کۆتایی هاتنی سەردەمی پاشایەتی لە عیراق

یەکەم: پوختەیەک لەبارەی لایەنی جوگرافی و ژیاری ڕانیە

دووەم: بارودۆخی سیاسی ڕانیە

## دەروازە:

## سەرنجێکی گشتی لەبارەی ڕانیە تا کۆتایی هاتنی سەردەمی پاشایەتی لە عیراق

### یەکەم: پوختەیەک لەبارەی لایەنی جوگرافی و ژیاری ڕانیە

ناوی ڕانیە و ناوچەی ڕانیە، لە زۆرێک سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەی پێکراوە، لە کتێبی(تاریخ دول الاکراد و الاتراک - تاریخ دولة، الاکراد – لمؤلف مجهول)، کە نووسەرەکەی لە دەوروبەری ساڵی (١٢٥٧)ز ژیاوە، نوسەر ئاماژە بەوە دەکات، کە لە سەردەمی ئەیوبییەکان، میر کوگبوری فەرمانڕەوای ئەربل(هەولێر)، داوای لە مەلیک المعظم عیسی کوری مەلیک عادل میری دیمەشق کردووە، کە کوڕەکەی ناصر داود بۆ ڕەوانەی هەولێر بکات بۆ ئەوەی پەروەردەی بکات و دوای خۆی بیکاتە حاکمی (الرانە)، ڕانیە و پشدەر، ناوی ڕانیەی بە(الرانە)، هێناوە.[1] کلۆدیۆس جەیمس ریچ، لە گەشتە بەناوبانگەکەی بۆ کوردستان لە سالی (١٨٢٠)، ناوی ناوچەکەی بە بیتوێن هێناوە و هیچ ئاماژەیەکی بەناوی ڕانیە نەکردووە.[2] بۆچوون و تێڕوانینی جیاواز هەیە لە سەر ناوی ڕانیە، محمود قادر فەرەج، شارەزا لە مێژووی ڕانیە، پێی وایە ناوی ڕانیە لە وشەی (ڕەنە)وە هاتووە، کە بە زەویەک دەوترێت بەردەلان و چەوڕێژ بێت، کە لەوەڕگاکانی بەکەلکی لەوەڕاندنی مەڕوماڵات نایەت.[3] لە دەستنوسی (مەلا رەوف سلیم حویزی) دا، کە بەزمانی کوردی نووسیویەتی دەڵێت: ڕانیە لە (روندیات) هاتووە، بۆچونێکی تریش هەیە پێی وایە ڕانیە، لە لێکدراوی هەردوو ووشەی (ڕا–ڕێگا)، (نیاه– نیگا) هاتووە، (شاکر فەتاح)یش پێی وایە ڕیشەی ناوی ڕانیە بۆ وشەی (ڕان)دەگەڕێتەوە، کە بە مانای لەوەڕگای مەڕ و شوێنی مەڕ دێت.[4] بۆچوونێکی تریش هەیە پێی وایە ناوی ڕانیە لە ناوی جلوبەرگی ڕانکوچۆخەوە هاتووە، گوایە کەسێک لە ئاوەکانی چیای قەندیل ڕانکەکەی لێکەوتوتە ناو ئاوەوە و لە قولەی ڕانیە ڕانکەکەی دۆزراوەتەوە.[5]

ڕانیە یەکێکە لە شارۆچکەکانی باشووری کوردستان، دەکەوێتە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی باشووری کوردستان و باکوری ڕۆژئاوای پارێزگای سلێمانی، لەڕووی کارگێڕییەوە سەر بە پارێزگای سلێمانییە، نزیکەی (١٤٦)کم لە شاری سلیمانییەوە دوورە[6]، لە ڕووی ئەسترۆنۆمیەوە

---

[1] مؤلف مجهول: تاريخ دولة الاكراد و الاتراك تاريخ دولة الاكراد، دراسة و تحقيق (د. موسى مصطفى الهسنياني)، من منشورات جامعة دهوک، ٢٠٠٩، ص٥٢٩؛ د. زرار سديق توفيق: کورد و کوردستان ڕۆژگاری خیلافەتی ئیسلامی، چ٢، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢، ل٣١٧.

[2] کلۆدیۆس جەیمس ریچ: گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان(١٩٢٠)، و: محەمەد حەمە باقی،چ٤، چاپخانەی خانی، دهۆک،٢٠١٢، ل٢٥٠.

[3] وەرگیراوە لە: دڵشاد ئەحمەد: ڕانیە خەمێک لە پێدەشتی بیتوێن دا، گۆڤاری خاک، ژمارە(٥٨)، نیسانی ٢٠٠٢، ل١٧.

[4] وەرگیراوە لە: جمال بابان: اصول اسماء المدن و المواقع العراقية، الجزء الاول، مطبعة الاجيال، بغداد،١٩٨٧، ص١٢٩–١٣٠.

[5] خالید قادر محمد: ڕانیە شاری دەروازەی ڕاپەڕین، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، بی ساڵی چاپ، ل١٩.

[6] بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١).

دەکەوێتە نێوان هێڵی یەکتربڕینی بازنەی پانی (٣٦،١٥) باکوور لەگەڵ هێڵی درێژی (٤٤،٥٣) ڕۆژهەڵات. ڕانیە دەکەوێتە باکوری دەشتی بیتوێن، لە باکوورییەوە زنجیرە چیای کێوەرەشە، لە ڕۆژهەڵاتەوە چیاکانی ئاسۆس و کۆلارەیە،[1] لە ڕۆژئاوایەوە زنجیرە چیاکانی ماکۆک و بەرزاییەکانی کۆڵێن[2]، چیای کێوەڕەش درێژکراوەی زنجیرە شاخی بوتین-کێوەڕەشە و بەرزییەکەی دەگاتە (٢٠٣٤)م لەئاستی ڕووی دەریاوە،[3] لە (١٠) چیا پێکهاتووە، لە ناوچەی شەمدینانەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە چیای کێوەڕەش، شاخی کاروخ، هەندرین، کێوەڕەش درێژکراوەی یەکترن لە ناوچەکە.[4] سنووری شارۆچکەی ڕانیە لەگەڵ چەند شارۆچکەیەک هاوبەشە، لە بەشی باکووری هاوسنوورە لەگەڵ هەریەک لە شارۆچکەکانی سۆران و شەقڵاوە، کە سەر بەپارێزگای هەولێرن، لە بەشی باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی هاوسنوورە لەگەڵ زێی بچووک و شارۆچکەی دوکان، لە بەشی ڕۆژهەڵاتیەوە هاوسنورە لەگەڵ شارۆچکەی قەڵادزێ و پشدەر، لە بەشی خۆرئاواو باشووری خۆرئاوای هاوبەشی هەیە لەگەڵ شارۆچکەی کۆیە، ڕووبەری شارۆچکەی ڕانیە بەپێی رووپێو و سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) گەیشتۆتە (٢٥٩٤)کم٢، ئەم ڕووبەرە بە پێی گۆڕانکارییە کارگێڕییەکان گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. لە ساڵی (١٩٧٧) بوەتە (١٥٢٨)کم٢.[5] دەشتی رانیە، دەوری زێی بچووکی داوە و بە فراوانترین دەشتی ناوچەی شاخاوی دەناسرێت، کە درێژیی ئەم دەشتە (٣٠)کم لە رۆژهەڵاتیەوە بۆ رۆژئاوا و پانییەکەشی (٢٠ -٣٠) کم و ڕووبەرەکەی نزیکەی (٨٠٠)کم٢،[6] ئەم دەشتە شێوەیەکی هێلکەیی هەیەو ڕووبەرەکەی (٣٢٠٠) دۆنمە، بەرزی لە نێوان (٤٨٠- ٦٠٠)م، ڕێڕەوی زێی بچووک بە دەربەندی رانیە تێپەڕ دەبێت،[7] ئەم دەربەندە پێشی دەوترێ دەربەندی ڕمکان،[8] چیای کێوەڕەش وەک شورایەک لێک دادەبڕێت، زێی بچووک بەشی ڕۆژهەڵاتی لە بەشی

---

[1] ئەم بەرزاییە لە دەقە بزمارییەکاندا بە کلارا هاتووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: طه باقر، فواد سفر: المرشد مواطن اثار والحضارة، اصدرته مديرية الفنون و الثقافة الشعبية وزارة الارشاد، بغداد، ١٩٦٢، ص٣٢.

[2] پێشڕەو سەمەد تۆفیق: شیکردنەوەی شوێنی دانیشتوانی شاری ڕانیە، نامەی ماستەر(بڵاونەکراوە)، کولێژی زانستە کۆمەڵایەتیەکان، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٩، ل٥.

[3] محمد علی قادر: نواندنی کارتۆگرافیی تایبەتمەندییە سروشتییەکانی قەزای ڕانیە بە بەکارهێنانی (RS) و (GIS)، نامەی ماستەر(بڵاونەکراوە)، کۆلێژی زانستەمرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی٢٠١٤، ل٥٤.

[4] ناهیدە جمال تاڵەبانی: کانیاوەکانی پاریزگای هەولێر، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق(دەستەی کورد)، بەرگی بیست و پێنج و بیست و شەش، بەغدا، ١٩٩٤، ل١٩٥.

[5] پشتیوان شفیق ئەحمەد: شیکردنەوەی جوگرافیایی بۆ دابەشبوونی دانیشتوان لە شارۆچکەی ڕانیە (١٩٥٧-٢٠٠٦)، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢، ل١٤.

[6] د. شاكر خصباك: العراق الشمالي (دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية)، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٣، ص٣١-٣٢.

[7] سناء عبد الباقي بكر: مصادر الثروة الطبيعية في حوض دوكان وسبل صيانتها، رسالة ماجستير(غير منشورة)، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٣، ص٢٠.

[8] دبلیۆ ئارهەی: دووساڵ لە کوردستان، و: لوقمان باپیر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٣٧.

ڕۆژئاوای جیادەکاتەوە، کە بەشی ڕۆژهەڵاتی بە دەشتی پشدەر ناو دەبرێت و بەشی ڕۆژئاواشی بە دەشتی بیتوێن.[١]

دەشتی ڕانیە چەندین تایبەتمەندیی گرنگی هەبووە، زۆربەی مەرجەکانی بوون بە مەڵبەندیکی شارستانی تێدا هەڵکەوتووە، زەویەکەی زۆر بە پیت بووە و ڕووباری بەناودا تێپەڕبووە بە چیا دەورەدراوە، ئەمەش وایکردووە لەسەردەمانی کۆندا بەڕووی پەلامارە دەرەکییەکان بەهێزبێت، ببێتە شوێنی کۆبونەوەو نیشتەجێ بوونی مرۆڤ لە ناوچەکەدا، لەگەڵ دروست کردنی بەنداوی دووکان لە ساڵی (١٩٥٦-١٩٥٨)، زۆرێک لە دەشتی ڕانیە ژێرئاوکەوتووە، بەشێکی زۆری ناوچە شوێنەوارییەکان کەوتنە ژێر ئاوەوە، کە ژمارەیان (٤٠) گرد بووە.[٢] لە ساڵی (١٩٥٦) بەر لە دروستکردنی بەنداوی دوکان، بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عێراق بڕیاری داوە، لیژنەیەک پێکبهێنرێت بۆ پشکنینی ئەم ناوچەیە، لیژنەکە لە ئەنجامی کنەو پشکنیندا چەند گردێکی شوێنەواریی تومارکردوە، کە مێژووی هەندێکیان بۆ هەزارەی شەشەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، گردەکانی وەک (گرد بۆر، مەلا عمر، کفریان، بواتان، گلە، کاوی، قەرە قاج، مەلا شەل، باب و کوڕ، سەخمە، کاکە مەم و کمریان، ...هتد)، ئەم گردانە لەڕووی مێژووی سیاسییەوە بۆ سەردەمانی سۆمەری، ئەکەدی و ئاشووری وخوری و میدی وساسانی دەگەڕێنەوە. گردە دێم، کە لەساڵی (١٩٥٦)، پشکنینی بۆکراوە، چەندین پاشماوەی شوێنەواری لێ دۆزراوەتەوە، کە مێژووەکەیان بۆ سەردەمەکانی سۆمەری و ئەکەدی و ئاشوری و خوری و میدیەکان دەگەڕێتەوە، گردی بۆسکێن، کە گردێکی گەورەو فراوانە، مێژووەکەی بۆ سەردەمی ئاشوری و میدییەکان دەگەڕێتەوە، هەروەها گردی باسموسیان یان بازنوسیان، کە گەورەترین گردی ناوچەی بیتوێنە، لەساڵی (١٩٥٦)، لەلایەن لیژنەیەک بە سەرپەرشتی شوێنەوارناسی بەناوبانگ (د.بهنام ابو الصوف) پشکنینی بۆ کراوە، مێژووەکەی بۆ پێش مێژوو (بەر لە پەیدابونی نووسین) دەگەڕێتەوە و شوێنەواری دەسەڵاتەکانی ئاشووری و خوری میدی و ساسانی و ئیسلامی پێوەدیارە.[٣]

لە ساڵی (١٩٥٧) دا نێردەیەکی دانیمارکی بەسەرپەرشتی دەزگای هاوبەشی کارلسبێرگی دانیمارکی پشکنینی بو گردی شمشارە کردوە، کە (٨)کم لە ڕانیەوە دوورە، لە ئەنجامی گەڕان و پشکنیندا، کۆمەلێک خشتیان بەزمانی بزماری دۆزیەوەتەوە، کە بەڵگەی گرنگی نوێیە بۆ پەیوەندیی نێوان قۆناغەکانی چەرمۆ و حەسۆنە،[٤] بە پێی هەندێک لەوخشتانە کە مێژووەکەیان بۆ سەردەمی

---

[١] هاوڕێ یاسین حمد ئەمین: لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای هەریمی کوردستان، چاپخانەی ڕەنج، سلیمانی، ٢٠١١، ل٦٥.

[٢] فاضل قەرەداغی: چیرۆکی شمشارە، ، بێ ناوی چاپ، بێ شوینی چاپ، ١٩٩٦، ل١٤.

[٣] وەرگیراوە لە: قحطان رشيد صالح: الكشاف الاثري في العراق، مديرية الكتب للطباعة و النشر جامعة الموصل، بغداد، ١٩٨٧، ص٧٦-٧٨.

[٤] یۆرگین لیسۆ: خشتەکانی شمشارە، و: عەزیز گەردی، وەزارەتی ڕوشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل٣٢.

خورییەکان دەگەڕێتەوە، ناوی شمشارەی کۆن بە (سوشرا) هاتووە، کە لە ناوی شمشارەوە نزیکە.[١] عەبدولرەقیب یوسف، شارەزای بواری شوێنەوار دەربارەی شوێنەوارەکانی ڕانیە دەڵێت: "لە گوندی هەنجیرەو تیتۆکەی ئیستاوە تا دەگاتە دەربەندی ڕانیە بە درێژایی بناری چیای کێوەرەش هەمووی ناوچەی شوێنەواریی کۆنە، سەیداوا، کە گەڕەکێکە لە ڕانیە ئێستا پێی دەوترێ ڕزگاری، لە کۆندا شارێکی گەورە بووە، مێژووەکەی بۆ هەزارەی چوارەمی پێش زاین دەگەڕێتەوە، قەڵاتی ڕانیە کە ئێستا کەوتۆتە تەنیشت مزگەوتی گەورەی ڕانیە مێژووەکەی بۆ شەش هەزار ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە".[٢] لە دەربەندی ڕانیە (ڕمکان) لە دووری (٦) میل لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری ڕانیە، پەیکەرێک هەیە، لە لاکێشەیەک یەک مەتر بەرز و (٦٠) سم پانە، نمونەیەکی تری کێلی سەرکەوتنی نەرام سینی پاشای ئەکەدیە، هاوشێوەی نەخشەی دەربەندی گاور.[٣] لە شارەدێی بێتواتە، کە دەکەوێتە ڕۆئاوای شارۆچکەی ڕانیە،[٤] کۆمەڵێک شوێنەوار دۆزراوەتەوە ئاماژەیە بۆئەوەی، کە پێغەمبەر ئیبراهیم (د.خ) لە ناوچەی بیتوێن و بێتواتە ژیاوەو دۆڵی ناران، ئەو جێگەیە بووە کە پاشا نەمروود ئاگرەکەی کردۆتەوە بۆ سزادانی ئیبراهیم خلیل. لە نێوان گوندی دواوە و بێتواتە گۆڕستانیک هەیە بەناوی گۆڕستانی خەلیل، لە گوندی سەروچاوە گۆمێک هەیە بەناوی گومی (سول)، گوایە ئاماژەیە بۆ پێڵاوی ئیبراهیم، لە دۆڵی بێتریە لە پشتی بێتواتە ئەشکەوتێک هەیە بەناوی مزگەوتی مام برایم، لە ناو بێتواتەش قەلای باخەڵان هەیە کە ناوە ڕەسەنەکەی قەڵاتی بابی خەلیلە، بە هەندیک بەڵگە و گێڕانەوەی دەماو دەم ئاماژە بەوە دەکەن گوایە ئیبراهیم لە ناوچەی بیتوێن لە دایک بووە.[٥] هەر لە ناوچەی بێتواتە بەردێکی شێوە تەختی داتاشراوی گەورە هەیە کە دانیشتوانەکەی پێی دەڵێن: (تەختی خورشیدی خاوەر)، کە نووسینەکانی لە نزیک دامێنی گردێکی گەورە دۆزراوەتەوە، کە پێی دەڵێن قەلای بێتواتە، نووسینەکانی لێک نزیکییان هەیە، لەگەڵ نووسینەکانی مۆزەخانەی ئورشەلیم[٦]، جگە لەبوونی نەخشەی پاشایەک کە نزیکی لەگەڵ نەخشەی پیاوی سەرکەوتووی

---

[١] طە باقر، فؤاد سفر: المصدر السابق، ص٣٥؛ کمال نوری معروف: تیشکێک بۆ سەر نەخشە هەڵکەندراوەکەی دەربەندی گاور، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە(٤)، حوزەیرانی ١٩٩٨، ل٧.

[٢] مێژوونووسی گەورەی کورد هەگبەی زانیاریەکانی لە بارەی ڕانیەوە دەکاتەوە: گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(٢١)، هاوینی ٢٠٠٧، ل٤-٥.

[٣] یۆرگن لیسۆ: سەرچاوەی پیشوو، ل١٩-٢٠.

[٤] د.عبدلله غفور: فەرهەنگی جوگرافیایی کوردستان، چ٣، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٨، ل٥٩.

[٥] عبدولسەلام محەمەد حەیدەری: عەبدولا وەسمان ئادەم، چەمکێک لە مێژووی ئیبراهیم خەلیل(د.خ)، گۆڤاری پەیامی زانایان، ژمارە(١)، ٢٠٠٠، ل ١٤٥-١٤٧.

[٦] کۆزاد محەمەد ئەحمەد: کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ. ز دا، چ. شڤان، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٢١٤-٢١٥.

دەربەندی گاوری ناوچەی قەرەداغ هەیە.[1] زۆری لە بوونی ئەم ناوچە شوینەواریانە گەواهیدەرن بۆ دەوڵەمەندی و پڕبایەخی ئەم ناوچەیە لە ڕووی ژیاری و شارستانی و کۆبونەوە و نیشتەجێ بوونی مرۆڤ لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا.

**دووەم: بارودۆخی سیاسی ڕانیە**

لەگەڵ دروستبوونی دەسەڵاتی هەردوو ئیمپراتوریەتی عوسمانی (١٢٨٨-١٩٢٤)،[2] و سەفەوی (١٥٠١-١٧٣٦)، [3] بە تایبەت دوای ساڵی (١٥١٤)ز، زۆرێک لە ناوچە کوردنشینەکان، بەسەر ئەم دوو دەسەڵاتەدا دابەشبوون.[4] لەسەدەی شانزەهەمدا ناوچەکانی ئەمرۆ، کە پێی دەڵێن عێراق لە ژێر دەستی عوسمانیەکاندا بووە، بەردەوام ئەم ناوچەیە جێگەی ململانێی نێوان میر و فەرمانڕەواکان بووە، عوسمانیەکانیش ڕۆڵی هاندانی خراپیان گێڕاوە لەم ئاژاوەی، کە هەبووە ناوچەی ڕانیەش کەوتۆتە ناو ئەم ململانێ سیاسیەوە.[5] لە سەردەمی میرنشینی بابان، فەقێ ئەحمەدی میری بابان ناوچەی بیتوێن تا دەوروبەری کۆیەی خستۆتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە،[6] بۆیە ناوچەی ڕانیە لەسەردەمی میرنشینەکانی بابان و سۆران، بۆتە شوێنی ململانێیان،[7] لە سەردەمی حوکمداریی میر محەمەدی سۆران (١٨١٣-١٨٣٦)، دەسەڵاتی میرنشینی سۆران گەیشتۆتە ڕانیە و ناوچەکە بۆتە بەشێک لە فەرمانڕەوای ئەو میرنشینە،[8] دواتریش لەگەڵ چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەندیی عوسمانی، بەتایبەت دوای ساڵی (١٨٥١)ز لە ناوچە کوردستانیەکان کۆتایی بە سیستەمی میرنشینی هاتوو ڕاستەوخۆ خرانە ژێر دەسەڵاتی ناوەندیی عوسمانییەکانەوە.[9]

---

[1] کمال نوری معروف: تیشکێک بۆ سەر نەخشەی هەڵکەندراوەکەی دەربەندی گاور، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە(٤)، ١٩٩٨، ل ٧.

[2] د. محمەد سوهەیل تەقوش: پوختەی مێژووی ئیسلامی، و: نیهاد جەلال حبیب الله، دار الفکر، لبنان، بیروت،٢٠٠٩، ل ٤٧٤.

[3] د. محمەد سوهەیل تەقوش: مێژووی دەوڵەتی سەفەوی، و: شاخەوان محەمەد، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٠، ٢٠١٠، ل٦٣،٣٢٣.

[4] د. عەبدولا عەلیاوەیی: کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی، چ٢، چاپ و بلاوکراوەی ئاوێر، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٠، ٣١.

[5] ستیڤن هیمسلی لونگریک: اربعة قرون في تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط٦، مطبعة بلا، بغداد، ١٩٨٥، ص٦٠-٦١.

[6] حسێن نازم بەگ: مێژوی میرایەتی بابان، و: حسێن حەسەن کریم، سدیق ساڵح،چاپخانەی شڤان، سلێمانی٢٠١٢، ل٢٦.

[7] حسێن حوزنی موکریانی: مێژووی میرانی سۆران، چ٢، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ل٦٢.

[8] د کاوس قەفتان: چەند لێکۆڵینەوەیەک لە میرنشینی بابان، سوران، بۆتان، چاپخانەی ئۆفسێتی ڕاز، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٥٨، ٦٧.

[9] د. عەبدولا عەلیاوەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

لــەکاتی جــەنگی یەکــەمی جیهانیــدا (١٩١٤-١٩١٨)، دەوڵــەتی عوســمانی بەســەرکردایەتی ئیتحادییەکان، لەپاڵ بەرەی ئەڵمانیا دژی هاوپەیمانان بەشداری جەنگی کرد، لەئەنجامدا بەشێکی زوری ناوچەکانیان لە دەستدا. لە ساڵی (١٩١٧) بەریتانیەکان بەغدایان داگیرکرد،[1] ڕوسەکانیش بەیارمەتی چەکدارە ئەرمەنییەکان توانیان ناوچەکانی ڕەواندز و دەوروبەری داگیربکەن، بەڵام هەر زوو توشی ڕوبەڕووی بەرهەڵستکاریی خێڵەکانی ناوچەی کۆیە و هەولێر بوونەوە،[2] هاوکات هۆزەکانی دەڤەری بیتوێن و خۆشناوەتی و ناودەشت، لە شوێنی ئیستای ڕێگەی هاملتۆن شانبەشانی هۆزەکانی باڵەکایەتی ڕووبەڕویان بوونەوەو ناچار بە پاشەکشەیان کردوون لە ناوچەکە، بەڵام دواتر لە ئەنجامی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری (١٩١٧)، ڕووسەکان بەتەواوی ناوچەکەیان چۆڵکرد، ئەم شەڕەی کورد و ڕووس لەم دەڤەرە بە شەڕی عەروسان (حرووس) بەناوبانگە.[3] هەر لە ئەنجامی هێرشی ڕوسەکان بۆ سەر ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەشێک لە هۆزەکانی شکاک و مامەش و بلباس، ناوچەکانیان جێدەهێڵن و ڕوودەکەنە ناوچەی ڕانیە. لە ساڵی (١٩١٧)، جێنشینی ڕانیە، سەر بە ئیدارەی عوسمانی لە ئەنجامی دروستبوونی کێشەی ڕێگریی کردن لە کاروانی بازرگانی، خۆی و دوانزە لە پاسەوانەکانی لە بەستێک لە نێوان ڕانیەو سەرکەپکان و چوارقورنە لە لایەن مامەندی عەبدولائاغای بلباسەوە دەکوژرێن، کە ئیستا ئەو شوێنە بە بەستی قایمقام بە ناوبانگە دواتر بە هەڵاتنی مامەند ئاغا بەرەو ئێران کێشەکە کۆتایی دێت.[4]

ئاگربەستی مۆدرۆس لە ساڵی (١٩١٨) کۆتایی بە جەنگی یەکەمی جیهانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی هێنا، بەشێک لە ناوچەکانی عێراق کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز، پاش داگیرکردنی شاری سلێمانی لە لایەن ئینگلیزەوە شێخ مەحمود وەک حوکمدار دیاریدەکرێت و مێجەر نوئێلیش وەک حاکمی سیاسیی ئینگلیز لە کوردستان، ڕانیەش دەبێتە بەشێک لە قەڵەمڕەوی حوکمداری شێخ لە ساڵی (١٩١٨) دا.[5] دواتر لە (١٩١٨/١١/١٨) مێجەر نوئێل دەگاتە سلێمانی و لەبەردەرکی سەرا، بەناوی حکومەتی بەریتانی قسە لەگەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەی سلێمانی دەکات، عەشیرەتەکانی وەک (پشدەر، مەنگور، بلباس، ئاکۆ)، ئامادەی کۆبونەوەکە دەبن و لەم کۆبونەوەیەدا، شێخ مەحمود بە حوکمداری کوردستان دەناسرێت،[6] دواتر مێجەر نوئێل بەمەبەستی ڕێکخستنی کاروباری کارگێڕی

---

[1] د. سامان حوسێن ئەحمەد، د. بەختیار سەعید مەحمود: مێژووی هاوچەرخی تورکیا، چاپ و پەخشی نارین، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٢٤-٢٨.

[2] د کەمال مەزهەر ئەحمەد: کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی دا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٦٣.

[3] کامەران بابان زادە: شەڕی عەروسان، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (١٨)، کانونی یەکەمی ٢٠٠٦، ل ٢١.

[4] دەشنێ بابان: ناوی بەستی قائم قام لە چیەوە هاتووە، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(١٣)، ئەیلولی ٢٠٠٥، ل ٤٦.

[5] ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر: ڕەواندز لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی- سیاسیە (١٩١٨-١٩٣٩)، نامەی ماستەر (بڵاونەکراوە)، کۆلیژی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٥، ل ١٦.

[6] احمد خواجە: چیم دی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شفیق، بغداد، ١٩٦٨، ل ٢٠-٢١.

ناوچەکان، سەردانی ڕانیە دەکات،[1] لەسەردەمی حوکمداری یەکەمی شێخ مەحمود، شێخ یەکێک لە خزمەکانی بەناوی شێخ ئەمین دەکات بە قایمقامی ڕانیە.[2]

لە مایسی (١٩١٩) مێجەر سۆن لە شوێنی مێجەر نوئێل دەبێت بە حاکمی ناوچەی سلێمانی، بەهۆی ئەوەی سیاسەتی کارکردنی تەواو جیاواز بووە لە مێجەر نوئێل، پەیوەندیی نێوان شێخ مەحمود و ئینگلیزەکان ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو خراپ و ناکۆکی چووە، شێخ مەحمودیش لای خۆیەوە دەستی بە کۆمەڵێک ئامادەسازی کردووە، دژ بەو سیاسەتەی ئینگلیز بەرامبەری گرتبوویەبەر.[3] یەکەم کاری ئینگلیزەکانیش، بۆشکاندنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود لە ڕانیەوە دەستی پێکردووە، ڕەفیق حلمی ئاماژە بەوە دەکات لە سەردانێکدا لەگەڵ (بیل) کە نوێنەری مێجەر سۆن بووە بۆ لێکۆڵینەوە ڕۆیشتوون بۆ ڕانیە، پێش ئەوەی ئەوان بگەن بە ڕانیە، جێنشینی ڕانیە شێخ ئەمینی سندۆڵان ڕانیەی جێهێشتووە و ڕۆیشتۆتەوە بۆ سندۆڵان، بەهۆی ئەم هۆکارەوە ئینگلیزەکان لە ڕانیە کۆبوونەوەیەک بە عەشیرەتەکانی بلباس و مەنگوڕ و مامەش و ئاکۆیان کردووە لە ماڵی فەتاح بەگ، بیل و بارکر ویستویانە شێخ ئەمین لابدەن و خەلکەکە ڕازی بکەن و مەزبەتەیان داوە بە هۆزەکان، بەڵام غفور خانی ناودەشت بەزمانیکی زۆر ڕەق وەڵامی ئینگلیزەکانی داوەتەوەو پێی ڕاگەیاندون شێخ ئەمین نوێنەری شێخ محمودەو ئێمە ناتوانین بڕیاری لابردنی بدەین، بەڵام دواتر لە ڕێگەی حاکمی سیاسی ئینگلیز لە سلێمانی، شێخ مەحمود ناچارکراوە بڕیاری لەسەر کارلابردنی شێخ ئەمین بدات، بۆ جێگە گرتنەوەشی لەلایەن بیلەوە داوا لە ڕەفیق حلمی دەکرێت کە ببێتە جێنشینی ڕانیە، بەڵام قبوڵی نەکردووە و ڕەتی کردۆتەوە.[4] دواتر کاپتن بارکەر لە شوێنی شیخ ئەمین کراوە بە حاکمی سیاسی ناوچەکە، ڕەوشەکە بەیەکجاری تێکچووە و سەرانی ناوچەی پشدەرو ڕانیە، غەفورئاغای سەرۆکی ئاکۆ و سواراغای سەرۆکی هۆزی پیران[5] و عەباسی مەحمود ئاغای سەرۆکی پشدەر، کاپتن بارکەریان ناچارکردووە کە ڕانیە جێبهێڵێت و بەرەو کۆیە. لە حوزەیرانی (١٩١٩) دوای دەرکردنی ئینگلیز لە سلێمانی شەڕی دەربەندی بازیان ڕوودەدات، لە ئەنجامی ئەم شەڕە، شێخ مەحمود بەدیل دەگیرێت و وەک سزایەک بە دەستبەسەری ڕەوانەی هیندستان دەکرێ، توفیق وەهبی وەک یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لە شوێنی بارکەر دەبێت بە جێبەجێکاری ئینگلیز لە ناوچەکە.[6] لە نێوان ساڵانی (١٩١٩-١٩٢٠) ئینگلیزەکان هەوڵیانداوە دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ لە باشوری کوردستان

---

[1] محمد رسول هاوار: شیخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خواروی کوردستان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی بلاک روز، لەندەن، ١٩٩٠، ل٤٠٣.

[2] دبلیۆ ئارهەی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٦.

[3] حسێن مەدەنی: کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەک، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولیر، ٢٠٠٩، ل٣٢٨.

[4] یاداشت (کوردستانی عێراق و شورشەکانی شێخ مەحمود)، ب١، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٦، ل٩٥-١٠٥.

[5] سوارائاغا سەرخمە: سەرۆک عەشیرەتەی پیرانی ناوچەی ڕانیە بووە، یەکیک بوو لەوانەی بەشداری شەڕی دەربەندی بازیانی کردووە، دواتر بەدیل گیراوە و ڕەوانەی بەغدا کراوە. احمد خواجە: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩.

[6] سدیق ساڵح: حکومەتی کوردستان، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٤٢، ٤٩ ،٥٠، ٥١، ٥٦، ٦١.

بچەسپێنن، ئەم کارەش دژایەتییەکی زۆری کوردەکانی لێکەوتوتەوە،[1] ئاگری ڕاپەڕین زۆرێک لە ناوچەکانی باشوری کوردستان گرتوتەوە، لە بادینان و گەرمیان و هەولێر و ڕەواندز یاخی بوونی چەکداری دژ بە ئینگلیز دروست بووە.[2]

لە ساڵی (١٩٢٠) دوای چەسپاندنی ئینتیداب لە لایەن ئینگلیزەوە بەسەر عێراقدا،[3] و بەستنی کۆنگرەی قاهیرەی (١٩٢١) پەیکەری تازەی دەوڵەتی عێراقی دێتەکایەوە، فەیسەڵ وەک یەکەم پاشای عێراق دیاری دەکرێت.[4] ئەم کارەش دەبێتە هۆی توڕەبوونی تورکەکان و دەستکردن بەچالاکی چەکداری لە ناوچەکانی کوردستان و سەیرکردنی مەلیک فەیسەڵ وەک تاوانبار، بۆیە فەیسەل ناچار بووە دژیان بوەستێتەوە، ئینگلیزەکانیش ڕێگەیان بە گفتوگۆی نێوان تورک و شا فەیسەڵی یەکەم نەداوە، لە ساڵی (١٩٢١) تورکەکان لە درێژەی چالاکییەکانیان ئەفسەرێک بەناوی فازل ئەفەندی دەنێرن بۆ ڕەواندز، بەم کارە ئینگلیزەکان دەستدەکەن بە بۆردومانی ناوچەی ڕەواندز، چونکە ئەم ئاژاوەی ناوچەی ڕەواندز بە دەستی فەڕەنسا و تورک دەزانن.[5] لە (١٩٢١/٨/٢٣) کۆمەڵێک عەشایری ڕەواندز پێکهاتوو لە سوار و پیادە بە جل و بەرگی ڕەسمی تورکی ڕوودەکەنە ناوچەی ڕانیە و لایەنگرانی ئینگلیز، کە پێکهاتوون لە عەشایەری پشدەر بە هاوکاری هێزی سوارەی سلێمانی ڕێگریان لێدەکەن و لەناوچەکە دوریان دەخەنەوە.[6]

لە (١٩٢٢/٦/٢٣) ئەفسەرێکی تری تورک بەناوی عەلی شەفیق، کە بە ئۆزدەمیر ناسراوە بەخۆی و چەند سەربازیکی تورکەوە دەچێتە ڕەواندز و لەوێ نیشتەجێدەبێ، دەستدەکات بەکاری ڕێکخستن دژی ئینگلیزەکان و کۆکردنەوەی نەیارەکانی ئینگلیز لەناوچەکە، ئۆزدەمیر عەشیرەت و هۆزەکانی ناوچەکە دژی ئینگلیزەکان هاندەدا،[7] ڕانیەش دەکەوێتە ناو ئەم جموجۆڵە سیاسیەی کە تورک و لایەنگرانی شێخ محمود دژی ئینگلیزەکان دروستیان کردووە. ئەحمەد تەقی، کە نەیاری ئینگلیزەکان بووە، هاتوتە ناوچەی ڕانیەو سەردانی ناوچەی شاوری کردووە و چاوی بە حاجی

---

[1] د عوسمان عەلی: چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، و:کامەران بابان زادە، ب٢، چ. دیلان، ٢٠٠٦، ل٣٤.

[2] د سەعدی عوسمان: بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٩٠-٩٦.

[3] سێر ئارنۆلد ویڵسن: شۆڕشەکەی عێراق (لە ماوەی داگیرکاری بەریتانیا بۆ عێراق و کوردستان)، و: سەمەد ئەحمەد، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢، ل٥٥.

[4] فیبی مار: مێژووی نوێی عێراق، و: حەمە شریف حەمە غەریب، شێرکۆ ئەحمەد حەوێز، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١، ل٣٦، ٤١، ٤٣.

[5] کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدە و بیستدا، و:حەمە کریم عارف، چ٢، چاپخانەی شڤان، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٧٣.

[6] جەمال بابان، ئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی سێیەم، چ٢، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢، ل٣٧٦-٣٧٧.

[7] ئاکۆ عبدالکریم شوانی: شاری سلێمانی( ١٩١٨-١٩٣٢)، چاپخانەی زانست، سلێمانی،٢٠٠٢، ل١٤٦-١٤٧.

ڕەسوڵ ئاغای شاور[١]و زان ئاغا کەوتووە، کە لە حاڵەتی ئامادە باشیدابن دژ بە ئینگلیزەکان، حاجی ڕەسوڵیش زانیاریەکانی ئەوی بە فەتاح بەگی[٢] کەسایەتی دیاری ڕانیە گەیاندووە. دواترغەفورخانی ناودەشت هاتووە بۆ لای حاجی ڕەسوڵی شاور لە گولان، ئینگلیزەکان دوای هەستکردن بەم جموجۆڵە سیاسیەی، کە لە ناوچەکە هەیە، لە ڕێگەی کاپتن کوکی حاکمی ڕانیە، لە سەرای شارۆچکەی ڕانیە هەستاون بەکوشتنی فەتاح بەگ، ئەم کارەی ئینگلیز دۆخی ڕانیەی ئاڵۆزکردووە، نەیارانی ئینگلیزیش لە ناوچەکە لە تۆڵەی ئەم کارە لە قۆڵی شاور ئەحمەد ئەفەندی نێردەی ئینگلیز لە ناوچەکەیان بەدیل دەگرن و دەیکوژن، دواتریش خەڵکی ناوچەی شاور و عەشیرەتی ئاکۆ و خۆشناو بەهێزەوە دێن بەرەو سەرکەپکان و خۆیان ئامادەکردووە بۆ جەنگ لە دژی ئینگلیز، مامەند ئاغای سەرکەپکان کە کاتی خۆی لە ناوچەکە ڕایکردبوو ئەویش بە چەند سوارێکەوە هاتووە بۆ ناوچەکە.[٣] ئۆزدەمیری ئەفسەری تورک کە بە ڕەچەڵەک لە ڕەگەزی چەرکەسی میسری بووە، کەسێکی وریاو زیرەک بووەو شارەزای تەواوی داب و نەریت و کلتوری کوردەواری بووە، لەم ماوەیە توانیویەتی زۆربەی سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکە بەلای خۆیدا ڕابکێشێ و خەڵکێکی زۆر بکات بە نەیاری ئینگلیز لە ناوچەکە.[٤] دوای ئەوەی ئۆزدەمیر پاڵپشتی پشدەرییەکان بەدەستدەهێنێت، دەستدەگرێت بەسەر ناوچەی پشدەردا و دواتریش مەرگە دەکەوێتە دەست پشدەری و تورکخوازەکان، عەباسی مەحمود ئاغا و ئەحمەدی حەماغای پشدەری، کە دژی ئینگلیز بوون، بابەکراغای دۆستی ئینگلیز لە ناوچەی پشدەر ناچار بە ڕۆیشتن دەکەن، ناوچەکە بۆ ئەوان جێبهێڵن.[٥]

دوای ئەو ئاڵۆزی و پشێویەی ناوچەکە، ئینگلیزەکان بەردەوام بە فڕۆکە بۆردومانی ناوچە دەست بەسەرداگیراوەکان دەکەن، کە لەلایەن کوردە نەیارەکانی ئینگلیز و تورکخوازەکان دەستی بەسەر داگیرابوو، بەڵام ئەم بۆردومانانە سوودێکی ئەوتۆی نەبووە، ئیدمۆنس،[٦] کە جێگری کارگێڕی

---

[١] ڕەسوڵ ئاغای گولانیماڵی لە ناوچەی شاور بووە لە ئینگلیز قاچاخ بووە، خزم و کەسی زۆری لەگەڵدا بووە، دواتر لە لایەن ئینگلیزەکانەوە ناوچەی شاور بەفڕۆکە بومباران کراوە ناچار بووە ڕوو بکاتە ڕەواندز. بڕوانە: عبدالرقیب یوسف، سدیق سالح: بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، چاپخانەی ئازاد، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٩٦.

[٢] فەتاح بەگ لاویکی تازە پێگەیشتوو بو بە ڕەچەڵەک خەڵکی سلێمانی بووە، بە هۆی وریایی و چالاکیەکانیەوە ببوو بە کەسایەتێکی دیاری ناوچەکە، کێبرکێی ئاغاکانی پشدەری کردووە، بڕوانە: رفیق حلمی: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٦.

[٣] ئەحمەد تەقی: بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ محمود و سمکۆ، جەلال تەقی ئامادەی کردووەو پەراوێزی بۆ نووسیوە، چاپخانەی سلێمانی، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٢٢-٣٨، ٤٨.

[٤] ئەحمەد حمەد ئەمین هومەر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

[٥] دارا توفیق کاکەمین: ناوچەی پشدەر لە سەردەمی پاشایەتیدا(١٩٢١-١٩٥٨)، سلێمانی، ٢٠١١، ل١٢٤-١٢٥.

[٦] ئیدمونس لەساڵی ١٨٨٩ لەدایک بووە، لە زانکۆی کامبردج خویندنی تەواو کردووە، لەساڵی ١٩١٥ بۆیەکەم جار هاتوتە عێراق، چەندین پۆستی سیاسی و ئیداری لە عیراق و ئێران و باشوری کوردستان پێسپێردراوە، خاوەنی چەند پەرتوکێکە لەسەر کورد، لەساڵی ١٩٧٩ کۆچی دوای کردووە. بڕوانە: س.ج.ئێدمونز: کوردەکانی عێراق، و:سەلمان عەلی، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە(١١)، ئاداری ٢٠٠٠، ل١٥٤-١٥٥.

سیاسی ئینگلیزەکان بووە لە ناوچەی ڕانیە، چەند جارێک داوای هاوکاری لە کارگێڕی سیاسی ئینگلیز کردووە تا لە (١٩٢٢/٨/٢٧) کۆنۆنێل ئیچ فەرماندەی کاروانی ڕانیە (ڕانیکۆڵ)، بە فڕۆکە چۆتە لای ئیدمۆنس، لە (١٩٢٢/٨/٢٩) کۆمەڵێک چەک و سوارە و پیادە بە فەرماندەی (ئیچ.ئی.دی.ئۆرئونیک)، بۆبەرگریکردن لە ئینگلیز ناردووە بۆ ڕانیە،[١] بەڵام ئەم هێزەی کە هاتووە، هێزێکی زۆر لاواز بووە لە دەربەندی ڕانیە گیرساوەتەوە.[٢] نەیارەکانی ئینگلیزیش شەوێک پێش هێرشی دەربەند کۆبونەوەیەک لە گوندی کەستانەی پشدەر دەکەن، بەمەبەستی چۆنیەتی هێرشکردن بۆ سەر دەربەندی ڕانیە و دەستبەسەر داگرتنی ناوچەکە پلاندادەنێن، پلانەکەش بەو شێوە دەبێت، هێزی غەفورخان بۆ لە چیای کێوەڕەشەوە هێرش بکات، هێزی میراودەل لە ئاسۆس و دەربەندەوە، قۆڵی ڕانیەش لە لای سەرکەپکانەوە بەسەرپەرشتی شێخ کاکەمین و شێخ ئەحمەد بارزانی و فارس ئاغای زێباری، فەتاح بەگی هەمەوەند و سەید محمد جباری و سورچی و خوشناوەکان هێرش بکەنە سەر ئینگلیز لە دەریەند.[٣] دوای ئامادەسازییەکان بۆ شەڕ.[٤] لەبەرەبەیانی (١٩٢٢/٨/٣١) لەقۆڵی چیای ئاسوسەوە هێرش دەکرێتە سەر هێزەکانی ئینگلیز لە دەربەندی ڕانیە و[٥] دواتریش هێزی غەفورخان لە کێوەڕەشەوە، لە چوار قۆڵەوە پەلاماری ئینگلیز دەدات و بە ناچاری دەربەند بەئینگلیزەکان چۆڵدەکەن،[٦] دوای ئەم تیکشانە ئینگلیزەکان دەکشێنەوە بۆناو قەلای بۆسکین و لەوێ هێڵێکی بەرگری دروستدەکەن، بەڵام جارێکی تر لەوێش توشی تێشکاندن دەبن و بەناچاری پاشەکشە دەکەن بۆ گوندی سەرخمە.[٧] پاشان هێزی لیڤی سەر بە ئینگلیز و ئەو هێزەی کەماوەتەوە، لە ژێر چاودێری فڕۆکە ڕوودەکەنە شارۆچکەی کۆیە.[٨] هەرچەندە تێکشکانی ئینگلیز لە ڕانیە ڕوداوێکی بچووک بوو، بەڵام وەک بەسەرهاتێک لە ژیانی کارگێڕی سیاسی ئینگلیز لە ناوچەکەدا، ڕوداوێکی نائاسایی بووە.[٩] پاش تێکشکانی ئینگلیز لە شەڕی دەربەندی ڕانیە، تورکەکان ڕێکخستنی ئیداری ئەنجامدەدەن و دووبارە شێخ ئەمینی سندۆڵان دەکەنەوە بە جێنشینی ڕانیە.[١]

---

[١] سیسیل جۆن ئیدمۆنس: کورد، تورک، عەرەب، و: حامید گەوهەری، چ٣، چاپ و بلاوکراوەی ئاوێر، هەولێر،بێ مێژووی چاپکردن، ل٣١٠-٣١١.

[٢] جەرجیس فەتحولا: وریابونەوەی کورد، مێژووی سیاسی کورد(١٩٠٠-١٩٢٥)، و:حسن جاف، ب ١، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٩، ل٢٧٥.

[٣] ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەحمەدی حەماغا، لە کۆبونەوەی کەستانەو ئامادە سازی بۆ شەڕی دەربەند، ئاماژەی بە خەڵکی ناوچەی شاور و ئاکۆ و سەرکەپکان نەکردووە.

[٤] عبدالرقیب یوسف، سدیق سالح: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦-٦٧.

[٥] دارا توفیق کاکەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

[٦] عبدالرقیب یوسف، سدیق سالح: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٧،٦٨.

[٧] ئەحمەد تەقی: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.

[٨] بیرەوەریەکانی کاپتن لاین لەمەڕ ڕوداوەکانی باشوری کوردستان(١٩١٩-١٩٢٩): و: د.یاسین سەردەشتی، چ. سیما، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٠٧.

[٩] ئیدمۆنس: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٨.

له ئەنجامی ئەو گوشارەی خەڵکی کوردستان بە گشتی و خەڵکی سلێمانی بەتایبەت دروستیان کردبوو، لەگەڵ هەڕەشەی تورک لە ڕەواندز و کۆیە و ڕانیە و پشدەر، ئینگلیزەکان گەڕانەوەی شێخ مەحمود بە باشترین هەلبژاردە دەزانن، بۆیە شێخ مەحمود دەگەڕێننەوە بۆ باشوری کوردستان، لە (١٩٢٢/١٠/١٠) شێخ مەحمود بەبڕیارێکی حوکمداری کابینەی دووەمی حکومەتەکەی لە سلێمانی ڕادەگەیێنێ.[٢] دواتر بڕیاردەدرێ ناوچەی رانیە و پشدەر بخرێتەوە ژێر حوکمداریی شێخ مەحمود و لەدەست تورکەکان دەربهێنرێ، فەوزی بەگ نوێنەری تورک لە ڕانیە دوای گفتوگۆ لەگەڵ ئۆزدەمیر، بڕیاردەدات، کە لە ڕانیە بچێتە دەرەوە، لەسەر داواکاری ئەحمەد تەقی، کە کەسێکی نزیک بوو لە تورکەکان، تورکەکان ڕانیەیان جێهێشتووە بەرەو ناوچەی بێتواتە کشاونەتەوە.[٣] هەرچەندە ئینگلیزەکان ناڕازی بوون بەوەی ڕانیە بخرێتە ناو ئیدارەی شێخ مەحمودەوە، بەڵام هێزەکانی شێخ مەحمود بەفەرماندەیی ڕەشید سدقی غەفوری لە (١٩٢٣/١/١٤) چونەتە ناو ڕانیە و ئالای کوردستانیان تێدا هەڵکردووە، داوایان لە تورکەکان کردووە ناوچەی بیتواتە چۆڵبکەن و بەرەو شاری کۆیە بڕۆن.[٤]

هاتنی سمکۆی شکاک بۆ باشوری کوردستان، لە مێژووی جولانەوەی خەباتی کوردیدا بە ڕوداوێکی گرنگ دادەنرێت، سمکۆ لە (١٩٢٢/١٠/٤) گەیشتۆتە باشوری کوردستان، لە (١٩٢٣/١/٨) هاتۆتە سلێمانی و چاوی بە شێخ محمود کەوتووە،[٥] و سەردانی زۆرێک لە ناوچەکانی باشوری کوردستانی کردووە، لەسەردانێکدا هاتۆتە ناوچەی ڕانیەو لە بێتواتە لە ماڵی ڕەشید بەگ، چاوی بە ئۆزدەمیر کەوتووە، شێخ ئەمینی سندۆلان و هەباس ئاغا، ئەحمەدی حەمائاغای پشدەریش لە کۆبونەوەکە بەشدار بوون، ئۆزدەمیر دەستی سمکۆی ماچ کردووەو داوای هاوکاری لێکردووە، کە ببێتە لایەنگری تورکەکان و دژی ئینگلیزەکان بوەستێتەوە.[٦]

لە تەمموزی ساڵی (١٩٢٣) حکومەتی عێراق بە سەرپەرشتی مەلیک فەیسەڵ بڕیاریداوە هەڵبژاردن دووبارە بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن بکاتەوە، بە هۆی ئەوەی لە هەڵبژاردنی یەکەم کێشەی تێکەوتووە، لەم چوارچێوەدا وەزارەتی ناوخۆ برووسکەی بۆ سەرجەم موتەسەریفەکان ناردووە تاوەکو ڕێگە و شوێنی پێویست بگرنەبەر، ئەحمەد عوسمانی موتەسەریفی هەولێر لای خۆیەوە دەستی بە ڕێکخستنەکان کردووە، لە چوارچێوەی ڕێکخستنەکاندا، شارۆچکەی رانیە بەهۆی

---

[١] قادر ئەشکەنەیی، دارا خدر حسن: پشدەر لەماوەی سالانی(١٩١٤-١٩٣٨)، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٢٦)، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٣٨.

[٢] جەعفەر علی: ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی،چاپخانەی ڕەنج، سلیمانی، ٢٠٠٤، ل٢٠٤.

[٣] ڕەفیق حلمی: یاداشت (کوردستانی عێراق و شورشەکانی شێخ مەحمود)، ب ٢، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٦، ل٥٨٢.

[٤] سدیق سالح: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١.

[٥] محمد رسول هاوار: سمکۆ ئیسماعیل ئاغای شوکاک، چاپخانەی ئاپێک، سوید، ١٩٩٥، ل٥٧٣، ٥٨٤.

[٦] عبدالرقیب یوسف، سدیق سالح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧-٩٨.

باڵادەستی شێخ مەحمود لە ناوچەکە لکێنراوە بە لیوای هەولێرەوە، بەڵام پشکنەری کارگێڕیی ڕانیە گومانی خۆی بە وەزارەتی ناوخۆ ڕاگەیاندووە، کە ڕانیە ناوچەیەکی گونجاونیە بۆ ئەم هەڵبژاردنە، دواتر بە هۆی ئەم دۆخە نالەبارە ڕانیە بەبازنەی هەڵبژاردنی کۆیەوە بەستراوەتەوە.[١] دوای کۆتاهاتنی سێیەمین حوکمی ئیداری شێخ مەحمود، هێزەکانی ئینگلیز (١٩٢٤/٧/١٩)دەستیان بەسەر شاری سلێمانیدا گرتەوە و شێخ محمود سلێمانی جێهێشت و ڕوویکردە ناوچەی شارباژێڕ و لە گوندی سیتەک جێگیر بوو.[٢] کۆنگرەکانی سایکس پیکۆ (١٩١٦)، پاریس (١٩١٩)، قاهیرە (١٩٢١)، لۆزان (١٩٢٣)، هیچ خاڵێکی ئەوتۆی تێدا نەبووە لە بەرژوەندی گەلی کورد بێت،[٣] لە دوای کونگرەی لۆزانیشەوە تورکیا و ئینگلیز و عیراق هەنگاویاننەنا بەرەو پرسی چارەسەری کێشەی ویلایەتی موسڵ، کە زۆریک لە ناوچە کوردیەکانی باشوری کوردستانی دەگرتەوە.[٤] لە (١٩٢٥/٣/٢٠) دا شۆڕشگێڕانی کوردستان بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود، بەناوی خەڵکی خواروی کوردستان، بروسکەیەکیان ئاڕاستەی کۆمەڵەی گەلان و وڵاتەزلهیزەکان کردبوو، تێیدا نارەزاییان دژی سیاسەتی ئینگلیز دەربڕوە و داواکاری مافی نەتەوەی کوردیان لە باشوری کوردستان کردوە، لەم بروسکەو مەزبەتەیە جێنشینی ڕانیە، حاجی سەید حەسەن عەبدوڵڵا، یەکێک بووە لەو کەسانەی بەشداری ئەم مەزبەتە و برووسکەیەی کردوە.[٥] ئەمەش کاریگەری و قورسایی ڕانیە دەردەخات لە ڕووداوە سیاسیەکان، ئەو جولانەوە نەتەوەییە کە لەم ڕۆژگارەدا هەبووە.

دڵداری شاعیر(یونس رەئووف)، لە ساڵی (١٩٢٦)، کە باوکی وەک فەرمانبەر بە مودیری تەحریرات لە ڕانیە دامەزراوە، لە ساڵی (١٩٢٧) سەردانی ڕانیەی کردووە، ئاماژە بەوە دەکات کە ڕانیە بە هۆی شەڕی دەربەندەوە زۆربەی خانوەکانی تێکچووە و وێرانبووە وەک شارێکی چۆڵ هاتۆتە بەرچاو، خەڵکی رانیە تەنیا عیبارەت بووە لە پۆلیس و فەرمانبەری حکومەت، جەنگ وێرانی کردووە، لە هەموولایەکەوە کاری تێدا ئەکرا بۆ ئەوەی ئاوەدان بکرێتەوە.[٦] ڕانیە بە هۆی ئەوەی لەڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیەوە پێکهاتەیەکی خێڵەکی هەبووە، ئەم دیاردەیەش کاریگەری لەسەر دۆخی سیاسی هەبووە و بەردەوام ناوچەیەکی نا ئارام بووە، لە ساڵی (١٩٣٦-١٩٣٧) کاتێک جەلال سائیب قایمقامی ڕانیە دەبێت، ڕووبەڕووی هەوڵی تیرۆرکردن دەبێتەوە، لەم هەوڵەدا یەک لە کوڕەکانی گیان لەدەست دەدات، ئەم ڕووداوە کێشەیەکی زۆری لێدەکەویتەوە، سواراغای سەرۆک

---

[١] نەهرۆ محەمەد عبدولقادر: هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٦)، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٤٩- ١٥٢.

[٢] ئاکۆ عبدالکریم شوانی: شاری سلێمانی( ١٩١٨-١٩٣٢)، ل ١٧٧.

[٣] مەسعود عبدالخالق: ڕۆڵی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەتی کورد، چ٢، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢، ل٧٧.

[٤] فاضل حسین: کێشەی ویلایەتی مووسڵ، و: محەمەد شاکەلی، چاپخانەی خاک، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٥٦-٥٧.

[٥] شێخ لەتیفی حەفید: یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شوڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید، کمال نوری معروف ساغیکردۆتەوە، ناوەندی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی (پدک)، هەولێر، ١٩٩٥، ل١٣٧-١٣٨.

[٦] عبدالخالق علاء الدین: دڵدار (شاعیری شۆڕشگێڕی کورد)، دار افاق، بغداد،١٩٨٥، ل١٩-٢١.

هـۆزی بڵبـاس تیایـدا تۆمـەتبار دەکرێت و ڕووبـەڕووی دادگـا ئەکرێتـەوە، دواتـر بـەهۆی بیتـاوانیی سواراغا کێشەکە کۆتایی پێدێت.[1]

لـەماوەی سـاڵانی (١٩٢٥-١٩٤٠) باشـوری کوردسـتان کۆمـەڵێک ڕاپـەرین و خۆپیشـاندان بـە خۆیـەوە دەبینـێ، لەوانـە خۆپێشـاندانی (١٩٣٠) شـاری سـلێمانی و ڕاپـەرینی شـێخ ئەحمـەدی بـارزان (١٩٣١-١٩٣٢) تا جەنگی دووەمی جیهانی باشووری کوردستان ڕوداوێکی وەها گەورە بە خۆیەوە نـابینێ.[2] لـە (١٩٤١/٢/١) لـە سـەروبەندی جـەنگی دووەمـی جیهانیـدا، لایەنگرانـی ئـەڵمانیاو ئیتالیـاو هاوپـەیمانیی تـەوەر لـە عێراق، کودەتایەکیان ئەنجامداو حکومـەتێکیان بە سەرپەرشتی ڕەشید عالی گەیلانی دامەزراند، ئەم کودەتایە کاریگەری لەسـەر باشوری کوردستان هەبووە و تا ئەندازەیەکی باشیش خەڵک پشتیوانیان لێکردووە، بە تایبەت لە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکووک،[3] ئەم پشتیوانییە شـاری ڕانیەشـی گرتـەوە، جێنشـینی ڕانیـە ئیسـماعیل شـاوەیس، بـە نـاوی هـۆز و عەشـیرەتەکانەوە چەندین بروسکەی پاڵپشتی ئاراستەی (ڕەشید عالی گەیلانی) دەکات، کاتێکیش کودەتاکە سـەرکوتکراو حکومەتەکـەی گـەیلانی هەڵوەشـایەوە، ئاغـاو عەشـیرەتەکانی ناوچەکـە ئـەوەیان ڕەتکردەوە کـە ئـەوان واژۆو پاڵپشـتی حکومەتەکـەی گـەیلانیان کردبێ، دواتـر ئیسـماعیل شاوەیسـی جێنشـین وەک سـزایەک دەگوازرێتـەوە بـۆ مـەخموور، لـە سـاڵی (١٩٤٤)دا بیرۆکـەی لامەرکەزیـەتی کـورد لـە لایەن حکومـەتی عیراق دێتە ئاراوە، لە دوای هەڵوەشانەوەی حکومەتەکەی نوری سەعید لە ساڵی (١٩٤٤) کۆتـایی بـەم بابەتە دێت، بەڵام سەرۆک هۆزەکانی ناوچەی سلێمانی بەسەرکردایەتی حەمە ئاغـای ئاوڕەحمـان ئاغـا دەیانئەوێت پەرە بەم بابەتەبدەن و لـە بەرنامـەی کاریاندا بـوو کـە مەزبەتەیـەک بکـەن و بیگەیـەنن بـە کۆمەڵـەی گـەلان، لـەم ئاڕاسـتە سیاسـیەی کـە دروسـتببوو، سـەرۆک عەشـیرەتەکانی ڕانیـەش بەشـدار بوون، بەتایبەت سواراغای سـەرۆک عەشیرەتی پیران و عەباس ئاغای سەرۆک عەشـیرەتی ئاکۆ، ئـەم بیرۆکـە دوای هێنـان و بردنێکـی زۆر لـە نـاو نوێنـەرە کوردەکـانی پەرلـەمانی عیـراق بـە ئـاڵوگۆڕی موتەسـەریفی سلێمانی لە بەهادین نوریەوە کە پاڵپشتی بیرۆکەکەی دەکرد بۆ مەعروف چیاووک، ئـەم بیرۆکەیە بە کۆتا هاتوو شکستیخوارد.[4]

ڕانیە لە ماوەی (١٩٤٤-١٩٤٦) نزیکەی سەد ماڵێک بووە، لەڕووی سیاسییەوە ناوچەیـەکی زۆر نـا ئـارام بـووە، هـۆز و خێڵـەکان پابەنـد نـەبوون بـە یاسـاکانی دەوڵەتـەوە، دزی و کوشـتن و تـاڵان و پەلاماردان و چەوسانەوە لە ناویاندا باو بووە، سەرۆک هۆزو فەرمانبەرانی حکومی دەستیان لەگەڵ یەک تێکەڵکردووە، گەندەڵی و بەرتیلدان زۆر باو بووە، ئاغاکان بـە ئـارەزوی خۆیـان خـەڵکی هـەژار و

---

[1] مەسعود محەمەد: گەشتی ژیانم، سەنتەری لێکۆڵینەوەو پەخشی کۆیە، چ٣، کۆیە، ٢٠٠٩، ل١٧٣-١٧٤.

[2] د سەعدی عوسمان هەروتی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤-١٠٩.

[3] د.ئاکۆ عبدولکریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل١١٥-١١٦.

[4] میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: حەقایقی بەسەرهاتی شێخ محمود لە پەنای ئیستقلالی کوردیدا، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٦٢،٧٥-٧٨.

جوتیارانیان چەوساندۆتەوە و دەستیان بەسەر بژێویی ژیانی خەڵک و بازرگانی و هەموو کایەکانی ژیاندا گرتووە، شاکر فەتاح کە لەوماوەیەی جێنشینی ڕانیە بووە، بە هاوکاری موتەسەریفی هەولێر سەعید قەزاز، ڕووبەڕوویان دەبێتەوەو هەوڵی زور دەدات لە پێناو چەسپاندنی جێبەجێ کردنی یاساو دۆخەکە تارادەیەکی باش کۆنترۆڵ دەکات.[١]

لە (١٩٤٨/١/١٥)ساڵح جەبری سەرۆک وەزیرانی عێراق پەیمانێکی سیاسی لە بەندەری پۆرتسمۆسی بەریتانیا مۆرکرد، کە تەواوی خاڵەکانی پەیمانەکە لە بەرژەوەندی ئینگلیز بوو، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی مۆرکردنی ئەم پەیماننامەیە نارەزایی و خۆپیشاندان تەوای عیراقی گرتەوە، گەلی کوردیش هەر زوو تێکەڵ بە ڕاپەرینەکە بوو.[٢] لە شوباتی (١٩٤٨) شاندی شارو شارۆچکەکانی باشوری کوردستان وەک ڕێزێک بۆ قوربانیدانی ڕاپەڕینەکە سەردانی بەغدایان کرد، لە (١٩٤٨/٢/٢٦) نوێنەرانی سلێمانی و ڕانیەو زاخۆ گەیشتونەتە شاری بەغدا.[٣] لاوانی سلێمانی و ڕانیەو زاخۆ یەکیانگرتووە و ژمارەیان (٥٠٠) کەس بووە، لە گۆڕەپانی مەلیک فەیسەڵ بەرەو گۆڕستانی (باب المعظم) بەرێککەوتن و بە بەیداخی پۆستەری سلێمانی، ڕانیە، زاخۆ بەدوایەکدا، کچانی کورد بە چەپکە گوڵەوە، لاوانیش بە جل و بەرگی کوردییەوە، لە لایەن خەڵکی بەغدا پێشوازییەکی گەرمیان لێکراوە، لەلای چەپ و ڕاستی شەقامی ڕەشیدەوە وەستاوون تا چوونیان بۆ گورستان.[٤] لەو خۆپیشاندانەی شاری بەغدا، کۆمەڵێک کەسایەتی ڕانیە، وەک نوێنەری ناوچەکە بەشداریان تێداکرد، لەوانە: (کمال ڕەشید حەوێز، برایم ئاغای ڕانیە، شیخ حوسێنی بۆسکێن، سەید فەیزوڵا ڕەشید، ...هتد).[٥]

دوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی (١٩٤٦) دا، چالاکیی سیاسی لە باشوری کوردستان چۆتە قۆناغێکی ترەوە،[٦] لە ساڵی (١٩٥١) چالاکی ئەم حزبە گەیشتۆتە ڕانیە و سەنگەسەر و خەلەکان و سەرکەپکان، لە ساڵی (١٩٥٤) دا ژمارەی ئەندامەکانی لە ناوچەکە گەیشتۆتە

---

[١] یاداشتەکانی شاکر فەتاح: ئاوێنەی ژینم، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی، ئەحمەد سەید علی بەرزنجی، ب١، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٤٣٠- ٤٣٣.

[٢] د.کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الادیب البغدادیة، بەغدا، ١٩٨٥، ل٢٠٨.

[٣] مەهدی محەمەد قادر: پێشهاتە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق (١٩٤٥-١٩٥٨)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٧٩.

[٤] د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی عەبدوڵڵا زەنگەنە، بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل٣٩٣.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئیبراهیم سید فەیزوڵا ڕەشید: ڕانیە، ٢٠١٥/١٢/٩، ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٩ لە ڕانیە لە دایک بووە، پیشەی مامۆستایە، زانیاریەکانی لەرێگەی باوکیەوە پێگەیشتووە. بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٢) وێنەی فوتوگرافی وەفدی ڕانیە لە خۆپیشاندانەکەی ساڵی ١٩٤٨ شاری بەغدا.

[٦] مسعود عبدالخاق: مەوسوعە جودی بۆ چەمک و زاراوەکانی سەردەم، ب١، نوسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٥٩١.

(٤٥) ئەندام و (٩٠) پالێوراو و (١٢٠) لایەنگر، دواتر کارەکانی ئەم حزبە فراوان بووە، ناوچەی خوشناوەتی و مەرگەشی گرتۆتەوە، لە ڕێگەی توفیقی مەلا سدیق کە کادیری چالاک و متمانە پێکراوی پارتی بووە لە ڕانیە، پەیوەندی ئەم حزبەی لە ناوچەکە ڕێکخستووە، لەگەڵ ڕێکخستنەکانی بەغداد و کۆیەو کەرکوک پەیوەندیان هەبووە.[١]

لە ساڵی (١٩٥٤)، لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقدا،[٢] حکومەتەکەی نوری سەعید ویستویەتی جەمال عومەر نەزمی کە باوکی وەزیر بووە لە کابینەی حکومەتدا، لە سەر هەژماری ڕانیە کاندیدی پەرلەمان بکات، خەڵکی ڕانیەش لای خۆیانەوە علی بەگ قادر یان وەک نوێنەری خۆیان بۆ هەڵبژاردن کاندید کردووە، فەوزی جەمیل سائیب کە قایمقامی ڕانیە بووە داواکاری خەڵکی بە موتەسەریفی هەولێر گەیاندووە، بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبووە و حکومەت سوور بووە لەسەر کارەکەی، ئەم کارەش بۆتە هۆی خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەربڕینی خەڵک، کاتێک بە بۆنەی جەژنی قوربانەوە خەڵکێکی زۆری قەڵادزێ بۆ سەردان ڕوویان لە ڕانیە کردووە، بە ئۆتۆمبیل و پاس هاتوونەتە ناو بازاڕەوە، خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەستی پێکردووە، گرژی و ئاڵۆزی کەوتۆتە نێوان خەڵک و هێزەکانی پۆلیسەوە.[٣] میرزا ئەمین مەنگوڕیی شاعیر لە ڕێگەی خوێندنەوەی شیعرەکانیەوە هانی خەڵکی خۆپیشاندەرانی داوە، دواتر حکومەت بڵاوەی بە خۆپیشاندانەکە کردوەو چەند کەسێکی دەستگیرکردون، لەوانە (میرزا مەنگوڕی، محەمەدی وەستا قادر، بەهجەت قادر، شێخ حەمید، ڕەئوف لێفە، ڕەشید حەوێز)، میرزا مەنگوڕیش ڕەوانەی هەولێر دەکرێت و تا دوای هەڵبژاردن ناتوانێت بۆ ڕانیە بگەڕێتەوە.[٤] تا ساڵی (١٩٥٨) بارودۆخی سیاسی ڕانیە تا ڕادەیەک ئاسایی بووە، ڕووداویکی سیاسی گەورەی تێدا ڕوونەداوە. کە پێویست بکات ئاماژەی پێبکرێت.

---

[١] تۆفیقی مەلا سدیق: بیرەوەریەکانی ڕۆژانی حزبایەتی و پێشمەرگایەتی ودورخرانەوەم، چ٢، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٨.

[٢] سالار عبدالكريم فندي الدوسكي: دور نواب السليمانية (فی مجلس النيابي العراقي ١٩٤٥-١٩٥٨)، مطبعة خاني، دهوک، ٢٠٠٨، ص٥٧.

[٣] تۆفیقی مەلا سدیق: سەرچاوەی پێشوو، ل٩-١٠.

[٤] میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: بەسەرهاتی مەنگوڕی، چاپخانەی یاد، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١١١.

# بەشی یەکەم
# بارودۆخی کارگێڕی و سیاسیی رانیه
# (١٩٩١-١٩٥٨)

## باسی یەکەم: بارودۆخی کارگێڕی
## باسی دووەم: بارودۆخی سیاسی ڕانیه
## (١٩٧٤/٣/١١ – ١٩٥٨/٧/١٤)
## باسی سێیەم: بارودۆخی سیاسی ڕانیه
## (١٩٩١/٣/٥ – ١٩٧٤/٣/١١)

# بەشی یەکەم

# بارودۆخی کارگێڕی و سیاسیی رانیە (١٩٥٨-١٩٩١)

## باسی یەکەم: بارودۆخی کارگێڕی ڕانیە

### تەوەری یەکەم: ڕانیە لە چوارچێوەی ڕێکارە کارگێڕیەکاندا

ساڵی (١٨٦٤) دەوڵەتی عوسمانی لەسەر شێوەی یاسای فەڕەنسی- عوسمانی یاسای کارگێڕی ئایالیاتی تازەی دەرکرد، لسەر ئەوبنەمایە مەدحەت پاشا (١٨٦٩-١٨٧٢) والی بەغدا لە ساڵی(١٨٧٠) عیراقی دابەش کرد بەسەر دوو ئایالیات، بەغداوموسڵ، بەوپێیەش ئایالەتی شارەزوو وەک ئایالیەت بوونی نەماو لەگەڵ ئایالیەتی موسڵ تێکەڵ کراوە، سنجەقی شارەزووربش، کە کەرکوک مەڵبەندەکەی بوو خرایە سەر ئایالیاتی موسڵ، لەم گۆڕانکارییە کارگێڕییە نوێیەدا ڕانیەش وەک شارۆچکە ناوی هاتووە.[1] لەم چوارچێوەی سنجەقی شارەزوور (کەرکووک) کە، شارەدێی بێتواتەش[2] سەر بە شارۆچکەی ڕانیە بووە.[3] لە کاتێک ساڵی (١٨٧٩) ویلایەتی موسڵ بە شێوەیەکی ڕەسمی پێکهات و،[4] گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی عوسمانی بە تەواوی جێگیر بووە، ڕانیە وەک شارۆچکە خراوەتە سەر سنجەقی شارەزور (کەرکوک) مایەوە،[5] بەڵام بەپێی نوسراوە کارگێڕییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، ڕانیە هیچ شارەدێیەکی لەسەر نەماوە جگە لە (٤٥) گوند، کە سەر بە شارۆچکەکە بووە و ژمارەی دانیشتوانیشی (٥٠٠٠) کەس بووە.[6]

بەهەمان شێوە ساڵی (١٨٩٠) ز ڕانیە وەک شارۆچکە لە ساڵنامەی دەوڵەتی عوسمانی سەر بەویلایەتی موسڵ لە چوارچێوەی سنجەقی شارەزوور(کرکووک) ناوی هاتووە، (عبدالرحمن بەگ) جێنشینی رانیە بووە، ئەنجومەنی ئیدارەی تایبەت بە خۆی هەبووە و جێنشینی شارۆچکەکە سەرۆکی بووە، جێگر و موفتی، بەڕێوەبەری مالیە و نووسەری ئیداری هەبووە، هەر لەم پەیکەرە ئیداریە دادگای بەرایی و ئەمین خەزنەدار و فەرمانبەری باری شارستانی هەبووە،[7] بەڵام ساڵی (١٨٩٣)

---

[1] بەشێک لە نوسەران بە شارۆچکە بونی ڕانیە بۆ ساڵی ١٩١٣ دەگێڕنەوە، بڕوانە: جمال بابان و ئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٨.

[2] بێتواتە لەناوی گوندی بێتواتەوە هاتووە، دەکەوێتە خۆر ئاوای شاری ڕانیە. بڕوانە: د.عبدللە غفور: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

[3] د.کمال مظهر احمد: کرکوک و توابعها حکم التاریخ و الضمیر، ج١، مطبعة رینوین، بلا مکان و سنه الطبع، ص٣٩.

[4] د. نوری طالباني: منطقة كركوك و محاولات تغير واقعها القومي، المطبعة بلا، لندن، ١٩٩٥، ص٢١.

[5] د جبار قادر: قضایا کردیة معاصرة(کرکوک-الانفال-الکرد ترکیا)، دار ئاراس للطبع و النشر، اربیل، ٢٠٠٦، ص٣٧.

[6] گۆران ئیبراهیم سالح: کەرکوک لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا ، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٧٩؛ قامووسولئەعلامی شەمسەدین سامی: کوردو کوردستان لە یەکەم ئنسیکلۆپیدیای تورکی لە مێژوودا، و: ئەحمد تاقانە، چ٢، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٤٤.

[7] سالنامە ولایە الموصل: ١٣٠٨ هجری - ١٣٠٦رومی، ص١٣٣.

ڕانیە لە ڕوی ئیدارییەوە بچووک کراوەتەوە، لە شارۆچکەوە کراوە بە شارەدێ و خراوەتە سەر شارۆچکەی کۆیە.[1] تا ساڵی (١٨٩٤) ز ڕانیە جارێکی تر کراوەتەوە شارۆچکە، (محمد صەبری ئەفەندی) جێنشینی شارۆچکەکە بووە، لە ڕووی فەرمانگەو پەیکەری کارگێڕییەوە گۆڕانکارییەکی وای بەسەردا نە هاتووە، لەگەڵ پەیکەری کارگێڕی ساڵی (١٨٩٠) دا.[2]

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دۆخی کارگێڕی ڕانیە لە ڕووی ژمارەی فەرمانبەر و فەرمانگەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و وا دەردەکەوێت ئەم گۆڕانکاریانە بەهۆی زیادبونی ڕێژەی دانیشتوانەوە ڕوویدابێ، لە ساڵی (١٩١٢) ئیبراهیم ئەفەندی جێنشینی ڕانیە بووە، ئەنجومەنی ئیدارەی ڕانیە ژمارەیان (١١) کەس بووە، جگە لە دادگای سەرەتایی دادگای شەرعیش لە شارۆچکەکە دامەزراوە، فەرمانگەی مالیە و فەرمانگەی باری شارستانی و مودەریس و نوسەری تاپۆ لە شارۆچکەکە هەبووە.[3] لە ناو ناوچە کارگێڕیەکانی ویلایەتی مووسڵ، لە دوا ساڵانی دەسەڵاتی عوسمانی و بە تایبەت ساڵانی دەسەڵاتی ئیتحادو تەرەقیەکان، ڕانیە وەک یەکەیەکی ئیداری سەر بە لیوای کەرکوک بووە، هیچ شارەدێیەکیشی لەسەر نەبووە جگە لە کۆمەڵێک گوند کە ژمارەیان (٩٠) گوند بووە.[4] لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و هاتنی ئینگلیز بۆ ناوچە کوردییەکان، بە پێی ڕاپۆرتی کارگێڕی بەریتانیەکان لە شاری سلێمانی لە ساڵی (١٩١٩) دا ڕانیە وەک شارۆچکە ناوی هاتووە و هەردوو شارەدێی مەرگە،[5] و چناران[6] سەر بە ڕانیە بوون و لەسەر کەرتی کارگێڕی سلێمانی هەژمار کراون، هەروەها یەکێک بوون لەو پێنج ناوچە دابەشکراوەی کەرتی سلێمانی، کە لە لایەن ئەفسەری سیاسی ئینگلیز (A.P.O) سەرپەرشتیاری ناوچەی سلێمانی بەڕێوەبراوە.[7] ساڵی (١٩١٩) لە کاتی دامەزراندنی حوکمی ئیداری شێخ مەحمود لە سلێمانی، ڕانیە چۆتە ناو ئەو چوارچێوە ئیداریەی

---

[1] مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانية: ترجمة و تعليق: خليل علي مراد، مطبعة شڤان، سليمانية، ٢٠٠٥، ص٧٣.

[2] سالنامه ولاية الموصل: ١٣١٢هجری-١٣١٠ رومی، ص١٧٣-١٧٤.

[3] سالنامه ولاية الموصل: ١٣٣٠هجری- ١٣٢٨ رومی، ص٢٦٤-٢٦٥.

[4] سەربەست کەرکوکی(وەرگێڕان): ڕاپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکوک(ماوەی ١کانونی دووەم تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩)، ٢٠٠٦، ل٢٣.

[5] مەرگە: مەبەست لە شارەدێی بنگردە، دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی شارۆچکەی دوکان، ٣٥ کم لەو شارۆچکەوە دوورە. بڕوانە: ساڵنامەی سلێمانی ١٩٩٩: حکومەتی هەرێمی کوردستان، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، پاریزگای سلێمانی، ١٩٩٩، ل٧٩.

[6] چناران: دەکەویتە ڕۆژهەلاتی زێی بچووک، سەرەتا ناحیەکە لە خدران بووە، لە ساڵی ١٩٣٩ گوازراوەتەوە بۆ میرزا ڕۆستەم، دواتریش بەهۆی بەستی دوکانەوە میرزا ڕوستەم کەوتۆتە ژێر ئاوەوە. بڕوانە: محمد هادي الدفتر: عبدالله حسن، العراق الشمالي: ج١، مطبعة النهار، بغداد، ١٩٥٨، ص٤٣٢-٤٣٣.

[7] مامۆستا جەعفەر: شاری سلێمانی، ململانێی گروپە کۆمەلایەتییەکان ١٨٢٠-١٩٢٠، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٤، ل٤٤٧،٤٥٩،٤٦٠.

که شێخ مەحمود بە هاوکاری ئینگلیزەکان دایمەزراندووە.[1] لە ساڵی (١٩٢٢) گۆڕانکاری لە دۆخی کارگێڕی و ئیداری عیراقدا ڕوویداو وڵاتەکە دابەشی (١٤) لیوا کرا، رانیە خراوەتە سەر لیوای هەولێر، تا ساڵی (١٩٤٧) کارگێڕیی ڕانیە بریتی بووە لە ناوەند و شارەدێکانی ناودەشت[2]و چناران،[3] بە پێی تۆماری نفوسی حکومەتی عیراق ساڵی(١٩٤٧) ژمارەی دانیشتوانی ڕانیە بە سەنتەری شار و ناحیەکانیەوە گەیشتۆتە (٢٧١٥٢) کەس، ڕووبەری کارگێڕیی ڕانیە لەساڵی (١٩٤٨-١٩٥٥) دا (٢٣٠٠) مەتر چوارگۆشەبووە.[4] لە (١٩٥٦/٧/٢٢) بە پێی نوسراوی ژمارە(٦١٠) ئیدارەی پاشایەتی عیراق، ڕانیە لەگەڵ هەردوو شارەدێی چناران و ناودەشت لەسەر لیوای هەولێرەوە بەتەواوی سنوری ئیداریانەوە دەگوازرێنەوە بۆ سەر لیوای سلێمانی،[5] بە پێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)، لە ڕووی کارگێڕیەوە رانیە پێکهاتووە لە سەنتەر، چناران، ناودەشت، ژمارەی دانیشتوانی ڕانیە بە سەنتەرو ناحیەو گوندەکانیەوە (٣٦٠٩٧) کەس بووە، ڕووبەرەکەشی (٢٥٩٤)کم٢ بووە.[6] لە (١٩٥٧/٣/١) مەڵبەندی شارەدێی چناران لە گوندی میرزا ڕۆستەمەوە دەگوازرێتەوە بۆ گوندی دوکان لە چوار چێوەی شارۆچکەی ڕانیە و لیوای سلێمانی،[7] ئەم گۆڕانکاریە ئیدارییەش دەگەڕێتەوە بۆ دروستکردنی بەنداوی دووکان لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٩) کە بەهۆی ئەم پرۆژەوە (٢٥) گوندی سنووری ناوچەی ڕانیە ژێر ئاو کەوتون.[8]

کاتێک لە (١٩٥٨/٧/١٤) سیستەمی سیاسیی عێراق لە پاشایەتیەوە گۆڕا بو کۆماری و گۆڕانکاری زۆر لە سەرجەم بوارە جۆربەجۆرەکاندا ڕوویداو جارێکی تر پەیکەری کارگێڕی دەوڵەت داڕێژرایەوە، بە پێی ئەو دۆخە سیاسیە تازەی کە هاتبووە ئاراوە،[9] باشووری کوردستانیش وەک بەشێک لە عیراق کەوتبووە ناو ئەو گۆڕانکاریە نوێیانەی کە عیراقی گرتبۆوە، بە پێی مەرسومی کۆماری ژمارە (٦٥٨) لە (١٩٦٠/١٠/٣٠) چوارقوڕنە لە گوندەوە دەکرێت بە شارەدێ و دەخرێتە سەر

---

[1] دبلیۆ ئارهەی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٦.

[2] ناوەشت: ناوەندی گوندی سەنگەسەرە، ١٥کم لە ڕانیەوە دوورە. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني: العراق (قديماوحديثا)، ط٣، صيدا، ١٩٥٨، ص٢٤٤.

[3] د. خليل اسماعيل محمد: اربيل(دراسات ديموغرافية-اقتصادية)،وزراة الثقافة، المديرية العامة للثقافة و الفنون، اربيل، ٢٠٠٣، ص٣، ٥، ٧.

[4] سيد عبدالرزاق الحسنى: المصدر السابق، ص٩٤،٢٣٤.

[5] د عبدالله غفور: التشكيلات الادارية فى جنوب كردستان، ط٣، مطبعة حاجى هاشم، اربيل، ٢٠١٤، ص٣١.

[6] وزارة داخلية: مديريه النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل، لوائي كركوك و السليمانية، بغداد، ١٩٥٧، جدول رقم ٢، ٤،٢، ص٩،٢.

[7] د عبدالله غفور: المصدر السابق، ص١٤٦-١٤٧.

[8] فؤاد حمة خورشيد: قضاء بشدر (دراسه الجغرافية البشرية)، رسالة ماجستير،(غير منشورة)، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٧٣، ص ٢٤-٢٥.

[9] د ابراهيم خليل احمد، جعفر عباس حميدى: تاريخ العراق المعاصر، جامعه الموصل، كلية التربية، الموصل، ١٩٨٩، ص١٩٩-٢٠١.

شارۆچکەی ڕانیە، بەم هۆیەوە (٩٥) کەرت دەخرێتە چوارچێوەی شارەدێی چوار قورنە، بەمەش سنوری ڕانیە فراون بوونی زۆر بەخۆیەوە دەبینێ.[١] لە ڕووی کارگێڕیەوە پێش ساڵی (١٩٦٩)، عێراق کاری بە یاسای بەڕێوەبردنی لیواکان دەکرد، کە لە ساڵی (١٩٢٧) ئەم یاسایە دەرچوو بوو، کە تێیدا عێراق دابەشی چەند لیوایەک کرابوو، دواتر لە ساڵی (١٩٤٥)، ئەم یاسایە هەموارکرا و کۆمەڵێک گۆڕانکاری تیدا کرا،[٢] لە ساڵی (١٩٦٩) یاسای ژمارە(٥٩)ی ئەنجوومەنی پارێزگاکان دەرچوو، دواتر ئەم یاسایە بە یاسای ژمارە(٥٨) ساڵی (١٩٧٤) هەموارکرا، بەپێی ئەم یاسایە عیراق بەسەر چەند پارێزگایەک دابەش کرا، پارێزگاش بەسەر چەند شارۆچکەیەکدا و شارۆچکەش بەسەر چەند شارەدێیەکدا، لەگەڵ دروستکردنی ئەنجومەنی پارێزگا، ئەنجومەنی شارۆچکە و شارەدێ، بەپێی مادەی (٦،٥) دروستکردن و لادان و ناونان و ناوگۆڕینی شارۆچکە و شارەدێ، زیادکردنی سنوری کارگێڕی یەکە ئیداریەکان، دەبێت بە پێی مەرسومی کۆماری بێت و لەسەر پێشنیاری وەزیر و بڕیاری ئەنجومەنی پارێزگاو ڕەزامەندی ئەنجومەنی وەزیرانەوە بێت، بەپێی مادەی (٣٤) جێنشین گەورەترین فەرمانبەری جێبەجێکارە لە شارۆچکەکەدا و دەبێت هەموو ئەو یاسا و فرمانانە جێبەجێبکات، کە لە لایەن وەزیر و پارێزگارەوە دەردەچن، هەموو فەرمانگەکانی شارۆچکە دەبێت پابەندی بڕیارو ڕینماییەکانی جێنشینی شارۆچکەکەبن، بە پێی مادەی (٤٢،٤٤)، بەڕێوەبەری شارەدێ گەورەترین فەرمانبەری جێبەجێکار بوو لە شارەدێدا، لە ئیش و کارەکانیدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی، لەگەڵ جێنشیندا هەبووە، هەموو ئەو یاسا و ڕینماییانە جێبەجێ بکات، کە لە وەزیرو سەرۆکایەتیەوە بۆیان نێردراوە.[٣]

هەر لە چوارچێوەی گۆڕانکارییە کارگێڕییەکان لە ساڵی (١٩٧١) شارۆچکەی دوکان دروست دەکرێت و شارەدێی چناران لەسەر ڕانیەوە دەگوازرێتەوە بۆسەر ئەم شارۆچکەیە،[٤] دواتریش لە هەمان ساڵدا، شارەدێی ناودەشت بە تەواوی سنور و کەرتەکانیەوە لە سەر شارۆچکەی ڕانیە دەگوازرێتەوە بۆ سەر شارۆچکەی پشدەر.[٥] لە ساڵی (١٩٧٠) لە ئەنجامی ڕێککەوتنێک لە نێوان سەرکردایەتی کوردی و حکومەتی عیراق، بەیاننامەی یانزەی ئازار دەردەچێت، لە ڕێککەوتنەکەدا مافی ئۆتۆنۆمی بە ناوچە کوردیەکانی عیراق دەدرێت، دواتر لە ساڵی (١٩٧٤) ئەم ڕێککەوتنە کێشەی تێکەوت و حکومەتی عێراق یاسای ژمارە (٣٣)ی دەردەکات، کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە بڕگەکانی ڕێککەوتنی (١٩٧٠) دا دەکات، هەولێر دەبێتە ناوەندی ئیدارەی ئۆتۆنۆمی، بە پێی مادە (١٠)

---

[١] المرسوم الجمهوری الرقم:(٦٨٥) الوقائع العراقیة، العدد(٤٤٩)، فی ١٩٦٠/١١/٣٠، ص٧.

[٢] قانون ادارة الالویة رقم: (٥٨) الوقائع العراقیة، رقم :(٥٦٦)، ١٩٢٧/٧/٣١؛ قانون ادارة الالویة رقم: (١٦) الوقائع العراقیة، رقم العدد(٢٢٧٩)،١٩٤٥.

[٣] المرسوم الجمهوری الرقم: (١٥٩) الوقائع العراقیة، العدد(١٧٨٩)، فی ١٩٦٩/١٠/١٣؛ المرسوم الجمهوري الرقم:(٨٥) الوقائع العراقیة، العدد(٢٣٧٦)، فی ١٩٧٤/٧/١٦.

[٤] المرسوم الجمهوري الرقم: (٢٤٧) الوقائع العراقية، العدد(٢٠١٩)، في ١٩٧١/٧/٤، ص ٦.

[٥] المرسوم الجمهوري الرقم: (٤٦١) الوقائع العراقية، العدد(٢٠٦٦)، في ١٩٧١/١١/١٤، ص ٥.

ئەنجومــەنێکی یاســادانان دروســتدەکرێت لــە ناوچــەی ئۆتۆنــۆمی کوردســتان، کــە نوێنــەرانی ئــەم ئەنجومەنــە لــە ڕێگــەی هەڵبژاردنــەوە، دیاریــدەکرێن.[1] لەشــار و شارۆچکەکانیشــدا لــە ڕێگــەی هەڵبژاردنـەوە نوێنـەرانی خۆیـان بـۆ ئـەو ئەنجومەنـە دیاریدەکـەن، لـە مـاوەی سـاڵانی (١٩٧٥-١٩٩١) ئەوانـەی وەک نوێنـەری شـارۆچکەی ڕانیـە تیایـدا ئەنـدام بـوون، بریتیبـوون لـە:( هـەمزە ئیسـماعیل سوارائاغا، مەمەند عەباس مەمەند، حەمە عەتا حەسەن، مستەفا ڕەسول، هـەمزە عـەباس مەمەند)، لـە مـاوەی سـاڵی (١٩٨٤-١٩٨٨) هـەمزە عـەباس مەمەنـد و نـەوزاد ئـەنوەر ڕەشـید وەک نوێنـەری ڕانیـە بوون بە ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتیمانی عێراق.[2] گۆڕانکاری سـاڵانی حـەفتاکان بـەردەوامی دەبێت و لە ساڵی (١٩٧٦) شارەدێی بێتواتە دووبارە دروست دەکرێتەوەو دەخرێتە سەر شارۆچکەی ڕانیە، کە نزیکەی (١٨) کەرت لە خۆی دەگرێت و ناوەندەکەشی گوندی بێتواتـە دەبێت.[3] بـە پێی سـەرژمێری سـاڵانەی وەزارەتـی پلانـدانانی عێـراق لـە سـاڵی (١٩٧٦)، کـە بـۆ دابەشـکردنی یەکـە کـارگێڕی و ڕوبـەرەکانیان ئـەنجام دراوە ڕوبـەری شـارەدێکانی چوارقورنـە (٦١٧)کم٢، بنگرد (٥٩٣) کم٢، بێتواتـە (٣١٨)کم٢ بووە.[4] لە سەرژمێری سـاڵی (١٩٧٧) ڕانیـە لـە ڕووی پێکهاتـەی کارگێڕییـەوە بریتیبووە لـە سەنتەر، مەرگە، چوارقورنە، بێتواتە.[5] لە ساڵی (١٩٧٨) شـارەدێی مەرگـە(بنگرد)، لەسـەر شـارۆچکەی ڕانیە دەگوازرێتەوە بۆسەر شارۆچکەی دوکان لە سەر پارێزگای سلێمانی،[6] ئەم گۆڕانکارییە بـەهۆی گرفتی گواستنەوەو هاتووچۆوە بووە، لـە نێوان مەرگـەو ڕانیـە، کە زێی بچووک بەربەسـتێکی زۆری هاتوچۆی دروستکردووە لە ناوچەکە.

لـە سـەرژمێری سـاڵانەی عیـراق لـە سـاڵی (١٩٨٣) دا پێکهاتـەی کـارگێڕیی ڕانیـە بریتیبـووە لـە سەنتەری ڕانیەو شـارەدێی بێتواتـە، ئەمـەش ئاماژەیـەک بـووە، کـە لـەڕووی کارگێڕیـەوە ڕانیـە بـەرەو بچـووک بوونـەوە چـووە، قـەبارەی گشـتی ڕووبـەری کارگێڕیشـی دابـەزیوە بـۆ (٨٨٤)کم٢، ئـەم کـەم بونەوەی ڕوبەر و کارگێڕییە بۆ ئەو گۆڕانکارییە کارگێڕییانەی پێشوو تر دەگـەڕێتـەوە کـە ئاماژەمـان

[1] دیڤید مەکداوڵ: میـژووی هاوچـەرخی کـورد، و: ئـەبوبـەکر خۆشـناو، چ٢، هـەلێر، ل ٥٣٨، ٥٣٩، ٢٠٠٥؛ قـانون الحکم الذاتي لمنطقة کردستان رقم: (٣٣) الوقائع العراقية، رقم العدد(٢٣٢٧)، ١٩٧٤/٣/١١.

[2] چاوپێکەوتنی تـوێژەر لەگـەڵ هـەمزە عـەباس مەمەنـد: ٢٠١٥/١٢/٢٣، ڕانیـە، نـاوبراو لـە سـاڵی ١٩٥٣ لـە ڕانیـە لـە دایک بـووە، پیشـەی کـاری ئـازادە، لـە مـاوەی سـاڵانی ١٩٧٥-١٩٩١ ئەنـدامی ئەنجومـەنی نیشـتمانی عێـراق و یاسـادانای ئۆتۆنۆمی کوردستان بووە.

[3] المرسوم الجمهوري الرقم: (٢٨٧) الوقائع العراقية، العدد(٢٥٣٤)، في ١٩٧٦/٦/٢١، ص١٣.

[4] وزارة التخطـيط: الجهـاز المرکـزي للاحصــاء، المجموعـة الاحصـائية السـنوية لعـام ١٩٧٦، مطبعـة الجهـاز المرکـزي للاحصاء بغداد، ١٩٧٧، ص٣٥.

[5] وزارة التخطيط: الجهـاز المرکـزی للاحصـاء، نتـائج تـرقيم المبـاني و حضـر السـکان لسـنة ١٩٧٧، محافظـة السـليمانية، بغداد، ص٣٦.

[6] المرسوم الجمهوري الرقم: (٥٦) الوقائع العراقية، العدد(٢٦٣٧)، فی ١٩٧٨/٢/١٣.

پێیکرد.[١] بەڵام لە (١٩٨٦/٧/٧) شارەدێیەکی نوێ دروست دەکرێت بە ناوی (سەرکەپکان)[٢] و دەخرێتە سەر شارۆچکەی ڕانیە کە کۆمەڵێک گوند لە خۆدەگرێ،[٣] بەڵام لە دوای یەک ساڵ لە دروستکردنی ئەم شارەدێیە، دواتر هەڵدەوەشێنرێتەوە و سەرجەم کەرتەکانی دەخرێنەوە سەر یەکەی کارگێڕیی پێشوو تر، کە لێی وەرگیرابوون.[٤] تا سالی (١٩٩١) گۆڕانکاریەکان بەم شێوە دەمێنەوە.

**تەوەری دووەم: مێژووی فەرمانگەکانی ڕانیە**

**١- نەخوشخانەی گشتی ڕانیە:**

لە ساڵی (١٩٢٢) نەخوشخانەیەکی بچووک لە ڕانیە کراوەتەوە و یەکەم پزیشک، کە لە ڕانیە کاری کردووە جولەکەیەک بووە بە ناوی عەبدی، دوای ئەویش دکتۆرێکی تر هاتووە ناوی (چیشۆیزۆ) بووە و خەڵکی هەنگاریا بووە، لە ساڵی (١٩٤١-١٩٤٢) یەکەمین بنکەی تەندروستی لە ڕانیە کراوەتەوە، نزیک سەرچاوەی کوێرەکانی لە خانوێکی قوڕدا، سەرپەرشتیارەکەی کەسێک بووە بە ناوی (پترۆس) خەڵکی هەولێر بووە، لە ساڵی (١٩٥٢) دەست بە دروستکردنی نەخۆشخانەی ڕانیە لە نزیک سەرچاوەی ئاوی قولە کراوە، ساڵی (١٩٥٤) تەواوکراوە، کاری خزمەتگوزاری تەندروستی تیادا ئەنجامدراوە، چەند پزیشکێکیش کاریان تێدا کردووە، وەک (د.ئەربێل) کە جولەکە بووە، کەسێکی هونەر دۆست و میوزیک ژەن بووە، دوای ئەویش (د.ڤیکتۆر) و (د.قادر شاڵی) کاری پزیشکیان کردووە، لە ساڵی (١٩٥٦-١٩٥٧) دوو برینپێچ (سیستەر) بەناوەکانی (وارێنا) و (ماری) هاتوون بۆ ڕانیە خزمەتێکی زۆری ناوچەکەیان کردووە، لە پاشان ساڵی (١٩٧٥) نەخۆشخانەی سەربازی لە ڕانیە کراوەتەوە هەندێکجار چارەسەری هاوڵاتیانی مەدەنیشی تیاداکراوە، لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکانیش نەخۆشخانەیەک لە بەشی باکووری شارەکە کراوەتەوە، تا ساڵی (١٩٨٢) بینای نەخۆشخانەی گشتی ڕانیە تەواو بووە، کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ڕانیە وەک گەورەترین نەخۆشخانەی شارەکە.[٥]

---

[١] وزاره التخطيط: الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنويه لعام ١٩٨٣، دائرة النشر و العلاقات العامة، بغداد، ص٣٤.

[٢] ناحیەی سەرکەپکان: دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای شارۆچکەی ڕانیە، بروانە: خالید قادر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨.

[٣] المرسوم الجمهوری الرقم: (٥٣٠) الوقائع العراقية، العدد(٣١٠٥)، فی ١٩٨٦/٧/٧.

[٤] المرسوم الجمهوري الرقم: (٤٢٦) الوقائع العراقية، العدد(٣١٦٠)، فی ١٩٨٧/٧/٢٧، ص٤٥٢.

[٥] حکومەتی هەرێمی کوردستان : وەزارەتی تەندروستی، نەخوشخانەی گشتی ڕانیە، هۆبەی خۆیەتی، ٢٠١٥/١١/١٨.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ علی سابیر علی: ٢٠١٥/١٢/١٩، ڕانیە، ناوبراو ساڵی ١٩٣٤ لە کۆیە لە دایک بووە، پیشەی برین پێچ بووە، خولی برینپێچی لە ساڵی ١٩٥٤ تەواوکردووە و لە ڕانیە خزمەتی کردووە، ئێستا خانەنشینە؛ محمد ئەمین عارف: ڕانیە لە چاویلکەی مێژوودا، گوڤاری ڕانیە ژمارە(٤)، ٥/٢/، ٢٠٠٣ل ١٦.؛ خالید قادر: چاوپێکەوتن لەگەل رەشید حەوێز، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(٥)، ئابی ٢٠٠٣، ل٦.

**٢- فەرمانگەی باری شارستانی ڕانیە**

مێژووی دروستبوونی ئەم فەرمانگەیە بۆ ساڵی (١٩٣٧) دەگەڕێتەوە، یەکەم بەڕێوەبەریشی کەسیک بووە بەناوی (زەکەریا)، کارەکانی ئەم فەرمانگەیە خۆی لە تۆمارکردنی لەدایک بوون و مردن و هەندێک کات سەرژمێریکردن بینیوەتەوە، لەگەڵ کۆمەڵیک کاری تر، لەماوەی ساڵانی (١٩٦٧-١٩٩١) دا ئەم کەسایەتیەیانە: (مستەفا قەرەداغی، تحسین شێخ حمید، حمە عەتا حسن، علی خدر حمد)، وەک بەڕێوەبەر کاریان تێداکردووە و ڕۆڵیان لە پەرەپێدانی ئەم فەرمانگەیە بینیوە، لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) ئەم فەرمانگەیە سەربەبەڕێوەبەرایەتی باری شارستانی سلێمانی بووە.[١]

**٣- فەرمانگەی شارەوانی ڕانیە**

دامەزراندنی ئەم فەرمانگەیەش بۆ ساڵی (١٩٣٧) دەگەڕێتەوە، سەرەتا وەک بنکەیەکی خزمەتگوزاری پلەی سێ، دواتر گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، تا ساڵی (١٩٤٧) کراوەتە فەرمانگە. سەرەتا فەرمانگەی ئاو و کارەباش بەشێک بوون لەم فەرمانگەیەو دواتر لێی جیاکراونەتەوە، کاری ئەم فەرمانگەیە بریتی بووە لە ڕێکخستنی گەڕەک و شەقام و باخچەکانی، پاک و خاوێنی ناو شار، بۆ پاکردنەوەی ناوشار سەرەتا سوودیان لە ئاژەڵی گوێدرێژ وەرگرتووە. حەمەد گاوان یەکەم کەس بووە ئەم کارەی کردووە، جەمال سەعید مەرگەیی یەکەم سەرۆک شارەوانی بووە لە ڕانیە، ئەحمەد میرزا مەنگوڕی و مامەی حەمە حەسەن وەک فەرمانبەر و میرزا مەنگوڕی وەک خەزنەدار کاریان تێدا کردووە، لە ساڵی (١٩٤٨) باخی گشتی ڕانیە لە ناوەندی شار بەچەند ئاژەڵێک کێڵدراوە، کە دواتر لە ساڵی (١٩٥٧) بەهاوکاری ئیسماعیل سەرهەنگ داچێنراوە. ساڵی (١٩٧٧) نەخشەی ئۆردوگای زۆرەملێ لە ڕانیە لە ڕێگەی شارەوانیەوە کێشراوە، لە ساڵی (١٩٨٠) بە دواوە گەڕەکەکانی ڕانیە کەوتونەتە سەر ڕێکخستنی نەخشەی بنەڕەتی شارەوانی، لەماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) ئەم فەرمانگەیە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی سلێمانی بووە.[٢]

**٤- فەرمانگەی پۆستە و گەیاندن**

فەرمانگەی پۆستەو گەیاندن لە ساڵی (١٩٣٧) لە ڕانیە دەست بەکاربووە، تۆفیقی حاجی سدیق ناسراو بە تۆفیق چاوشین یەکەمین فەرمانبەری ئەم فەرمانگەیە بووە، کە بینای فەرمانگەکە لە گەڕەکی قەڵات بووە، (١٠) هێڵی پەیوەندی هەبووە، ئەم فەرمانگەیە توانای پەیوەندیکردنی هەبووە بە هێڵەکانی شار و قەزا وناحیە و هەندێک لە گوندەکان، وەک سلێمانی و قەڵادزێ و سەنگەسەر و کۆیە و قەسرۆک و پشتئاشان، ئەرکی ئەم فەرمانگەیە دابینکردنی هێڵی تەلەفۆن بووە بۆ فەرمانگە و

---

[١] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی ناوخۆ، فەرمانگەی باری شارستانی ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢١٥/١١/١٨.

[٢] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار، سەرۆکایەتی شارەوانی ڕانیە، هۆبەی ڕاگەیاندن، ٢١٥/١١/١٥؛ سەباح مەرگەیی: هەندێک زانیاری سەبارەت بە فەرمانگەی ئاوی ڕانیە، گۆڤاری شارەوانی ڕانیە، ژمارە (٣)، کانونی دووەمی ٢٠٠٣، ل٤٣؛ ئیبراهیم بالیسانی: مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (٤)، ٢٠٠٣/٥/٢، ل١١.

خانووەکانی ناو شار، هەروەها گەیاندنی پۆستی هاوڵاتیان بۆ ئەو شار و شوێنانەی کە مەبەستیان بووە، لە ساڵی (١٩٨١) دەست بەدروستکردنی بینای بەدالەی ئۆتۆماتیکی کراوە و ساڵی (١٩٨٤) تەواو بووە، کە دەکەوێتە سەنتەری شار و (١٠٠٠) هەزار هێڵی لەسەر بووە، ئامێرەکەی یابانی بووە و لەناو کابینەدابووە، ژمارەکانی بە (٣٢) دەستی پێکردووە، ژمارە یەکیش دراوە بە قائیمقائم، لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، ئەم کەسایەتییانە:(حەوێز ئیسماعیلی بەرید، جەمال هیرانی، عبدالرحمان محەمەد عبدالله، میرزا قادر سالح، بەکر عەبدول)وەک بەڕێوەبەر کاریان تیدا کردووە.[1]

**٥- فەرمانگەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە**

لە ساڵی (١٩٤٢) دا لیژنەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە هەبووە، بەڵام ساڵی (١٩٤٥) بەفەرمی فەرمانگەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە کراوەتەوە، بینای تایبەتی بۆ دروستکراوە و ئەحمەد خواجە سەرپەرشتی ئەم کارەی کردووە، یەکەم سەرۆکی لیژنەی پشکنین (کەریم ئەفەندی)ی خەڵکی کۆیە بووە، یەکەم کرێکاری دامەزراویش ناوی ڕەسوڵ خۆشناو بووە، لە ساڵی (١٩٦٣) ئەم فەرمانگەیە تووشی ڕوداووی سووتان بووە، لە ساڵی (١٩٧٠-١٩٧١) جارێکی تر لە ناو سەنتەری شار بینایەکی تازەی بۆ دروستکراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٨٦) فەرمانگەی پشکنینی قەڵادزێ بەهۆی نائارامی ناوچەکە و ڕاگواستنی قەزای پشدەر، تێکەڵ بە فەرمانگەی ڕانیە کراوە، لە ماوەی (١٩٥٨-١٩٩١) کۆمەڵێک کەس وەک بەڕێوەبەرو کرێکار خزمەتێکی زۆری ئەم فەرمانگەیان کردووە، لەوانە:(نوری میرزا غەفور، رەشید فەتاح (سلیمانی)، تەڵعەت ئەفەندی، ڕەئوف سور، وەحدەت ئەفەندی، عبدالخاق چەمچەماڵی، حاجی مەجید، محمد ئیساعیل ئاغا، غازی محمد وەستا محمد، فاروق چەمچەماڵی، سلێمان فەخری سامی).[2]

**٦- فەرمانگەی کشتوکاڵی ڕانیە**

لە ساڵی (١٩٥٦) ئەم فەرمانگەیە دامەزراوە و لەیەک بەش پێکهاتووە و یەک فەرمانبەری هەبووە بەناوی حەمید حەوێز، لە خانووی هاوڵاتییەک بەناوی باقی حەمە جەلال لە گەڕەکی قەڵات، دواتر گوازراوەتەوە بۆ بینای ئاودێری ڕانیە، دواتر چەند شوێنیکی تری کردووە، تا لە بینای هەرەوەزی جێگیر بووە، لە (١٩٧٥/٧/٢١) پڕۆژەی دارستانی کێوەڕەش، کە دەکەوێتەی رۆژهەڵاتی ڕانیە، کاری تێداکراوە، لەژێر سەرپەرشتی (حەمە حوسێن هەڵەبجەیی، کاکەمەم بۆتانی و فەرمانبەران مەولود سوفی بابەکر، ئەسوەد میرزا محەمەد) کە بە گرنگترین پڕۆژەی ژینگەیی دادەنرێت لە

[1] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن، فەرمانگەی پۆستەو گەیاندنی ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١١/١٨.؛ محمد ئەمین عارف: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.؛ هەڵوێست، کۆنترین فەرمانبەری پۆستەو گەیاندنی ڕانیە، گۆڤاری ڕانیە ژمارە (١٢)، حوزەیرانی ٢٠٠٥، ل٤٣.

[2] فەخریە ئیسماعیل: فەرمانگەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە، گۆڤاری رانیە، ژمارە(٧)، ئازاری ٢٠٠٤، ل٣٠-٣١.

ناوچەکە لە چوارچێوەی فەرمانگەی کشتوکاڵی ڕانیەدا،[1] لە ساڵی (١٩٨٢) ئەم فەرمانگەیە چۆتە ناو باڵەخانەی (دار العزاب) کە بۆ پەناهەندە میسرییەکان دروستکراوە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕانیە، هەر لە هەمان ساڵ ناوی فەرمانگەکە گۆڕاوە بۆ لقی کشتوکاڵی ڕانیە، لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) سەر بە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی سلێمانی بووە، کۆمەڵێک کەسایەتی وەک لێپرسراوی فەرمانگەکە ڕۆڵیان بینیوە لەبەرەو پێشبردنی، لەوانە:( جەلال عبدالله، ئەحمەد مەلا ئەبوبەکر، جمال حەسەن ئەحمەد، ئەحمەد مەحمود مستەفا، ناجی حەمە عەزیز، علی حەمە ئیبراهیم، عەباس سەلیم عەلی، کریم حەویز کەریم، قادر پیرۆت ئیبراهیم، ئیسماعیل ئەحمەد محەمەد).[2]

**٧- فەرمانگەی تۆماری خانووبەرە(تاپۆ)**

مێژووی دامەزراندنی فەرمانگەی تاپۆ لە ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٥٧) دەگەڕێتەوە، پێشتر کار بە تاپۆی ڕەشی سەردەمی عوسمانیەکان کراوە، ڕەئوف ناوێک، کە ڕوپێوبووە وەک تێبینەر و لێپرسراو دەستبەکار بووە، لە هەمان کات ڕۆژانە لە فەرمانگەکە کاری کارگوزاریشی کردووە. فەرمانگەکە لە سەرای شاردا بووە، دواتر لە ساڵی (١٩٦٥) گوازراوەتەوە بۆ ناو بینای دادگای ڕانیە، یەکەم کاری تاپۆ کە لە ڕانیە ئەنجامدرابێ خانووی هاوولاتی باقی حەمە جەلال بووە، ئەم فەرمانگەیە بەهۆی نەبونی فەرمانبەر، لە کۆیەوە فەرمانبەری بۆ هاتووە. لە ساڵی (١٩٧١) بە پێی یاسای عیراقی ناوی فەرمانگەی تاپۆ گۆڕاوە بۆ فەرمانگەی تۆماری خانوبەرە، لە ساڵی (١٩٧٤) فەرمانگەکە بەڵگەنامەکانی سوتاون و لە ناوچوون، کۆمەڵێک کەسایەتی وەک بەڕێوەبەر کاریان تێدا کردووە، وەک: (ئەحمەد - ناوی سیانی نەزانراوە، ئەحمەد مستەفا محەمەد، فایەق ڕەشید، بەشیر ڕەشید سالح).[3]

**٨- فەرمانگەی ڤێتەنەری ڕانیە:**

مێژووی دامەزراندنی ئەم فەرمانگەیە بۆ کۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، یەکەم دامەزرێنەرو بەڕێوبەری ئەم فەرمانگەیە ناوی (خورشیدە فەندی) بووە، سەرەتا بنکە بووە و دواتر کراوەتە فەرمانگە، بە هۆی سروشتی ناوچەکە کە خەڵکەکەی خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون، ئەم فەرمانگەیە هەرچەندە بچووکیش بووە بەڵام ڕوڵێکی چالاکی لە ناوچەکەدا بینیوە. لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) کۆمەڵێک کەسایەتی وەک بەڕێوەبەر کاریان تێدا کردووە، لەوانە: (توفیقی

---

[1] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە، بەشی پلاندانان، ٢٠١٥/١٢/١٥.؛ کاکە مەم بۆتانی: بەهارێزان بیرەوەری و بەسەرهاتی ساڵانی (١٩٧٥-١٩٩١)، بنکەی ئەدەبی و ڕوناکبیری گەلاوێژ، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٥.

[2] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە، بەشی پلاندانان، ٢٠١٥/١٢/١٥.

[3] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی داد، تۆماری خانوبەرەی ڕانیە، ٢٠١٥/١١/١٨.؛ جەمال حەسەن خدر: مێژوویەکی کورت لەسەر فەرمانگەی تاپۆی ڕانیە، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(٦)، کانونی یەکەمی ٢٠٠٣، ل١٥-١٦.

بەیتاڵ، د. لەتیف محمود ئەحمەد، د. عومەر مەحمود، د. دارا حەمەئەمین)، ئەم فەرمانگە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی سامان و دروستیی ئاژەڵی سلیمانی بووە.[1]

**٩- دادگای ڕانیە**

لە پێش ساڵی (١٩٥٨) لە ڕانیەدا دادگا نەبوو، موختار و ئاغاکان ڕۆڵی دادگاو دادوەریان لە ناوچەکە بینیوە، یان هەندیکجار لە قەڵادزێ وە دادوەر هاتووە، مێژووی دامەزراندنی دادگا لە ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٦٤) دەگەڕێتەوە، بیناکەشی لە سەنتەری شار لە خوار سەرا بووە. ئەم دادگایە سەرەتا سێ فەرمانبەری هەبووە، یەکەمین دادوەر مەجید بەهادین زاخۆیی بووە، محەمەد عەزیز ڕاوچی و عومەر عەبدولکەریم فەرمانبەربوون تیایدا، حەسەن ئیسماعیل ئاغا و حەسەن کانەبی وەک پارێزەر کاریان تێدا کردووە، دواتر لێکۆڵەری دادوەری و دادنوسی بۆ دامەزرێنراوە، لەماوەی ساڵانی (١٩٧٥-١٩٩١) ئەم کەسایەتیانە: (جەمال عبدللە غەفور، نەجمەدین فەریق نامیق، لەتیف سەعید مەعروف، ئەحمەد سالح قاسم، محەمەد سدیق مەحمود، عەونی عەبدولقادر سدیق، یوسف عزەدین حەسەن)، وەک دادوەر کاریان تیداکردووە.[2]

**١٠- بنکەی توێژینەوەی توتن**

دامەزراندنی ئەم ینکەیە بۆ ساڵی (١٩٧٠) دەگەڕێتەوە، سەرەتا بەناوی کێڵگەی تووتنی ڤێرجینی بووە، بەهۆی ئەوەی پێویستی بە ڕووبەرێکی زۆری زەوی هەبووە، لەگوندی گردجانی نزیک ڕانیە دامەزراوە، بە ڕووبەری (٢٠٠) دۆنم زەوی، گرنگترین ئەو شتڵە تووتنەی کە لەوێ داچێنراوە و دابەشکراوە. بریتیبووە لە تووتنی ڤێرجینی جۆری کوکەر (٢٥٤) و (٣٤٧)، دامەزراندنی ئەم بنکەیە دەگەڕێتەوە بۆ گرنگیدانی جوتیارانی ناوچەکە بەداچاندنی تووتن و ئامادەکاری شتڵ بۆ جوتیارن، یەکەم بەڕێوەبەری ئەم بنکەیە مەغدید عەبدوڵا ئەحمەد بووە، ئەم فەرمانگەیە تا ئێستا بەردەوامی هەیە بە ناوی وێستگەی توێژینەوەی کشتوکاڵی گردجان.[3]

**١١- فەرمانگەی ئاماری ڕانیە**

لە ساڵی (١٩٧٣) دامەزراوە، کاری کۆکردنەوەی ئامار و ڕووپێوی و سەرژمێری بووە، لە هەردوو دەڤەری ڕانیەو قەڵادزێ، یەکەم شوێنی کارکردنیشی لە سەرای سەنتەری شاردا بووە، لە ساڵی (١٩٧٤) بەهۆی دۆخی سیاسی کوردستان فەرمانگەکە داخراوە، لە ساڵی (١٩٧٥) دووبارە

---

[1] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوبەرایەتی ڤێتەنەری سلیمانی، بەشی ڤێتەرنەری ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١١/٣٠.

[2] حکومەتی هەرێمی کوردستان: ئەنجومەنی دادوەری، دادگای بەرایی ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١١/٢٩.؛ هەگبەی ڕازەکان (بەرنامە): کامەران عەبدە سالح (ئامادەکار و پێشکەشکار)، تەلەفزیونی گەلی کوردستان کەناڵی کۆیە، بەهاری٢٠٠٣، میوانی بەرنامە محەمەد عزیز ڕاوچی، فەرمانبەری خانەنشینی دادگای ڕانیە.؛ یاداشتەکانی شاکر فەتاح: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٠-٤٣١.

[3] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، وێستگەی توێژینەوەی کشتوکاڵی گردجان، ٢٠١٦/٧/٢٤.

کراوەتەوە، یەکەمین بەڕێوەبەری فەرمانگەکە ناوی (عبداللە حەمە شێخە) بووە. لە ساڵی (١٩٧٧) فەرمانگەی ئاماری ڕانیە بەهاوکاری مامۆستایانی قوتابخانەکان بەشداری سەرژمێری گشتی دانیشتوانی عیراقی کردووە، هەروەها لە ساڵی (١٩٨٠) دا بەشداریی لە ڕوپێوی داهاتی خێزانی و کشتوکاڵ و بێکاری لە عێراقدا کردووە. دواتر ئەم فەرمانگەیە بەهۆی چالاکیەکانیەوە گوازراوەتەوە بۆ خانویەک نزیک سەرچاوەی ئاوی قولە، حکومەت گرنگی زۆری بەم فەرمانگەیە داوەو لەکارەکانیدا زور پشتی پێبەستووە.[١]

**١٢- فەرمانگەی ڕێگاوبانی ڕانیە**

لەساڵی (١٩٧٥) کارگەی قیر لە ناحیەی چوارقوڕنە دامەزراوە، سەر بە یەکەی ڕێگاوبانی سلێمانی و کەرکوک بووە، ئیش و کارەکانی بریتی بووە لە قیرتاو کردنی ڕێگاوبانەکانی سنوری قەزای ڕانیە و پشدەر، زیاتر بۆ کاروباری سەربازی بووە و لە پاڵیدا بۆ کاری مەدەنی بەکار هاتووە، دواتر ئەم کارگەیە گوازراوەتەوە بۆ ناوچەی دیانا، لە ناوچەی چوارقوڕنە کارگەیەکی قیری تر دروستکراوە بەناوی کارگەی قیری ئەستریلان، هەر لە ساڵی (١٩٧٥) بەشی پرۆژەکان دروستکراو فەرمانگەیەک بەناوی (الاشغال و الاسکان) لە ڕانیە کراوەتەوە بۆ قیرتاوکردنی شارۆچکەی ڕانیە و پشدەر، دواتر لە ساڵی (١٩٨٠) ئەم فەرمانگەیە گوازراوەتەوە بۆ ناوچەی دۆڵە بەفرە لە ناوچەی قەڵادزێ، جارێکی تر لە ساڵی (١٩٩١) بەفەرمی فەرمانگەی ڕێگاو بانی ڕانیە کراوەتەوە.[٢]

**١٣- مەڵبەندی ڕۆشنبیری و لاوانی ڕانیە**

دروست بوونی ئەم مەڵبەندە بۆ ساڵی (١٩٧٥) دەگەڕێتەوە، سەرەتا ئەم مەڵبەندە لە خانوێکی بچووک دابووە لە گەڕەکی قولە، دواتر گوازراوەتەوە بۆ گەڕەکی سەرا، لە ساڵی (١٩٨٢) بینایەکی گەورەی تایبەت بە خۆی لە شەقامی گشتی (سەیداوا – ڕانیە) بۆ دروستکراوە، ئەم مەڵبەندە ڕاستەوخۆ سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری لاوانی هەولێر بووە. حکومەت گرنگیەکی زۆری پێداوە و چەند بەشێکی هەبووە، وەک: (وەرزش بەهەموو جۆرەکانیەوە، توپی پێ، باڵە، کونفۆ، لەشجوانی، تۆپی سەرمێز، هەروەها هونەر، مۆزیک، شانۆ، پەیکەرتاشی، وێنەکێشان، خۆشنوسی- ڕوشنبیری، کۆڕو سیمنار،چیرۆک، شیعر، پەخشان، بابەتی ڕووناکبیری- زانست و پیشەگەری، خولی ڕاهێنانی پیشەگەری بە هەموو جۆرەکانیەوە). ئەم مەڵبەندە تا ساڵی (١٩٩١) گەورەترین ناوەندی ڕۆشنبیری ناوچەکە بووە، کۆمەڵێک کەس وەک بەڕێوەبەر ڕۆڵیان هەبووە لە پێشخستنی ئەم

---

[١] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی پلاندانان، فەرمانگەی ئاماری ڕانیە، هۆبەی کارگێڕی، ٢٠١٥/١١/٢٤.

[٢] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن، بەڕێوەبەرایەتی ڕیگاوبانی ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١١/١٠.

مەڵبەندە، لەوانە: (محەمەد عەتا، ڕەفیق جەمال، جەلال حەمەد خدر، جەمال وەحید نەجم، کامەران ناوی سیانی نەزانراوە، فازل مەجید عوسمان).[١]

### ١٤- کتێبخانەی گشتی ڕانیە

له ساڵانی (١٩٧٥-١٩٧٧) بینای تایبەتی کتێبخانەی گشتی ڕانیە دروستکراوە، لە ساڵی (١٩٧٧) کتێبخانەی گشتی ڕانیە کراوەتەوە، (ئەحمەد محمد مەمەند) وەک یەکەم بەڕێوەبەر دەست بەکار بووە، کە سێ فەرمانبەری هەبووە (محمەد عەلی فەرمانبەر، کەمال سەعید فتح الله بەردەست، عەلی ئەحمەد محەمەد کارگوزار). لەو کاتەدا کتێبخانە سەر بەوەزارەتی ناوخۆی عیراق بووە، دواتر بەهۆی تێکچونی دۆخی سیاسی ناوچەکە لە ساڵانی (١٩٧٨-١٩٧٩)، کتێبخانەکە داخراوەو بیناکەش کراوە بە نەخۆشخانەی سەربازی، تا دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١/٣/٥) کتێبخانەکە نەکراوەتەوە.[٢]

### ١٥- فەرمانگەی کارەبای ڕانیە

هاتنی کارەبا بۆ قەزای ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٥٦) دەگەڕێتەوە، کاتێک دوو مۆلیدەی کارەبای ئینگلیزی لە جۆری بلاسکتۆن (k.v-٥٠) گەیشتۆتە ڕانیە، لەسەر سەرچاوەی ئاوی قولە بەکارخراون، لەهەمان ساڵدا (١٢٠-١٥٠) ستوونی کارەبا چەقێنراوە و کارەبا ڕاکێشراوە بۆ گەڕەگەکانی گڵێنجان، سەرا، قولە، قەڵات، بەشیکی ناوبازاڕ. کارەکانیش لە چوارچێوەی شارەوانی ڕانیە ئەنجامدراون، چونکە تا ئەم کاتە فەرمانگەی کارەبا نەبووە، عەزیز ئەفەندی ناسراو بە عەزیز شەبقە سەرۆکی ئەم بەشە بووە لە شارەوانی و (١٠) کرێکاریش کاریان تێدا کردووە. کارەبا ڕۆژانە لە کاتژمێر (٥)ی ئێوارەوە تا کاتژمێر (٥)ی بەیانی هەبووە، جگە لە ڕۆژانی هەینی کە (٤) کاتژمێر کارەبا هەبووە، لە ساڵی (١٩٦٠-١٩٧٠) ئەحمەد میرزا مەنگوڕی لێپرسراوی بەشەکە بووە، لە ساڵی (١٩٧٧) فەرمانگەی کارەبای ڕانیە بەفەرمی دەکرێتەوەو لە شارەوانی جیا دەبێتەوە، دەبێتە فەرمانگەیەکی سەربەخۆ، محەمەد ئەمین حەمەد وسو وەک یەکەم لێپرسراو دەستبەکار دەبێت، لەدوای ئەویش، فاروق فاتح حەمید، سادق سابیر و فاروق ئەحمەد عەلی، لێپرسراوی فەرمانگەکە بوون تا ساڵی (١٩٩١).[٣]

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەلال حەمەد خدر: ٢٠١٦/٣/١٠، ڕانیە، ناوبراو لەدایک بووی ١٩٥٥ ڕانیەیەو لە ساڵی ١٩٨٠بەڕێوبەری ئەم مەڵبەندە بووە، دەرچووی پەیمانگایەو ئێستا بەڕێوبەری بانک و خانووبەرەی ڕانیەیە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فازڵ مەجید عوسمان: ٢٠١٦/٣/١٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٥ کۆیەیە و خانەی مامۆستایانی تەواوکردووە، ماوەیەک بەڕێوبەری ئەم مەڵبەندە بووە، لە ئێستادا خانەنشینە.

[٢] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان، بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەی گشتی ڕانیە، بەشی کارگێڕی و خۆیەتی، ٢٠١٥/١١/٥.

[٣] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی کارەبا، بەڕێوەبەرایەتی دابەشکردنی کارەبای ڕانیە، وەرگیراو لە یەعقوب عەلی عەبدوڵڵا لیپرسراوی ڕاگەیاندنی بەڕێوەبەرایەتی، ٢٠١٥/١١/١٧.

### ١٦- وێستگەی سووتەمەنی ١٤ ی ڕەمەزان

لە ساڵی (١٩٧٦) لە دەروازەی شارۆچکەی ڕانیە دامەزراوە، سەر بەوەزارەتی نەوتی عێراق بووە، ئەم وێستگەیە (٥) تانکی پەنجا هەزار لیتری هەبووە، تانکیەک بەنزین و دوو تانکی گازوایل و دوو تانکی نەوت، کاری دابەشکردنی سووتەمەنی بووە بەسەر هاوڵاتیانی شارۆچکەی ڕانیە، ئەم وێستگەیە سەرەتا (١٦) کرێکاری هەبووە، جەلال حەمەد ئەمین یەکەمین ئەمین مستەودەعی وێستگەکە بووە، دواتر مۆفەق حەمە مەجید جێگەی گرتۆتەوە، لە ساڵی (١٩٨٩) ئەم وێستگەیە دراوە بە کەرتی تایبەت.[١]

### ١٧- فەرمانگەی بانکی ڕانیە

لە ساڵی (١٩٧٧) لە ڕانیە کراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٧٩) بیناکە تەواو بووە.، بیناکە کەوتۆتە نزیک سەرای شار، لە (١٩٧٩/١٠/١٣) یەکەم ڕۆژی دەوامکردن بووە تێیدا، بانکی ڕانیە بە ژمارە (١٦٩) لقێک بووە لە لقەکانی بانکی رافیدەین تاوەکو ساڵی (١٩٨٨)، لە ساڵی (١٩٨٩) بووە بە لقێک لە لقەکانی بانکی ڕەشید، عومەر عەلی وەک یەکەم لێپرسراوی بانک دەستبەکاربووە، لە دوای ئەویش لە ساڵی (١٩٨٥) سابیر موراد ڕەشید جێگەی گرتۆتەوە.[٢]

### ١٨- فەرمانگەی ئاوی ڕانیە

لە ساڵی (١٩٥٦)، دوو ماتۆری کارەبایی دیزڵ لە سەر سەرچاوەی ئاوی قولە دانراوە، یەکەم پرۆژەی دابەشکردنی ئاو لە سەرچاوەی قولەوە بووە بۆ ماڵەکانی گەڕەکی قەڵات بووە، دواتر خەزانێکی ئاو لەسەر قەڵاتی رانیە دروستکراوە بۆ دابەشکردنی ئاو بۆ گەڕەکەکانی ناو شار، پرۆژەی دابەشکردنی ئاو گەیەنراوە بۆ گەڕەکەکانی گڵینجان، ڕەشەمێرگ، قولە، ناوبازاڕ. ئەم کارانەش لە چوارچێوەی فەرمانگەی شارەوانی ئەنجامدراون، لە ساڵی (١٩٧٧) تانکی ئاوی سەرا لە سەنتەری شارۆچکەکە بۆ دابەشکردن و کۆکردنەوەی ئاو دروستکراوە، لە ساڵی (١٩٧٧) فەرمانگەی ئاوی ڕانیە لە شارەوانی جیاکراوەتەوەو بووە بە فەرمانگەیەکی سەربەخۆ، (مەحمود ئیبراهیم)، کە خەڵکی شارۆچکەی قەڵادزێ بووە، بۆتە لێپرسراوی فەرمانگەکە، دواتریش ئیبراهیم حاجی سورە جێگەی گرتەوە، لە ساڵی (١٩٨٠) پرۆژەی ڕاکێشانی ئاو گەیەنراوەتە گەڕەکەکانی ئازادی و شەهیدان، لە ساڵی (١٩٨٣) سەرچاوەی ئاوی قولە شورای کونکرێتی بۆ دروستکراوە، لە ساڵی (١٩٨٤) بۆیەکەم جار سەرچاوەی قولە بە ئامێری شوڤڵ پاککراوەتەوە، لە دوای ساڵی (١٩٨٤) ماتۆڕی ئاوی سەربەخۆ بۆ گوندەکانی( کونەسێ و تیتۆکەو هەنجیرە)، دانراوە، کە ئێستا بەشێکن لە ڕانیە.[٣]

---

[١] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی سامانە سروشتیەکان، وێستگەی سوتەمەنی ڕانیە، ٢٠١٦/٥/١٧.

[٢] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی دارایی و ئابوری، فەرمانگەی بانکی ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١١/١٨.

[٣]حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار، بەڕێوەبەرایەتی ئاوی ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١٢/١٧.؛سەباح مەرگەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢-٤٥؛ حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار، بەڕێوەبەرایەتی ئاوی ڕانیە، بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١٢/١٧.

### ١٩- بنكەی بەرگری شارستانی ڕانیە

لە (١٩٨٢/٨/٢٦) بنكەی بەرگری شارستانی لە ڕانیە كراوەتەوە، یەكەمین لێپرسراوی بنكەش ناوی محەمەد دڵشاد بووە. (١٠) فەرمانبەری هەبووە بە مەدەنی و سەربازیەوە، دواتر محەمەد مامە جێگەی گرتۆتەوە. لە ساڵی (١٩٨٤) عەجیل جەلال خدر بۆتە لێپرسراوی بنكەكە، بنكەكانی بەرگری شارستانی سەرەتا سەر بە وەزارەتی شارەوانی بووە و دواتر گۆڕانكاری بەسەر داهاتووە، فەرمانبەرانی بنكەی ئاگركوژێنەوە دووجۆر بوون سەربازی و مەدەنی، لێپرسراوی ئاگركوژێنەرەوە و فەرمانبەری ئاسایی، پلەی سەربازیان هەبووە، كرێكارێكارەكانیش مەدەنی بوون.[١]

لەماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) كۆمەڵێك فەرمانگەو دەزگای حكومی لە ناوچەكە هەبوون، وەك جێنشین كە یەكەمین دەسەڵاتی كارگێڕیە لە ناوچەكە، مێژوویەكی كۆنی هەیە، جێنشینیش دوو بەش بووە: كارگێڕی و دارایی، هەروەها بنكەی پۆلیس و هەندێك دەزگای تریش هەبووە لەم ماوەیە وەك دەزگای ئاسایش و هەواڵگری، فەرمانگەی بەسەربازی كردن (تجنید)، كە لەگەڵ ڕاپەڕینی (١٩٩١/٣/٥) ڕانیە هەڵوەشانەوە، ڕانیە لەماوەی بەشارۆچكە بوونیدا كۆمەڵێك جێنشینی بەخۆیەوە بینیوە، هەندێك هی سەردەمی حوكمی دەوڵەتی عوسمانی بووە كە پێشتر ئاماژەمان پێیكرد، بەشێكی تریش هی هەردوو سەردەمی پاشایەتی و كۆماری بووە، بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ناوی بەشێك لە جێنشینەكانی ڕانیە بە هەردوو سەردەمی پاشایی و كۆماری بڕوانە پاشكۆی ژمارە (٣).[٢]

---

[١] حكومەتی هەرێمی كوردستان: وەزارەتی ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتی بەرگری و شارستانی ڕانیە، بەشی ڕاگەیاندن، ٢٠١٦/١١/٩.

[٢] هەرچەندە ماوەی پادشایی، سەردەمی توێژینەوەی ئێمە نیە، بەڵام لایەنی كارگێڕی وەك لایەنەكانی تر نیەو ئەڵقەیەكی گریدراوە بەیەكەوە، بۆیە هەندێك جار ناچار دەبیت، ئاوڕ لە ڕابردوو بدەیتەوە، بەتایبەت بۆ ناوچەیەكی وەك ڕانیە كە تا ئێستا كەمترین توێژینەوەی زانستی و ئەكادیمی لەسەر نووسراوە.

## باسی دووەم: بارودۆخی سیاسی ڕانیە لە ( ١٩٥٨/٧/١٤- ١٩٧٤/٣/١١)

لـە (١٤) تـەمموزی (١٩٥٨) گۆڕانکارییـەکی سیاسـی و سـەربازی ڕویـدا و سیسـتەمی سیاسـی عێراق لە پاشایەتیەوە گۆڕا بۆ کۆماری، گەلی کوردیش هـەر لـە سـەرەتاوە نـاوی شۆڕشـی چواردەی گەلاوێژی بۆ هەڵبژارد.[١] ئەنجومەنێکی سەرکردایەتی لە جێگەی سەرۆک کۆمار پێکهات کە یـەکێک لـە ئەندامـەکانی کـورد بـوو، (عەبدولکـەریم قاسـم)[٢] کـرا بـە سـەرۆکی ئەنجومـەنی وەزیـران و وەکیلـی وەزیری بەگری، لەو حکومەتەدا چەند وەزارەتێک بەکورد درا.[٣] شۆڕشی (١٤) ی تەمموز گۆڕانکاری گەورەی لەسـەر ئاستی نـاوخۆی عیراق و نێودەوڵـەتی هێنایە کایـەوە، لەسایەیدا دۆزی کـوردیش لـە باشوری کوردستاندا قۆنـاغێکی نوێی خـەباتی دەست پێکرد، گـەلی کـورد بـە هیـواو گەشبینیەوە لـەم ڕوداوەی دەڕوانـی، وەفـدێکی (پـدک) بـە سـەرکردایەتی ئیبـراهیم ئەحمـەد (١٩١٤-٢٠٠٠) سـەردانی بـەغـدای کـردو چـاوی بـە عەبدولکـەریم قاسـم کـەوت و داوای کۆمـەڵێک مـافی سیاسـی و ئـابوری و کۆمەڵایەتی بۆ کورد کرد.[٤] لە دەستوری کاتیی عیراقی کۆماریدا (١٩٥٨) جـەخت لـە کۆمـەلێک مـادەو بەنـدی دەسـتوری کرابـۆوە، لـە بەنـدی سـێدا ئامـاژەی بـەوە دەکـرد کـە کـورد و عـەرەب لـە عیراقـدا هاوبەشن، لەگەڵ کومەڵێک مادەی تر کە دانی بە هەندێک مافی کورد لە چوارچێوەی عیراقدا نابوو،[٥]

هاوڵاتیـانی عیـراق لـە بـاکورەوە بۆ باشـوور بـە جـۆش و خرۆشـەوە لـە شـۆڕش و کەسـایەتی (عەبدولکەریم قاسم)یان دەڕوانی، ڕۆژانە سەردانیان دەکرد و پشتیوانییان بۆ دەردەبڕی.[٦] لـە ڕۆژی (١٩٥٨/١٠/٧) مەلا مستەفای بارزانی لەگەڵ کۆمـەڵێک لـە هـاوەڵانی لـە یـەکێتی سـۆڤیەتەوە گـەڕایـەوە عیراق، لە ساڵی (١٩٥٩) ڕێگەدرا ڕۆژنامەی (خەبات)ی سەر بەپارتی چاپ و بڵاو بکرێتـەوە، لـە سـاڵی (١٩٦٠) دا (پدک) وەک پـارتێکی سیاسـی، لـە لایەن دەوڵـەتـەوە بـە فـەرمی مۆڵـەتی یاسـایی کـارکردنی

---

[١] عەبدولقادر سالح: شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٦٨ لە عێراق، پێداچونـەوەی ئـاکۆ شـوانی، چاپخانـەی کـاردۆ، سلیمانی، ٢٠٠٥، ل٧، ١٣.

[٢] لە ساڵی ١٩١٠ یان١٩١٣ لە قەزای سویرەی سـەر بـە پاریزگـای واسـت لـە دایـک بـووە، بـاوکی بازرگـان بـووە، سـاڵی ١٩٣١ بووە بە مامۆستا و ساڵی ١٩٣٢ چۆتە کۆلیژی سـەربازی و دواتـر کـۆلیژی ئـەرکان، چەندین پلـەی سـەربازی وەرگرتـووە، سـاڵی ١٩٥٨ شـۆڕشـی دژی سیسـتـەمی پاشـایەتی کـردووەو لەشـوباتی ١٩٦٣ لـە ڕێگـەی کودەتـاوە کوژراوە. بروانە: عبدالطیف الشواف: عبدالکریم قاسم و عراقیون آخرون، بیروت، ٢٠٠٤، ص٥٥-٦٦.

[٣] ڕەشید موحەمەد عەلی:عەبدولکەریم قاسم لە تەرازوی ویژداندا، چاپخانەی چوارچرا،سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٢٥-١٢٦.

[٤] ئەحمەد حەمەدئەمین: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی نوێ و هاوچـەرخی عێراق، چاپخانـەی ڕۆژهـەڵات، هـەولێر، ٢٠١٠، ل١٧٣-١٧٤.

[٥] سوارە قەڵادزێیی: ڕاپەڕین و بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کورد،چاپخانەی کارۆ،سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٠١-١٠٢.

[٦] عـەلادین سـەجادی: شۆڕشـەکانی کـورد و کوردوکۆمـاری عێـراق، ئامـادەکردنی ئەحمـەد موحەمـەدی، ئەتلـەس چـاپ، تاران، ٢٠٠٥، ل٣٤٢.

پێدرا.[1] ئەو گۆڕانکاریانەی لەم سەردەمە هاتبوونە کایەوە کاریگەریی لە سەر شارۆچکەی ڕانیە هەبوو، وەفدێک لە چینە جیاوازەکانی ڕانیە لە چوارچێوەی وەفدی کوردی گەیشتنە بەغدا، کە پێکهاتبوون لە: (عەبدولرەحمان ئیسماعیل مامەڕووت، تۆفیقی مەلا سدیق، عەباس مەمەند ئاغا، شێخ حوسێن بۆسکێن، شێخ حەمید سەدرەدین)، لە بەغدا چاویان بە ئەنجومەنی سەرکردایەتی عیراق و عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف کەوت، عەبدولکەریم قاسم وەک سەرکردەی شۆڕش و ئیبراهیم ئەحمەد وەک سەرۆکی وەفدی کوردستانی وتاریان خوێندەوە، جەختیان لە برایەتی کورد و عەرەب و کەمایەتیە نەتەوەییەکانی عیراق کردەوە، دوای سێ ڕۆژ مانەوە لە بەغداد، وەفدەکە بەرەو ڕانیە گەڕانەوە.[2] لەگەڵ گەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ عیراق و نیشتەجێ بوونی لە بەغداد، (عەبدوڵڵا پشدەری) و (عەباس مەمەند ئاغا)[3] ی ڕانیە لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی تر، بە نوێنەرایەتی عەشایەری پشدەر و ڕانیە، ڕوو دەکەنە بەغدا و لەوێ چاویان بە مەلا مستەفا دەکەوێت.[4]

لە ساڵی (١٩٥٨) یاسای ژمارە (٣٠) دەرچوو کە تایبەت بوو بە چاکسازی لە بواری کشتوکاڵدا، بە پێی یاساکە هەموو ئەو زەویانەی کە لە (١٠٠٠) هەزار دۆنم بەراو و (٢٠٠٠) دووهەزار دۆنم پشت ئاو (دێمەکار) زیاتربێت دەستیان بەسەر دادەگیرێت و دووبارە بەسەر جوتیاران دابەش دەکرێنەوە، بەهۆی هەڵکەوتەی خێڵەکیی کوردستان، ئەم یاسایە لە لایەن ئاغاو دەرەبەگەکانەوە ڕووبەڕووی بەرهەڵستکاری بۆوە، بەتایبەت لە هەندێ ناوچەی وەک ڕانیە و پێنجوین و پشدەر، هەر بۆیە لەم ناوچانە نەتوانرا جێبەجێ بکرێت.[5] لە ئەیلولی (١٩٥٨) عەبدولسەلام عارف لە دەسەڵات دورخرایەوەو کۆمەڵێک تۆمەتی خرایە پاڵ و کاری دبلۆماسی لە (بۆن)ی ڕۆژئاوای ئەڵمانیا وەک باڵوێزی عێراق پێسپێردرا،[6] لەساڵی (١٩٥٩) (پد ک) تومەتبارکرا، کە لەگەڵ عەبدولسەلام عارف ڕێککەوتوون بۆ دابەشکردنی عیراق، لە بەهاری (١٩٥٩) پروپاگەندەی ئەوە هەبوو کە (مەسعود محەمەد)[7] و کۆمەڵێک کەسایەتی تر بە هاوکاری (عەباسی مامەند ئاغا)ی ڕانیە و مەلاکان خەریکی

---

[1] د. فەرەیدون نوری: بزاڤی بارزانی، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٥٥،٢٦١،٢٦٦.

[2] تۆفیقی مەلا سدیق: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥-١٦.

[3] عەباس مەمەند عەباس: لەدایک بووی ١٩٢٢ سەرکەپکانی ڕانیەو سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ بووە، یەکێک بووە لە کەسایەتیە دیارەکانی ناوچەی ڕانیە، لە ساڵی ١٩٦٦ بەهۆی نەخۆشی کۆچی دوای کردووە، چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەمزە عەباس مەمەند، ٢٠١٥/١٢/٢.

[4] عبدللە ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری: یاداشتەکانم، ب١، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٢، ل١٣٠.

[5] قانون الاصلاح الزراعی الرقم: (٣٠)، الوقائع العراقیة، العدد(٤٤)، فی١٩٥٨/٩/٣٠؛ د. طه ناجی: ثورة العراق المجیده ١٤ تموز ١٩٥٨ و الرهان علی العسکر، دار الرواد، بغداد، ٢٠٠٩، ص٩٢-٩٨.

[6] حەسەن عەلەوی: عەبدولکریم قاسم تیڕوانین پاش بیست ساڵ، و: کاروان ئەنوەر مەسیفی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١١، ل١٨٩-١٩٠.

[7] مەسعود محەمەد کەسایەتیەکی ناسراوی کوردە، لە ساڵی ١٩١٩ لە کۆیە لە بنەماڵەیەکی ناودار لە دایک بووە، لە ساڵی ١٩٤٥ کۆلێژی مافی لە بەغدا تەواو کردووە، ماوەیەک کاری دادوەری کردووە، لە ساڵی ١٩٥٤ نوێنەری

پلانگیڕانن لە نێوان ناوچەی کۆیە و ڕانیە بۆ ڕاپەڕین، دواتر حکومـەت بـەدواداچونی بۆ کـردوە، بۆی دەرکەوت کـە هەواڵەکـە ناڕاسـت بـووە، لەگـەڵ دامەزراندنی کۆمـار و چاکسـازییەکانی وەزارەتەکـەی عەبدالکریم قاسم، لە ڕانیە ململانێی نێوان چەپ و ئەوانـەی خۆیـان بـەلایەنگری قاسـم دەزانی لەگـەڵ ئاغـاو دەرەبەگـەکان گەیشـتبووە ئاسـتیکی زۆر تونـد، سـەرۆک عەشـیرەتەکان خۆیـان لـە خـەڵک دەشاردەوە، بۆیە سەرۆک عەشیرەتەکان بڕیاردەدەن بە وەفدێک بچن بۆ بەغدا و لـەوێ چاویـان بـە قاسم بکەویت، (شیخ حسێنی حاجی سـەید گوڵ[1] و عەباسـی مامەند ئاغا، ئـەنوەری ڕەشـید بـەگ و سمایلی سـوارە ئاغـا) کەسـایەتیەکانی ڕانیـەو پشـدەر داینـەمۆی کارەکـە دەبـن، لـە بەغـدا لـە ڕێگـەی (مەسعود موحەمەد)ەوە دەنگی خۆیان دەگەێنن بە قاسم، بـەڵام قاسـم ئامادە نابێت بـە کۆمـەڵ چـاوی پێیان بکەویت، بـەڵکو پێیـان ڕاگەیاندنێت، تـەنها ئـەتوانێت بـە جیاجیا بیان بینێت، لـەم داواکاریـە تـەنها (سدیقی میران قادر بەگ) ئامادە دەبیت، کە قاسم ببینێ ئەوانی تر ڕەتیدەکەنەوە، لەبەر ئەوە مەسـعود محەمەد بەردەوام بووە لە چارەسـەرکردنی کێشـەی نێوان عەشـایرەکان و عەبدولکـەریم قاسـم دوای ئەوە چەند جارێکی تر سـەردانی قاسمی کردووە، داوای لێکردووە، کە چاکسازی لە یاسای کشتوکاڵدا بکات و دواتر بۆچوونەکانی قاسمی گەیاندۆتەوە بە سـەرۆک عەشیرەتەکان.[2]

کاتێـک سـاڵی (١٩٦٠) پەیوەنـدی سـەرکردایەتی کـورد و حکومـەتی عیـراق بـەرەو ئـاڵوزی چـوو، کـورد حکومەتەکـەی قاسـمی بـە پێشـیلکردنی مـافی کـورد تۆمـەتبار کـرد و ڕەخنـەیان لـەو مـادە دەستورییە گرت کە عیراق بە بەشێک لە نەتەوەی عەرەبی دەزانێت، لەم سەردەمەدا حکومەتی عێراق هەستا بە پڕچەککردنی خێڵەکانی زێبار و برادۆست و هەرکی و ڕێکانیەکان کە نەیاری سـەرکردایەتی کورد بوون، مستەفا بارزانی وەک نوێنەری کورد دەسـتی بـە هەندێک کـاری دیپلوماسـی کـرد، لەوانـە سـەردانیکردنی باڵوێزخانـەی بـەریتانیاو دواتـر سـەردانیکردنی یـەکێتیی سـۆڤیەت. لـە ئـەنجامی ئـەو ساردییەی کـە کـەوتبووە نێوان بـارزانی و قاسـم، بـارزانی بەغدای جێهێشـتوو گـەڕایـەوە بـارزان، لـە (١٩٦١/٣/٣) لە بارودۆخێکی نادیار (سدیق میران)ی دۆست و لایەنگری قاسـم بـە دەسـتی کاوانییـەکان

---

شاری هەولێر بووە لە پەرلەمان، لـە سـاڵی ١٩٦٤ کراوە بـەوەزیر بـۆ ئاوەدانکردنـەوەی باکوور، لـە ١٩٦٦ کراوە بـە ئەندامی ئەنجومـەنی ڕاژە، لـە ١٩٧١ ئەندامی یەکـەم و جێگـری کـۆڕی زانیـاری کوردبـووە، لـە سـاڵی ٢٠٠٢ کـۆچی دوای کردووە. بڕوانە: موحسین دزەیی: ویستگەکانی ژیانم، ب١، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٥٣.

[1] شێخ حوسێنی بۆسکێن: ناوی تەوای حوسێن سەیدگول قادرە لە سالی ١٩٠٧ لە گوندی سندۆلانی پشدەر لەدایک بووە، یەکێک بووە لە سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی ڕانیە و خاوەن مولکدارە گەورەکانی باشوری کوردستان، بەهۆی دروستکردنی بەنداوی دوکان زۆرێک لە زەویەکانی ژێر ئاو کەوتوون حکومەتی عێراق قەرزداری بووە، بە هۆی قەرەبونەکردنەوەی، لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆرشی ئەیلول، بە هەموو هێز و توانایەوەی پشتگیری شۆڕشی کردووە. بڕوانە: عصمت شریف وانلي: كردستان العراق هوية وطنية (دراسة في ثورة١٩٦١)، مطبعة شفان، سليمانية، ٢١٢، ص١٩٢؛ مەحمود عومەر: لاپەڕەیەک لە مێژووی گوندی بۆسکێن، گۆڤاری زنار، ژ(٨)، تەمموزی ٢٠٠٨، ل٥٤-٥٥.

[2] مەسعود محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٢-٣٤٤.

که کادیری (پدک) بوون کوژرا، ئەوەش ڕەوشەکەی هێندەی تر ئاڵۆزترکرد.[1] ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ چەند ئەندامێکی تری کۆمیتەی سەرکردایەتی (پدک) تۆمەتبارکران و بڕیاری گرتنیان بۆ دەرچوو، لە ئازاری (١٩٦١) ڕۆژنامەی (خەبات)ی زمان حاڵی (پدک) داخراوە و لە بەغدا و چەند ناوچەیەکی تر دەستیان بەسەر بارەگاکانی (پدک)دا گرت.[2] لە مانگی ٦/ ١٩٦١ (پدک) داوای بە ئۆتۆنۆمی کردنی ناوچە کوردیەکانیان لە چوارچێوەی عێراق و کۆمەڵێک داواکاری تر دەکرد، بەڵام داواکارییەکان لە لایەن حکومەتەوە ڕەتکرایەوە.[3]

لە (١٩٦١/٧/٢٥) حکومەت عێراق، کەریم قەرەنی ئامر ئینزباتی سەربازی نارد بۆ ڕانیە وکۆمەڵێک کەسایەتی ڕانیەی دەستگیرکرد، لەوانە ( شێخ حەمید خدر، حەسەن کانەبی بلْباس، عەبدولڕەزاقی فەرمانبەری گەنجینە،دڵشاد ڕەسوڵ، کوێخا مینە قرەجۆی) ماوەی (١٤) ڕۆژی دانا بۆ خۆبەدەستەوەدانی هەردوو کەسایەتی دیاری ڕانیە شێخ حوسێنی بۆسکێن و عەباسی مامەند ئاغا،[4] کە دوو سەرۆک عەشیرەتی بەناوبانگی ناوچەی ڕانیە بوون و خۆیان بە پشتیوانی مەلا مستەفا دەزانی. لە مانگی (١٩٦١/٧) کۆبونەوەیەکی فراوانی عەشایەرەکانی بیتوێن لە ماڵی شێخ حسێنی بۆسکین سازکرا، لەم کۆبوونەوەیەدا کە هەموو خاوەن زەویەکانی ناوچەی ڕانیەو پشدەر ئامادە بوون، بڕیاردرا دژی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسم دەست بە ڕێکخستنی خۆپیشاندانی چەکداری بکرێت و دەست بەسەر ناوچەی ڕانیە و قەڵادزێ و ڕێگاکانی نێوان ڕانیە و سلێمانی و کۆیەدا بگیرێت. لەو کۆبونەوەدا مام جەلال وەک نوێنەری (پدک) چۆتە ناو سەرۆک عەشیرەتەکان و داوای لێکردوون کە ماوەیەک کارەکانیان ڕابگرن تا ڕای مەلا مستەفا وەربگرێت، بەڵام سەرۆک عەشیرەتەکان سور بوون لە سەر کارەکان و بەڵێنیان بە مام جەلال دا تەنها دەست بەسەر ڕێگاکاندا بگرن،[5] هەڵچونی عەشیرەتەکان بەردەوام بووە، بەمەبەستی خۆئامادەکردن بۆ شەڕ لە دژی قاسم، هۆزەکانی ناوچەی پشدەر و ڕانیە هەموو چەکدارەکانی خۆیان لە دۆڵی خەلەکان کۆکردۆتەوە لە ژێر سەرپەرشتی عەباسی مامەند ئاغا و شێخ حسێنی بۆسکێن و ئاغاکانی پشدەر،[6] موتەسەریفی سلێمانی وەک نوێنەری قاسم بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرۆک خێڵەکان چوو بۆ لایان، سەرۆک خێڵەکان کۆمەڵێک داواکارییان کردووە کە پەیوەندی بە بەرژەوەندیەکانی خۆیانەوە هەبووە،

---

[1] ڕەفیق ڕەحمان مام خول: مستەفا بارزانی (ژیان و ڕۆڵ و هەڵوێستی لە پێشهاتە سیاسیەکان ١٩٥٨-١٩٧٠)، هەولێر، ٢٠١١، ل٨٩-٩٥.

[2] نەجم سەنگاوی: خەباتی چەکداری و ڕامیاری نەتەوایەتی کورد ١٨٨٠-١٩٩٤، چاپخانەی پەیوەند، کەرکوک، بێ ساڵی چاپ، ل١٣٣.

[3] نیهاد عەلی حسێن: پەیوەندی سیاسی مستەفا بارزانی و عەبدولکەریم قاسم ١٩٥٨-١٩٦٦٣، هەولێر، ٢٠١٣، ل١٠٠.

[4] میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: بەسەرهاتی سیاسی کورد(١٩٥٨/٧/١٤-١٩٨٥)، ب١، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٢٨.

[5] عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری: شۆڕشی ئەیلول ساڵی ١٩٦١ دژی ڕژێمی قاسم، ب٢، چ٢، کەرکوک، ٢٠٠٧، ل١٣-١٤.

[6] ایوب بارزانی: الحركة التحررية الكردية وصراع القوى الاقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، سويسرا، ٢٠١١، ص٩٤.

کەمتر پەیوەندی بە کێشەی نەتەوەییەوە هەبووە. موتەسەڕیفی سلێمانی بەڵێنی جێبەجێکردنی تەواوی داخوازیەکانی پێدابوون، عومەر مستەفا (دەبابە) کە ئەندامی (پدک) بوو ئامادەی کۆبونەوەکە ببوو، کۆمەلێک داواکاری نەتەوەیی دابوو بە موتەسەریف، بەلأم موتەسەریف بەتوندی وەلأمی دابۆوە، کە ئەو هاتووە بۆ کۆبونەوە لەگەڵ سەرۆک خێڵەکان نەک لەگەڵ (پدک).[1] لە رۆژی (١٩٦١/٩/٩) سوپای عیراق بە تۆپ و فرۆکە هێرش دەکاتە سەر کۆبەندی خێڵەکانی دەربەندیخان و دەربەندی بازیان و توانی بگاتە ناو سلێمانی، لە (١١) ئەیلولیش هەواڵ هەبوو، کە سوپا هێرش دەکاتە سەر خەلەکان، بەلأم ئەو لە شکرە عەشایەریەی کە هەبووە هیچ گوێیان بەم هەواڵە نەداوە، چەکدارەکان لە چایخانەکانی کانی وەتمان کۆببوونەوە، خاوەن هیچ دیسپلینێکی سەربازی و ڕێکخراوەیی نەبوون، سوپای عیراق لە ڕێگەی چوار فرۆکەی میگی ڕوسی کەوتە بۆردومانی ناوچەکەو بێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەک بڵاوەی پێکردوون، چەکدارەکان تا ئەو کاتە فرۆکەیان نەبینیوە، بە چەکی بچووکی کلاسیک ڕووبەڕووی فرۆکە بونەوە و زیانێکی زۆریان بەرکەوتبوو، سوپای عیراق لە ماوەی دوو ڕۆژدا توانیویەتی بچێتە ناو ڕانیەوە.[2]

کاتێک سوپای عیراق دەگاتە ناو ڕانیە دەییەوێت پێشڕەوی بەرەو قەڵادزێ بکات، لە گوندی سەیداوای نزیک ڕانیە توشی بەرهەڵستی هێزی چەکداری هۆزەکانی ڕانیەو پشدەر دەبێتەوە، زیانێکی زۆر بەر سوپای عیراق دەگات، چەندین ئۆتۆمۆبیلی سەربازییان لێبەجێدەمێنیت و ناچار بە گەڕانەوە بۆ ناو رانیە دەکرێن، ئەو هێزەی پێشمەرگە، کە لە ڕانیە هەبووە دابەش ببووە بەسەر زنجیرە چیای کێوەڕەش و دەوروبەری ڕانیە و دۆڵی شاور و خۆشناوەتی، لە ڕۆژی (١٩٦١/٩/١٢) جێنشینی ڕانیە لەگەڵ هێزێکی سەربازی حکومەت دەچێت بۆ گوندی بۆسکێنی نزیک ڕانیە، لەگەڕانەوە بەرەو ڕانیە لەلایەن هێزی پێشمەرگە لە چیای کێوەڕەش هێرش دەکرێتە سەریان و زیانێکی زۆر بەر سوپای عێراق دەکەوێت و جێنشینی ڕانیەش بریندار دەبێت، یەکەمین کەسیش کە لەم شەڕانەدا دەکوژرێت ئەفسەرێکی سوپای عیراق دەبیت بە ناوی (حەسەن وائیلی) کە کەسێکی کۆمۆنیست بووە. بۆ ڕۆژی دواتر جارێکی تر سوپا هێرش دەکاتەوە سەر سەیداوا، بەلأم شکست دەهێنیت وسەرکەوتوونابێت، ئەو هێزە چەکداریە کوردیەی کە لە ناوچەی ڕانیە هەبووە (پدک) وەک حزب سەرپەرشتی کردووە، دوای وتوێژ بڕیاری ئەوە دەدەن کە هێرش بکەنەوە سەر ڕانیە و ڕزگاری بکەنەوە، بەلأم بە هۆی سووربوونی عەباسی مامەند ئاغا لە خراپ کاردانەوەی ئەم کارەو کەمی جولأنەوەی شۆڕشگێڕی لە ناوچەکانی تری کوردستان ئەم بیرۆکەیە سەرکەوتوونابێت، دواتر ئەو هێزە چەکدارییە کوردەی کە

---

[1] مەسعود بارزانی: بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم (شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١-١٩٧٥)، ل٣٦.

[2] هاوکار کەریم حەمە شەریف: شۆڕشی ئەیلول لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە ڕێکخستن و چالاکیە سەربازیەکان (١٩٦١-١٩٧٠)، نامەی ماستەر(بلأونەکراوە) ، کۆلیژی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٩، ل٢٢-٢٥؛ پاوڵ شیسمەن، د. خۆشەوی مەلا ئیبراهیم: لە ژێر ئالأی کوردستان ژیان و ڕێبازی مەلا مستەفای بارزان، و: ئەردەلان گۆران، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٢، ل٢٣٩.

هەبوو کۆبونەوەیەکی ناوچەیی لە دەوروبەری ڕانیە ئەنجامدەدەن و بڕیادردەدەن بەشێوەی شەڕی پارتیزانی بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوببنەوە.[١]

لەم کاتەدا سوپای عیراق تەنها ناو ڕانیەی بەدەستەوە بووە، چیای کێوەڕەش و گوندی بۆسکێنی نزیک ڕانیە و ناوچەی سەرکەپکان و دۆڵی شاوریێ بە دەست هێزی پێشمەرگەوە بووە، هەربۆیە بەردەوام بەریەک کەوتن هەبووە، لەم ناوچەیەدا.[٢] لە مانگی ئەیلولی (١٩٦١) دوو لقی پێشمەرگەی (پدک) لە لە گوندی ڕێزینەی سەرکەپکانی ڕۆژئاوای ڕانیە لە ژێر ڕێنمایی (جەلال تاڵەبانی) پێک دەهێنرێت، دواتر (عبدولا ئیسماعیل) ناسراو بە (مەلا ماتۆڕ) دەکرێتە سەرپەرشتیاریان.[٣] لە دوای داگیرکردنی ڕانیە لە لایەن سوپای عیراقەوە ڕێکخستنەکانی (پدک) وەک تاکە حزبی ناو گۆڕەپانی هێزی بەرهەڵستکار، ڕوودەکەنە دەوروبەری ڕانیە و بارەگای گشتی هێزی پێشمەرگەش لە ناحیەی بێتواتە دادەمەزرێنن، لیژنەی ناوچەی (پدک) لە سەروچاوە، لە گوندەکانی تیتۆکە و هەنجیرە و کونەسێی چواردەوری ڕانیە دادەمەزریت و هێرشەکانی پێشمەرگە ئاراستەی ناو ڕانیە دەکرێت.[٤] ڕانیە دەبێت بەیەکێک لە مەڵبەندە کاریگەر و گرنگەکانی شۆڕشی ئەیلوول و کۆبوونەوەی هێزە چەکدارە خێڵەکیەکان لەم سەردەمەدا، لەناو شارۆچکەی ڕانیە جگە لە لایەنگرانی پارتی، حزبی شیوعیش بنکەیەکی جەماوەری فراوانی هەبووە، لە پێش شۆڕشی (١٩٥٨) عیراق و لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول ڕانیە بۆتە جێگەی ململانێی نێوان پارتی (پدک) و کۆمۆنیستەکان (حزبی شیوعی عیراق)،[٥] کە لایەنگیرییەکی زۆریان بۆ عەبدولکەریم قاسم هەبووە، زۆربەی خەڵکەکەی شیوعی بووە، بەشێک لە لایەنگرانی (پدک) هێرشیان کردۆتە سەر لایەنگرانی کۆمۆنیست و توندوتیژییان دژیان بەکارهێناوە، لەگەڵ دەسپێکی شۆڕشی ئەیلوول بەشێکی زۆر لە شیوعیەکان بوون بە (پدک) و ئاستی جەماوەری شیوعی لە ڕانیە زۆر کەمی کردووە، هەتا لە ساڵی (١٩٦٢) (حەمەد مەجید هاوار) کە سەرۆکی سەندیکای کرێکاران بووە بە لە (٧٠%) ئەندامەکانیەوە چۆتە ناو

---

[١] عەبدوڵلا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری: شۆڕشی ئەیلول، ل ٣١-٣٥؛ فاتیح ڕەسوڵ: لە کاروانێکی دووردوودرێژدا (کورتەی خەبات و ئەزموونی پەنجا ساڵ)، ستۆکۆڵم، ١٩٩٧، ل١٤٨؛ كافي محمد النبوي، سيرة ودور، اربيل، ٢٠٠١، ص١١٨-١١٩.

[٢] چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد ئیسماعیل قادر: ٢٠١٦/١/٤، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٤١ لە مەرگە لەدایک بووە، لە ساڵی ١٩٦١ بۆ ١٩٧٠ پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، بەشداری زۆربەی شەڕەکانی ناوچەی ڕانیەی کردووە، لە ساڵی ١٩٧٠ وازی لە پێشمەرگایەتی هێناوە، ئێستا خانشینی پێشمەرگەیە.

[٣] توفیقی مەلا سدیق: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧-٢٨.

[٤] چاو پێکەوتن لەگەڵ ئەسوەد ئیسماعیل عەبدولڕەحیم: ٢٠١٥/١/٤، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٨ لە ڕانیە لە دایک بووە، لە١٩٦١-١٩٧٥ پێشمەرگەی پارتی بووە، لە ١٩٦٧-١٩٧١ بەرپرسی ناوچەی پارتی بووە لە ڕانیە، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

[٥] بۆ زانیاری زیاتر لە کاریگەری پارتی کۆمەنیستی عێراق لەسەر کورد. بڕوانە: سەروەر عبدالرحمن عمر: پارتی کۆمەنیستی عێراق و مەسەلەی کورد، نامەی دکتۆرا(بڵاونەکراوە)، کولێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٨.

(پد ک)، کەسە دیارەکانی ئەوسای ڕێکخستنی ناوچەی ڕانیە (پدک) بریتی بوون لە (مەجید گورگ، حوسێن عەلی، مەلا فاتح عەسکەری، سدیقی خەیات، ئیبراهیم جەلال، عەباسی ڕێکخراو، حوسێنی حاجی تایەر، شەفیق تایەر).[١]

لە (١٩٦٢/٧/٣١) کۆمەڵێک پۆلیس و ئەفسەر لە ناوچەی ڕانیە بەچەکەوە دەچن بۆ ناو هێزی پێشمەرگەوە، حکومەت لە دژی ئەم کارە هێزێکی سەربازی دەنیریت بۆ ڕانیە، خەڵکیش بۆ ڕێگرتن لەم کارە هەڵدەستن بە تێکدانی ڕێگاکانی دەرەوەی ڕانیە و ڕاکردن بۆ چیاکانی دەوروبەری ڕانیە و لە (١٩٦٢/٨/٨) هێزێکی سەربازی عێراق لە ژێر سەرپەرشتی لیوا عەبدولغەنی ئیبراهیم دەگاتە ڕانیە و دەستدەکات بە گرتن و ئازاردانی خەڵکی شارەکە، هەر لەم ساتە وەختەدا لە ماڵی مەلا فاتیحی ڕەسام دەستدەگیرێت بەسەر کۆمەڵێک ناوی ڕێکخستنی حزبی ناو ڕانیەو بەم هۆیەوە خەڵکێکی زۆر خۆی دەشارێتەوە و نائارامی و ترس باڵ دەکێشێت بەسەر شارۆچکەکەدا.[٢] لە دوای دەستبەسەرداگرتنی ڕانیە، لە ناو هێزی پێشمەرگە و ڕێکخستنی (پدک) پلان دادەنرێت کە دەست بەسەر سەرای ڕانیەو تەواوی ڕانیەدا بگیرێتەوە، لە شەوی (٢٧-١٩٦٢/٨/٢٨) هێزێکی پێشمەرگە بەفەرماندەیی هەریەک لە عەباسی مەمەند ئاغای ڕانیە و ئەنوەر بەگی بێتواتە و ڕەشید شێرە پەلاماری سەرای ڕانیە دەدەن، بەڵام سەرکەوتوونابن، لە (١٩٦٢/٩/٥) جارێکی تر لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە پەلاماری سەرای ڕانیە دەرێتەوە، دەستدەگیرێت بەسەر سەراو سەرجەم فەرمانگەکاندا و جینشین و پۆلیس و سەرجەم فەرمانبەرانی دەوڵەت دەستگیردەکرێن، بەڵام دواتر ئازادیان دەکەن. لەم هێرشەدا بەشێک لە پۆلیسەکانی حکومەت هاوکاری پێشمەرگە دەکەن، کاتێکیش لە هەمان ساڵدا (١٩٦٢) پۆلیسێکی دەچنە ناو ڕیزی پێشمەرگەوە، بەهۆی ئەم کارەوە دەست بەسەر هەموو بەڵگەنامە حکومی و چەک و تەقەمەنیەکانی ناو ڕانیەدا دەگیرێت، دەرمانی خەستەخانەو تووتنی فەرمانگەی ئنحصاری ڕانیە ڕەوانەی دەرەوەی ڕانیە دەکرێت و ئەو تووتنەش، کە ناتوانن بیگوازنەوەئاگری تێبەردەدەن و دەیسوتێنن، لە (١٩٦٢/٩/٧) پێشمەرگە رانیە چۆڵدەکات و حکومەتی عیراق لە کۆیەوە هێرشێکی سەربازی دەکاتە سەر ڕانیەو داگیری دەکاتەوە. دواتریش هێرش دەکاتە سەرچیای کێوەڕەش، بەڵام لەلایەن پێشمەرگەوە ڕووبەڕووی تێکشکانێکی زۆر گەورە دەبێتەوە، لەم شەڕەدا جارێکی تر لەلایەن پێشمەرگەوە دەست بەسەر ڕانیەدا دەگیرێتەوە و چەک و تەقەمەنیەکی زۆر دەکەوێتە دەستی پێشمەرگە، لە ڕۆژانی (٩-١٩٦٢/٩/١٠) حکومەت بە فڕۆکە بۆردوومانی توندی ڕانیە و چیای کێوەڕەش دەکات، زۆربەی خانووەکانی ناو ڕانیە وێراندەکات، بەڵام جارێکی تر سوپا لەم هێرشەشدا شکست دەهێنێت و جێنشینی ڕانیە و ئەفسەرێکی زور بەدیل دەگیرێ، کە ئەم شەڕە بە شەڕی کێوەڕەش بەناوبانگە و بەیەکێک لە شەڕە گرنگەکانی شۆڕشی ئەیلوول دادەنرێ، لە

---

[١] ئیبراهیم جەلال: خواروی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول بنیاتنان و هەڵتەکاندن ١٩٦١-١٩٧٥، چ٣، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٨١-٨٢.

[٢] میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: بەسەرهاتی سیاسی کورد (١٩٥٨/٧/١٤-١٩٨٥)، ل٤٧-٤٩.

(١٩٦٢/٩/١١) جارێكی تر ڕانیە لە لایەن سوپای عیراقەوە داگیردەكرێتەوە.[١] بەم جۆرە لە ماوەی ساڵانی سەرەتای دەستپێكی شۆڕشی ئەیلوولدا ڕانیە مەڵبەندێكی گرنگ بووە بۆ پێشمەرگە و سەركردایەتی هێزی پێشمەرگە، هەر بۆیە لە ماوەی ساڵانی (١٩٦٢-١٩٦٣) مەلا مستەفا بارزانی وەک كەسی یەكەمی شۆڕش ماوەیەک لە ناوچەی دەوروپشتی سەركەپكان و دۆڵی شاوریێ لە ڕۆژئاوای ڕانیە بارەگای هەبووە، ماوەیەكیش لە ناحیەی بێتواتەی سەر بە قەزای ڕانیە نیشتەجێ بووەو ڕێكخستنە سەربازی و سیاسیەكانی لەوێوە ئاراستەكردووە.[٢]

لە (١٩٦٣/٢/٨) كودەتایەكی سەربازی لە عیراق ڕوودەدات و كۆتایی بە دەسەڵاتی عەبدولكەریم قاسم هات و حكومەتێكی تازە دامەزرا لە بەعسی و نەتەوەییەكان، سەرۆک كۆمار درا بە عەبدولسەلام عارف[٣] و سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیرانیش درا بە ئەحمەد حەسەن بەكر، كوردیش پۆستی چەند وەزارەتێكی وەرگرت، وەک ئاگادارو چاودێری دۆخەكە.[٤] هەریەک لە فوئاد عارف و سالح یوسفی بە ناوی گەل و شۆڕشی كوردەوە بروسكەی پاڵپشتیان بۆ كودەتا چیەكان نارد، داوای چارەسەری كێشەی كوردیان كرد، حكومەتی تازە ڕەزامەندی دەربڕی بەوەستانی شەڕ و ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ سەركردایەتی جوڵانەوەی كورد، مەلا مستەفاش كۆبوونەوەیەک ڕێكدەخات، لەو كۆبونەوەیەدا وەفدێک بە سەركردایەتی جەلال تاڵەبانی پێكدێت، بە مەبەستی گفتوگۆكردن دەچنە بەغدا. تاڵەبانی لە بەغداوە دەڕوات بۆ قاهیرە و چاوی بە جەمال عەبدولناسری سەرۆكی میسر دەكەوێت، دواتر دەگەڕێتەوە بەغدا، بۆ بەردەوامی گفتوگۆكان.[٥]

لە (١٩٦٣/٣/٢) یەكەمین شاندی فەرمیی حكومەت بە سەرۆكایەتی (تاهیر یەحیا) دەگاتە گوندی (كانی ماران) سەر بە شارەدێی چوارقوڕنەی نزیک ڕانیە، لەگەڵ نوێنەرانی پارتی بەسەرۆكایەتی مەلا مستەفا كۆبوونەوە، شاندی حكومەت كۆمەڵێک پێشنیاری بە مەلا مستەفادا، بەڵام هەر زوو پێشنیارەكان لە لایەن سەركردایەتی كورد ڕەتدەكرێنەوە، دواتر سەركردایەتی كورد دوو پێشنیار بە شاندی حكومەتدا، كە یەكەمیان داوای نیاز پاكی و دووەمیش داوای مافی ئۆتۆنۆمی بوو بۆ كورد،

---

[١] ئیبراهیم جەلال: سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٤-٨٧.

(٢)شەوكەت مەلا ئیسماعیل حەسەن: ڕۆژانێ لە مێژوو شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١-١٩٧٥، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ١٤٢.؛ چاوپێكەوتن لەگەڵ عەلی شەریف محمەد (كوێخا) : ٢٠١٥/١/٥، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٢٢ لە لە ناوچەی مەرگە لە دایک بووە، یەكێک بووە لە بەشداربوەكانی كۆماری كوردستان لە مهاباد و دواتر شۆڕشی ئەیلول، ئێستا لە ڕانیە نیشتەجێیەو پێشمەرگەی خانەنشینە.

[٣] عەبدولسەلام محمد عارف، لە ساڵی ١٩٢١ لە بەغدا لە دایک بووە، سەر بە هۆزی جومەیلەی ئەنبارن، باوكی بازرگان بووە، ١٩٣٩ كۆلێژی سەربازی تەواو كردووە، چەندین پلەی سەربازی بڕیوەو ڕۆڵی كاراو یەكلارەوەی بینیوە لە شۆڕشی ١٩٥٨ عێراق، لە ١٩٦٣ بە كودەتا بۆتە سەرۆک كۆمار و لە ١٩٦٦ بە سووتانی فرۆكە گیانی لە دەستداوە، بڕوانە: احمد فوزی: عبدالسلام محمد عارف، مطبعة الدار العربيه، بغداد، ١٩٨٩.

[٤] د. مكرم طالباني: مراحل تطور الحركة القومية الكردية، مؤسسة حمدي، السليمانية، ٢٠٠٩، ص٢٣٣-٢٣٦.

[٥] حبيب محمد كريم: تاريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني- العراق (في محطات رئيسية) ١٩٤٦-١٩٩٣، دهوک، ١٩٩٨، ص ٨٤-٨٥.

بەڵام بەعسیەکان بەبیانوی ئەوەی نەتەوەییەکانی تری عیراق قبوڵیان نیە ئۆتۆنۆمیان رەتکردەوە.[١] لە (٧-١٩٦٣/٣/٨) گفتوگۆیەکی تر لە شارەدێی چوارقورنەی ڕانیە ئەنجامدەدرێ، لە (١١) ی ئازار ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عیراق بڕیاردەدات، کە ڕێز لە مافی نەتەوەی کورد دەگرێت لە چوارچێوەی لامەرکەزی و لە دەستوری عیراقدا وەک بنەمایەک جێگیری دەکات، دواتریش مستەفا بارزانی بڕیاریدا کۆنگرەیەکی حزبی رێکبخات بەمەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ حکومەت.[٢] بارزانی ڕێزێکی زۆری لە ئاغاو سەرۆک خێڵەکان دەگرت لە ماوەی گفتوگۆکردن کە لە ناوچەی ڕانیە بوو، بەڵام ناوچەی (پدک)ی ڕانیە کۆمەڵێک کاری ڕێکخستنی کشتوکاڵی ئەنجامدا بوو ئەم کارانەی ناوچەی پارتی ببووە هۆی نارەزایی سەرۆک خێڵەکانی ناوچەکە، بەم هۆیەوە بارزانی تەواوی ئەندامانی ناوچەی (پدک) لە ڕانیە بانگ دەکات بۆ بارەگای خۆی لە بێتواتە و سەرجەمیان بە زیندانی کردن و دورخستنەوە سزا دەدات و سەرجەم کارەکانیشیان هەڵدەوەشێنێتەوە.[٣]

گفتوگۆکانی نێوان حکومەت و سەرکردایەتی کورد بەردەوامیان دەبێت، بەڵام حکومەت لە گفتوگۆکانی لەگەڵ کورد نیازی باش نابێت، لەگەڵ ئەوەشدا ، لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی (١٩٦٣) سەرکردایەتی کورد بەمەبەستی گفتوگۆ کردن وەفدێکی تر دەنێرێتە بەغدا، بەڵام شاندە کوردیەکە دەخرێتە ژێر چاودێری توند و هیچ گرنگیان پێنادرێت، لە کاتی گەڕانەوەیان لە کەرکوک دەستبەسەردەکرێن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی گفتوگۆکان بەتەواوەتی شکست بهێنن،[٤] لە (١٩٦٣/٦/١٠) ڕادیۆی بەغدا لە بەیاننامەیەکدا ڕایدەگەیێنێت، کە بزووتنەوەی کوردی بەکرێگیرا و خزمەتکاری ئیمپریالزمەو پێویستە چەک بکرێن و جەنگ دژی کورد ڕادەگەێنێت. سوپا هێرشێکی توند دەکاتە سەر ناوچە کوردیەکان، لە سلێمانی خەڵکێکی زۆر لە سێدارە دەدات.[٥] لە (١٩٦٣/٧/٦) ئەو شاندەی کورد کە لە کەرکوک دەستبەسەرکرا بوون هەندێکیان ئازاد دەکات و لە ڕێگەی هیلیکۆپتەرەوە ڕەوانەی ڕانیەیان دەکاتەوە، هێزێکیش بەمەبەستی گفتوگۆ لەگەڵ هێزی چەکدار و عەشایەرەکانی ناوچەکە، بەناوبژیوانی (مەسعود محەمەد، بابەکر پشدەری و حوسێن خانەقا) ڕەوانەی ڕانیە دەکات، کاتێک وەفدەکە دەگاتە ناو ڕانیە، خەڵکی ڕانیە لە ترسی پەلاماری سوپا ڕوو لە چیاکان دەکەن، وەفدی حکومەت لە چیای کێوەڕەش چاویان بە عەباسی مامەند ئاغا و هەندێک لە چەکدارەکان دەکەوێت، دوای ئەم گفتوگۆیە حکومەت هەموو گیراوانی شاندی کورد ئازاد دەکات.

---

[١] واحید عومەر محێدین: دانووستانەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد و حکومەتەکانی عێراق (١٩٢١-٢٠١٢)، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٣٦- ١٣٩؛ دانا ئادامز شمیدت: سەفەرێک بۆ ناو پیاوە ئازاکانی کوردستان، و، ئەبوبەکر سالح ئیسماعیل، دهۆک، ٢٠٠٨، ل٤٥٦-٤٥٧.

[٢] عبدالكريم فندي: فصول من ثورة ايلول في كردستان العراق، مطبعة كلية الشريعة جامعة دهوك،١٩٩٥، ص ٥٤-٥٥.

[٣] ئیبراهیم جەلال: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٧-١٠٩.

[٤] شيرزاد زكريا محمد: الحركة القومية في كردستان العراق ٨ شباط ١٩٦٣- ١٧ تموز ١٩٦٨، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٦، ص١١٢-١١٣.

[٥] د. شیرکۆ فەتحولا عومەر: پارتی دیموکراتی کوردستان و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە عێراق ١٩٤٦-١٩٧٥، و: سوارە قەڵادزەیی، کەرکوک، ٢٠١٢، ل١٩٦-٢٠٠.

دواتریش لە ١٩٦٣/٨/٢٠ لە ڕێگەی مەسعود محەمەد و زەعیم سدیقی فەرماندەی بیستی سوپای عێراق لە ڕانیە، وەفدێکی تری حکومەت بەمەبەستی گفتوگۆ لەگەڵ عەشایرەکانی ڕانیە بەسەرۆکایەتی حازم جەواد وەزیری ناوخۆی عیراق بەوەکالەت دەگاتە گوندی سەیداوای نزیک ڕانیە، شێخ حسێن وەک نوێنەری عەشایەری و ئەندامی (پدک) کۆمەڵێک داواکاری دەدات بە حکومەت، کە خۆی لە هەمان داواکاریەکانی پێشووی سەرکردایەتی کورد دەبینیەوە، دوای گفتوگۆ وەفدەکە داواکاریەکانی عەشایرەکان دەگەیەنێ بۆ بەغدا بەبێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی هەبێت.[١]

لە (١٩٦٣/١١/١٨) کودەتایەکی تر لە بەغدا ڕوودەدات، عەبدولسەلام عارف بەزەبری هێز دەسەڵات لە بەعسیەکان وەردەگرێتەوە، لە لایەنگرانی خۆی حکومەتێکی تازە پێکدەهێنێ،[٢] جارێکی تر گفتوگۆکانی نێوان کورد و حکومەتی عیراق دەستپێدەکاتەوە، لە (١٩٦٤/١/٣٠) شاندێکی حکومەتی عیراق بە سەرۆکایەتی پارێزگاری سلێمانی (عەمید عەبدولڕەزاق مەحمود) بە یاوەری (شێخ ئەحمەد بارزانی) و کۆمەڵێک کەسایەتی تر دەگاتە ڕانیە،[٣] لەگەڵ شاندی کوردیش پێکهاتوو لە (مەلا مستەفا، جەلال تاڵەبانی و نوری شاوەیس و عەباسی مامەند ئاغاو مەسعود محەمەد و عەقید کافی)، وتووێژ دەکات، ئەم گفتوگۆیە تا (١٩٦٤/٢/١٠) بەردەوام دەبێت و بە ڕێککەوتن لەسەر چەند خاڵێک کۆتایی دێت.[٤] لە دوای ئەم ڕێککەوتنە کێشە دەکەوێتە نێوان ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری (پدک) و مەلا مستەفا، یاخود نێوان مەکتەبی سیاسی بەگشتی و بارزانی، ئیبراهیم ئەحمەد و مەکتەبی سیاسی پێیان وابوو پێویستە کورد مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرێت و ئەو ڕێککەوتنەی ئەنجامدراوە هیچ دەسکەوتێکی بۆ کورد تێدا نیە، بۆیە مەکتەبی سیاسی پارتی لە (٤-١٩٦٤/٤/٩) کۆنفرانسێک لە ماوەت دەبەستن و ڕەخنە لە کارەکانی مەلا مستەفای سەرۆکی حزب دەگرن،[٥] بەمەبەستی چارەسەری ئەو کێشەیەی کە لە نێوان مەلا مستەفا و باڵی مەکتەبی سیاسی دروستبووە، شاندێکی کوردی پێکهاتوو لە (٢٠) کەسایەتی ناسراوی کورد لە بەغداوە سەردانی ڕانیە دەکات، بەئامادە بوونی مەلا مستەفا و جەلال تاڵەبانی کۆبونەوەکان ڕێکدەخرێن، دوای کۆبونەوەکە کۆمەڵێک لێکتێگەیشتن لە نێوان هەردوولادا دێتە ئاراوە.[٦] دواتر مەلا مستەفا لە ڕانیەوە پەیامێکی لە ڕێگەی عەباسی مامەند ئاغای سەرۆک

---

[١] د. راهي مزهر العامري: مسعود محمد ودوره السياسي في العراق ١٩١٩-١٩٦٨، مراجعة د. كمال مظهر احمد، بغداد، ٢٠٠٨، ص١٩٨-٢٠٣.

[٢] د. ابراهيم خليل احمد، د. جعفر عباس حمدي: المصدر السابق، ص٢٦٦.

[٣] گفتوگۆکەی ڕانیە لە ماڵی حەسەن کانەبی گولەک ئەنجامدراوە نزیک سەرای ڕانیە، لە کاتی ڕۆیشتنەوەی وەفدەکە هیلیکۆپتەری وەفدەکەی حکومەت هاوسەنگی خۆی لەدەست دەدات و پەڕەکانی دەردەچێت دواتر هێلیکۆپتەرێکی تر دێت بۆ گواستنەوەی شاندەکە. چاوپێکەوتن لەگەل ئەحمەد ئەحمەد مەولود (شەمسە): ٢٠١٦/١/٦، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٧ لە دایک بووە، لە ماوەی ١٩٦١-١٩٧٥ پێشمەرگە و پۆستەبەری شۆڕشی ئەیلول بووە لە ناوچەی ڕانیە، ئێستا خانەنشینی حکومەتە.

[٤] د. واحد عومەر محێدین: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٦-٢١٨.

[٥] ئامانج حەسەن ئەحمەد: برایم ئەحمەد ڕۆڵی لە بزافی ڕزگاریخوازی گەلی کوردا، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١٩٢-١٩٦.؛ ديفيد ادامسن: الحرب الكردية و انشقاق ١٩٦٤، ت، جرجيس فتح الله، اربيل، ٢٠١٢، ص٥٣.

[٦] علي كمال: مذكرات علي كمال عبدالرحمن، تقديم و تحقيق، جمال بابان، بغداد، ٢٠٠١، ص١٤٢-١٤٥.

هۆزی ئاکۆ ئاراستەی ئیبراهیم ئەحمەد و مام جەلال لە ماوەت دەکات، کە بچن سەردانی ڕانیە بکەن بە مەبەستی گفتوگۆ و لێکتێگەیشتن و ڕێکخستنی کۆنگرەیەکی حزبی، بۆ ئەم مەبەستە لە (١٩٦٤/٦/٢٥) ئیبراهیم ئەحمەد دەگاتە ڕانیە بەڵام کاتێک دەگات مەلا مستەفا ڕانیەی جێهێشتووە، دواتر ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی لە ترسی دەستگیرکردنیان و نەبونی متمانە دەگەڕێنەوە بۆ ماوەت و یاداشتەکانی کۆنگرەی ماوەت بڵاودەکەنەوە، لەدژی ئەم کارەش مەلا مستەفا هێزێکی سەربازی دەنێرێت بۆ ماوەت، لەگەڵ گەیشتنی هێزەکە ئیبراهیم ئەحمەد و ئەو کۆمەڵە کەسەی لەگەڵی بوون لە (١٩٦٤/٧/١٦) بێبەرگری کردن ڕوودەکەنە وڵاتی ئێران.[١]

بارزانی لە (١٩٦٤/١٠/٩) کۆنگرەیەکی فراوان لە ناوچەی ڕانیە دەبەستێت و تیایدا نوێنەرانی هەریەک لە خێڵەکانی لایەنگرانی شۆڕش و جوتیاران و حزبی شیوعی عیراق و کۆمەڵێک کەسایەتی ئاینی مەسیحی و ئاشووریەکان و نوێنەریکی تورکمانەکان و تەواوی لیژنەی ناوەندی (پدک) دا (ئەنجومەنێکی سەرکردایەتی شۆڕش) پێکدەهێنن بە نوێنەرایەتی هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگا، ئەم ئەنجومەنە لە (٦٣) کەس پێکهاتبوو، لەگەڵ ئەویشدا (ئەنجومەنێکی ڕاپەڕاندن) دروست دەکات، ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنیش هەستا بە پێکهینانی ڕێکخستنی سوپایی و کارگێڕی لە کوردستان، بۆ جێگە گرتنەوەی دەسەڵاتی یاسای ڕژێمی عیراق، جگە لەوەی ئەم کارە بوو بە هەنگاوێک لە لایەن بارزانیەوە دژ بەوانەی دەیان وت کە بارزانی کەسێکی دیکتاتۆر و خێڵەکیە.[٢] کارەکانی ئەم ئەنجومەنە هەنگاوێک بوو لە بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە باشووری کوردستان، تەکانێکی باش بوو بۆ بوارەکانی ژیان لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەستی شۆڕش، چەند دام و دەزگایەک دامەزرا بۆ بواری تەندروستی و کۆمەڵایەتی و خوێندەواری و فێرکردن و نەهێشتنی نەخوێندەواری و دامەزراندنی دادگا.[٣] دامەزراندنی ئەم ئەنجومەنە جەماوەریەی کە لە ڕانیە دامەزرا جۆرێک بوو لە خۆبەڕێوبردن لە ناوچە کوردیەکان، بۆیە بووە هۆی ناڕەزایی حکومەتی عیراق، لە (١٩٦٥/٣/٦) حکومەت ڕایگەیاند کە بە ڕێگەی سەربازی کێشەی کورد چارەسەر دەکات.[٤]

لە ڕۆژی (١٩٦٥/٣/١٤) بە فڕۆکە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بۆمباران کرد لە مانگی (١٩٦٥/٤) لیوا غانم مصباح ئەمین فەرماندەی لیوای(٢٠) حکومەتی عێراق سەردانی ڕانیەی کرد و دەستی کرد بە ترساندنی خەڵکی ناوچەکە و لە (١٩٦٥/٦/١٣) عەبدولسەلام عارف سەرۆک کۆماری عێراق بەیاوەری وەزیری ناوخۆ و بەرگری و موتەسەریفی سلێمانی، بەمەبەستی پلاندانانی جەنگ و گرتنەوەی شارۆچکەی قەڵادزێ دێن بۆ ڕانیە. لە ماڵی جێنشینی ڕانیە، میرزا ئەمین مەنگوڕی شاعیر

---

[١] د. سعد ناجي جواد: العراق و المسالة الكردية ١٩٥٨-١٩٧٠، دار سلام، لندن، ١٩٩٠، ص١١٢-١١٣.

[٢] علی سنجاری: الحركة التحرريه الكرديه- موافق واراء، مطبعة خەبات، دهوک، ١٩٩٧، ص٥٣-٥٤؛ جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی، و: کوردۆ عەلی، چ٣، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٦٢.

[٣] ڕەفیق ڕەحمان مام خول: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٤.

[٤] جەلیلی جەلیل و ئەوانی تر: شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا، و: بەهادین جەلال مستەفا، هەولێر، ٢٠١٣، ل٣٨٧-٣٨٨.

سەردانی دەکات و بە خوێندنەوەی شیعرێک داوای ئاشتی بۆ کورد و عەرەب لە عێراق دەکات،[1] عەبدولسەلام لە درێژەی کارەکانی لە ڕانیەدا، نوێژی هەینی لە مزگەوتی ڕانیە دەکات و (١٠) هەزار دیناری عێراقی دەدات بە مەلا حاجی شیواشانی وتاربێژ و خەتیبی مزگەوت بەمەبەستی نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی گەورەی ڕانیە.[2] دوای پێکدادانی کورد و سوپای عیراق، لە ژێر فشاردا مەلا مستەفا وەفدێک دەنێرێت بۆ لای باڵی ناڕازی مەکتەب سیاسی و ئەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵیان بوون تا بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، بەم داواکاریە جگە لە ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیز شەمزینی هەموویان بڕیاردەدەن بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، سەرکردە گەڕاوەکان لە ناوچەی دۆڵە ڕەقەی نزیک ڕانیە نیشتەجێ دەکرێن،[3] لە (١٩٦٥/٩/٦) سوپای عێراق هێرشێکی فراوانی تۆپ و فڕۆکە دەکاتە سەر ڕانیە، شەڕێکی گەورە لە چیای کێوەڕەش ڕوودەدات، سوپای حکومەت لە (١٠) ی ئەیلوولدا چیای کێوەڕەش داگیردەکا و هێزی پێشمەرگە ناچار بە پاشەکشە دەکات بەرەو ناوچەی پشدەر، دوای داگیرکردنی قەڵادزێش عەبدولسەلام عارف سەردانی قەڵادزێ دەکات و وتارێک دەخوێنێتەوە.[4] لە (١٩٦٦/١/٢٨) باڵی ناڕازی مەکتەبی سیاسی (پدک) نیشتەجێی دۆڵە ڕەقەی ڕۆژئاوای ڕانیە، بە نهێنی و بە هاوکاری عەباسی مامەند ئاغا هەریەک لە (جەلال تاڵەبانی و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری و حیلمی عەلی شەریف) دۆڵە ڕەقە جێدەهێڵن و خۆیان دەگەیەننە نزیک سلێمانی.[5]

لە مانگی ئازاری (١٩٦٦) مەفرەزەیەکی پێشمەرگە هێرشێکی پارتیزانی دەکەنە سەر نەخۆشخانەی کۆنی ڕانیە کە کۆمەڵێک (جاش)ی تێدا نیشتەجێ دەبێت، لە نزیک سەرچاوەی ئاوی قولەی ڕانیە، لە چالاکییەکەدا چەند کەسێکیان لێ بریندار دەکەن، حکومەت لە تۆڵەی ئەم کارە لە ژێر سەرپەرشتی لیوا غانم مصباح امین (قائد فرقە)ی (٢٠) سوپا لە چوارقورنەوە هێزێکی زۆر دەهێنێتە ناو ڕانیە و دەست دەکات بە چۆڵکردنی خانووەکانی دەوروبەری ڕوداوەکەو دەستگیرکردنی تەواوی هاوڵاتیانی گەڕەکەکە، لە دوای گەڕان و پشکنینی ناوچەکە، گڕ بەردەداتە خانوەکان بە تەواوی کەلوپەلەکانی ناویانەوە، کە ژمارەیان (٣٠) خانوو دەبێت، کۆمەڵێک لە دانیشتوانی گەڕەکەکان دەستگیردەکات و ڕەوانەی کەرکوکیان دەکات، دواتریش لە شەودا دەست دەکات بە بۆردومانی

---

[1] میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: بەسەرهاتی سیاسی کورد(١٩٥٨/٧/١٤-١٩٨٥)، ل١٠٩، ١١١، ١١٩، ١٧٨.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدولقادر مەلا حاجی شیواشانی، ٢٠١٦/٤/٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ ڕانیەیە و بەکالۆریۆسی هەیە لە شەریعە و لە ئێستادا پیشەی ئیمام و خەتیبی مزگەوتە لە شارەدێی حاجیاوا.

[3] نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن (دیوی ناوەوەی ڕوداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣)، چ٢، ١٩٩٨، ل٨٩.

[4] مەسعود بارزانی: بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل٢٠٣-٢٠٤.

[5] ئامانج حەسەن ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٢.؛ د. حوسێن محەمەد عەزیز: پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەد، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٦١.

گەڕەکەکە و کەسێک بەناوی (ئەحمەد مامە) شەهید دەکات، ئەم گەڕەکە لەم کاتەوە تا ئیستا بە گەڕەکە سووتاوەکەی ڕانیە بەناوبانگە.[١]

لە نیسانی (١٩٦٦) عەبدولسەلام عارف لە ناو فڕۆکەیەکی هیلیکۆپتەر گیانی لە دەستدا و دواتر عەبدولرەحمان عارفی برای جێگەی دەگرێتەوە دەبێت بە سەرۆک کۆماری عیراق، بە هۆی هاندانی ئەفسەرە سەربازییەکانەوە، گفتوگۆ لەگەڵ کورد رەتدەکاتەوە، بڕیاردەدات هێرشێکی فراونی سەربازی بکاتە سەر ناوچە کوردییەکان، لە بەهاری (١٩٦٦) دا شەڕ و پەلامار دەست پێدەکاتەوە،[٢] هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی ئەو پلانەی کە عەبدولسەلام دایڕشتبوو بەناوی پلانی (توكلت على الله)، دووبارە شەڕ دەستپێدەکاتەوە و سوپای عیراق زیانێکی زۆری بەردەکەوێت،[٣] عەبدولرەحمان بەزاز سەرۆک وەزیرانی عیراق یەکلایەنە داوای ئاشتی لە مەلا مستەفا دەکات و لە (١٩٦٦/٩/٢٩) ڕێککەوتن لە نێوان بارزانی و عارف ئەنجامدرا[٤]. لە دوای ئەم ڕێککەوتنە دۆخێکی نەشەڕ نە ئاشتی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشا، باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی (جەلالی) پەیوەندیان بە حکومەتەوە کرد، شەڕو پێکدادانی نێوان باڵی جەلالی (جەلال تاڵەبانی) و مەلا یی (مەلا مستەفا بارزانی) زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دەگرێتەوە،[٥] رائید محەمەد ئەمین فەرەج لێپرسراوی هێزی کاوە لە باڵی (پدک) مەلایی و ئەحمەد محەمەدئەمین دزەیی لێپرسراوی بەتالیۆنی هێزی پێشمەرگە دەچن بۆ ڕانیە و پەیوەندی بە سوپای عیراقەوە دەکەن،[٦] ناوچەی ڕانیە دەبێت بە بەشێک لە ململانێی نێوان (جەلالی) و (مەلایی) بەشێکش لەو پێشمەرگانەی خەڵکی ڕانیە کە ژمارەیان نزیکی (٣٠) پێشمەرگە دەبێت لە ناو ڕیزەکانی (پدک) مەلا یی ڕانیە جێدەهێڵن و ڕوودەکەنە بەکرەجۆی نزیک سلێمانی، پەیوەندی بە باڵی جەلالیەوە دەکەن، ئەم دۆخە تا ساڵی (١٩٦٨) بەردەوام دەبێت،[٧] کە زیانێکی زۆری‌بە بزاڤی ڕزگاریخوازیی کورد لە باشووردا گەیاند و پێویستی بە خوێندنەوەیەکی جدییانەی نوێی زانستی هەیە.

لە ساڵی (١٩٦٨) بەعسیەکان کودەتا بەسەر عەبدولرەحمان عارفدا دەکەن و (ئەحمەد حەسەن بەکر) دەکەن بە سەرۆک کۆمار و ڕاستەوخۆ بەیاننامەی ئاشتی بۆ کورد ڕادەگێن و چەند وەزارەتێک دەدەن بە کورد لە هەردوو باڵی جەلالی و مەلایی، لەگەڵ ناساندنی جەژنی نەورۆز و

---

[١] قادر ئیسماعیل ئیبراهیم: ناوی گەڕەکە سووتاوەکەی ڕانیە لە چیەوە هاتووە، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(٢١)، هاوینی٢٠٠٧، ل٧.

[٢] د. عبدالفتاح علي يحيي البوتاني: وثائق الحركة القومية الكردية التحررية، مطبعة وزاره التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص٣٨١.

[٣] مەسعود بارزانی: بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ٢١٣-٢٢٢.

[٤] د. سعد ناجي جواد: المصدر السابق، ص١٢٨-١٣٠.

[٥] ئیبراهیم جەلال: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢-٢٢٣.

[٦] على سنجاري: حقيقة مسير ثورة ١١ ايلول ١٩٦١، مطبعة خاني، دهوک، ٢٠١٣، ص٩٤-٩٥.

[٧] چاوپێکەوتن لەگەل محێدین جەلیل ئەحمەد: ٢٠١٦/١/٥، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٥ لە ڕانیە لە دایک بووە، لە ١٩٦١ بۆتە پێشمەرگە و بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی کردووە، لە ساڵی ١٩٦٦ چۆتە ناو باڵی جەلالی و تا ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵیاندا بووە، دواتر وازی هێناوە و دوکانی خواردنگەی داناوەو بە پیشەی کەبابچەیەتیەوە خەریک بووە.

کردنەوەی زانکۆی سلێمانی و چەندین کاری تر، بەڵام دواتر مەلا مستەفا بەهۆی مامەڵەی حکومەت لەگەڵ جەلالیەکان وەزیرەکانی خۆی دەکێشێتەوە و پەیوەندیی نێوان بەعس و مەلا مستەفا بەرەو تێکچوون دەچێت.[١] حکومەتی بەعسیش سوودی لە ناکۆکی ناوخۆی (پدک) وەردەگرێت و بە چەک و پارە هاوکاری جەلالیەکان دەکات،[٢] لە مانگی (١٩٦٨/١١) حکومەتی بەعس بە هاوکاری باڵی مەکتەبی سیاسی دەست دەکات بە هێرش بۆ سەر ناوچە کوردیەکان، قوناغێکی تری شەڕ دەستی پێدەکاتەوە،[٣] لەساڵی (١٩٦٩) هێرشێکی فراوان دەکاتە سەر کۆیە و ڕانیە و قەڵادزێ،[٤] دواتر لە چیای کێوەڕەش(ڕانیە) پێشمەرگە تێکدەشکێت.[٥] لە مانگی (١٩٦٩/١٠) دەست بەسەر ڕانیەو قەڵادزێدا دەگرێت، گرتنی ڕانیە و قەڵادزێ زیانی زۆری بە باڵی مەلایی دەگەیێنێت و باڵی مەکتەبی سیاسی (جەلالی) دەکرێنە لێپرسراوی ئیدارەی ناوچەکان.[٦]

لە ماوەی ساڵی (١٩٦٨-١٩٧٠) شەڕ و پێکدادانی نێوان هێزی پێشمەرگەو حکومەتی بەعس بەردەوام بوو، حکومەتی عیراق کەوتبۆناو قەیرانێکی دارایی گەورەوەو دوچاری قەرزێکی زۆر ببوو، تێچووی شەڕ گەیشتبووە چەندان ملیۆن دینار، جگە لە زیانی گیانی گەورە، ماڵویرانی و کاولکاری، ئەمە بووە هۆکارێک بۆ ئەوەی حکومەت بیر لە دانوستاندن و گفتوگۆ بکاتەوە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی باڵی مەلایی، بە ئاگاداری و هاوکاری یەکێتی سۆڤیەت گفتوگۆ لە نێوان هەردوولا ڕوویدا و لە کۆتاییدا بەیاننامەی (١٩٧٠/٣/١١) [٧] لێکەوتەوە،[٨] لە دوای بەیاننامەی (١٩٧٠/٣/١١ تا ١٩٧٤/٣/١١) شاری ڕانیە کەوتە ناو ئەو بەڕێوبردنە کارگێڕییەی خۆجێیە کوردییە، کە لە ئەنجامی ڕێککەوتنەکە بە دەستی هێنا بوو.[٩] لێرەوە دەتوانرێت بوترێت ڕوشی سیاسی ڕانیە لە نێوان ساڵانی (١٩٥٨ – ١٩٧٠) دا نا ئارام بووە، بەهۆی ململانێی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و حکومەتە جیاوازەکانی عێراق لە لایەک و ململانێی باڵە جیاوازەکانی (پدک) لە لایەکی دیکەوە.

---

[١] جەمال نەبەز: سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٨-١٩٠.

[٢] نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل٩٧.

[٣] هاوکار کەریم حەمە شەریف: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.

[٤] محەمەد مەلا قادر: سەربردە، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٨٤.

[٥] مەسعود بارزانی: بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١-١٩٧٥، بەرگی سێیەم، بەشی دووەم، ل١٣.

[٦] د. عبدالستار تاهر شەریف: ململانێ لەگەڵ ژیاندا ١٩٣٥-١٩٧١، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوک، ٢٠٠٥، ل١٣٦-١٣٧.

[٧] بۆ زانیاری لەسەر ناوەڕۆکی دەقی بەیاننامەی ١١ ئازاری ١٩٧٠ بڕوانە: سعد البزاز: الاكراد فی المسالة العراقية، عمان، ١٩٩٧، ص١٥١-١٦١.

[٨] هاوکار کەریم حەمە شەریف: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠١.

[٩] بۆ زانیاری لەسەر بارودۆخی سیاسی کوردستان لەماوەی ١٩٧٠/٣/١١ تا ١٩٧٤/٣/١١. بڕوانە: فەرەیدون عبدولڕەحیم عبدلله: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق(١٩٧٠/٣/١١ تا ١٩٧٤/٣/١١)، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٨.

## باسی سێیەم/ دۆخی سیاسی ڕانیە لە ماوەی ساڵانی لە (١٩٧٤/٣/١١ – ١٩٩١/٣/٥)

**تەوەرەی یەکەم: ڕانیە لەکاتی هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و دوای هەرەسی شۆڕش، دواتر کاریگەری ڕوداوە سیاسیەکان لە سەری**

**١- کاریگەری هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر ڕانیە.**

لە ساڵی (١٩٧٠) لە ئەنجامی ڕێککەوتنێک لە نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عیراق، بەیاننامەی (١٩٧٠/٣/١١) هاتە بەرهەم، کە تیایدا مافی ئۆتۆنۆمی درا بە ناوچە کوردیەکانی عیراق، لەگەڵ کۆمەڵێک مافی تایبەت، کە دەسکەوتی باشی بۆ گەلی کورد لە عیراق تیدا بوو، بەڵام دواتر ئەم بەیاننامە لە ساڵی (١٩٧٤) کێشەی تێکەوت و حکومەتی عێراق تاک لایەنانە یاسای ژمارە (٣٣)ی دەرکرد، کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە برگەکانی بەیاننامەی (١٩٧٠) دا کرد و هەولێری کردە ناوەندی ئیدارەی ئۆتۆنۆمی، بە پێی مادە (١٠) ئەنجوومەنێکی یاسادانان و جێبەجێکردن دروستکرا بۆ بەڕێوبردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان.[1] مەلا مستەفا وەک سەرکردەی یەکەمی کورد لە باشوری کوردستان ئەو یاسا تازەی ڕەتکردەوە و ئۆتۆنۆمی لەسەر بنچینەی فیدراڵی پێشکەش بەحکومەت کرد، ئەم ئۆتۆنۆمیەش هەموو ئەو پارێزگایانە بگرێتەوە، کە زۆرینەی دانیشتوانەکانی کوردن، شاری کەرکوکیش وەک پایتەختی ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمیە دیاریبکرێت، ئەم پێشنیارانە بە توندی لە لایەن دەسەڵاتی بەعس رەتکرانەوە، دوای ناردنی چەند شاندێکی کوردی بۆ بەغدا و گفتوگۆکردن، دانوستانەکان بێئەنجام مانەوە و هیچ ئاکامێکیان نەبوو. بۆیە قوناغێکی تری شەڕ لە نێوان حکومەتی بەعس و کورد دەستپێکردەوە، کە بە شەڕی یەک ساڵە (١٩٧٤-١٩٧٥) ناسراوە، کوردەکان پشتێنەیەکی بەرگریان لە زاخۆوە بۆ دەربەندیخان پێکهێنا، بە مەبەستی بەرگریکردن لە ناوچە کوردییەکان،[2] حکومەتی بەعس هێرشەکانی لە کەرکووکەوە دەستپێکرد، پەیوەست بێت بە ڕانیەوە لە رۆژی (١٩٧٤/٤/٧) سوپای عیراق بە پشتیوانی تانک، تۆپ و زرێپوش و فڕۆکە بە دوو ئاراستەوە بەرەو ڕانیە هات، ئاراستەی یەکەم، سلێمانی- ڕانیە، ئاراستەی دووەم، کەرکووک- کۆیە- ڕانیە.[3]

ئاگری شەڕ زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، لە مانگی نیسانی (١٩٧٤) دوای ئەوەی شەڕی سپیلک دەستپێکرد، پارێزگاری سلێمانی، سلێمانی جێهێشت، دواتریش مامۆستایان و خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی بەرەو ئەو ناوچانەی ڕۆیشتن، کە لەژێر دەستی پێشمەرگەدا بوو،

---

[1] المرسوم الجمهوري الرقم: (٢٨٨)، الوقائع العراقية العدد(١٨٦٣)، في ١٩٧٠/٤/٤؛ المرسوم الجمهوري الرقم: (٣٣)، المصدر السابق.

[2] دیڤد مەکداول: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤٨-٥٥٣.

[3] ئیبراهیم جەلال: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٩.

ماوەیەکش لە ڕانیەو گوندی بۆسکینی نزیک ڕانیە مانەوە،[١] دواتر لە ڕێگەی ڕانیەوە بەرەو قەڵادزێ ڕۆیشتن و لەوێ دەستیان بە دامەزراندنەوەی زانکۆی سلێمانی کردەوە و بەردەوامیان بە خوێندندا تا تێکچوونی دۆخی سیاسی وداگیرکردنی قەڵادزێ لە لایەن سوپاوە.[٢]

لەماوەی هێرشەکانی سوپای عیراق ڕانیە ببوو بە پەناگە و شوێنی کۆبونەوەی هەموو ئەو هاوڵاتیانەی، کە لە ناوچەکانی گەرمیان و سلێمانیەوە هاتبوون، بەلێشاو هاوڵاتی ئاوارە ڕوویان کردۆتە ناوچەکە، ئاپۆرای جەماوەر کۆڵان و گەڕەکەکانی ناو ڕانیەی تەنیوە و شەقامەکان بەهۆی قەرەباڵغیەوە جوڵەیان تێدا ئەستەم بووە، پەیامنێرە تەلەفزیونیەکان و ڕۆژنامەنووسە جیهانییەکان لە ڕانیەوە ڕوداوی کۆڕەویان بڵاوکردۆتەوە، هەتا تەلەفزیونە عەرەبیەکانیش بەشداری گواستنەوەی هەواڵەکانیان کردووە. لە ڕانیەوە خەڵک بە دوو شێوە کۆچی کردووە بۆ ناوچە سنوریەکان، ڕێگەی ئۆتۆمبیل بەرەو شەقڵاوە وحاجی هۆمەران، ڕێگەیەکی تر بەرەو قەڵادزێ و ناوچەکانی پشدەر.[٣]

سوپای عیراق دوای گرتنی کۆیە هەوڵی داوە قەڵادزێ و ڕانیە داگیربکات، بەتانک و تۆپ و فڕۆکە ڕوویکردۆتە هەیبەت سوڵتان و داگیری کردووە، دواتر بەرەو گوندەکانی (هیزۆپ، بێستانە، سکتان) پێشڕەوی کردووە، هێزەکانی پێشمەرگە بەسەرکردایەتی (عەلی شەعبان)، کە فەرماندەی بەتالیۆنی بێتواتە بووە بەرگرییەکی بە هێزیان کردوە، سوپای عیراقیان ناچار بە پاشەکشەکردووە،[٤] بەڵام دواتر سوپای عێراق هێرشەکانی چڕترکردووە و بە تۆپ و فڕۆکە هێرشی کردۆتە سەرچیای ماکۆک و خەڵکێکی زۆری ڕانیە بەرەو دۆڵی (شاور- ئاکۆ) ڕایانکردووە، هێزی پێشمەرگەش بەردەوام بوو لە ڕاگرتنی پێشڕەوی سوپای عیراق و لە دەوروبەری ڕانیەوە بەرگرییەکی توندی کردوە.[٥]

لە (٢-١٩٧٤/٦/٤) فڕۆکەکانی سوپای عیراق ناو شاری ڕانیەیان بۆمباران کردوە، کە لە ئەنجامی ئەم بۆردومانە چەندین کەس کوژرا و بریندار بوون، لەوانە (خدر ڕەشید شەریف، حاجی مارف)، منداڵێکی بچوکیش لەلای کانی مەلا سلێمانی ناوبازاڕ گیانی لەدەستداوە، بەشێکی ئەو بریندارانەی ڕانیە ڕەوانەی شاری سەردەشتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کراون و لەوێش چەند

---

[١] فەقێ بابەکر بۆسکێنی: گەشتێک بە ناو مێژوودا، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٤، ل١٧٧.

[٢] زەنوون پیریادی: زانکۆی سلێمانی لە قەلادزێ و بیرەوەریەکانی پێشمەرگایەتی شۆڕشی کوردستان لە١٩٧٤، هەولێر، ٢٠١٣، ل٣٦ -٤٠.

[٣] کاکە مەم بۆتانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٢-١٧٣.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد عەلی ئیسماعیل: ٢٠١٦/١/٢٧ ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٤٩ لە بنگرد لە دایک بووە، لە ساڵی ١٩٦٥ بۆتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەندام و کارگێڕی لیژنەی ناوچەی (پدک) بووە لە ڕانیە لە ماوەی سالانی ١٩٧٤-١٩٧٥، ئێستا کارگێڕی لقی ١١ (پدک) لە ڕانیە.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد عەلی سابیر: ٢٠١٦/١/١٧، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٤٧ لە مەرگە لە دایک بووە، بووە، لە ساڵی ١٩٦٥ بۆتە ئەندامی (پدک) ، لە ماوەی سالانی ١٩٦٥-١٩٧٥ پێشمەرگە بووە، ئێستا خانەنشینی پێشمەرگەیە.

کەسێکیان بەهۆی زۆری برینەکانیانەوە گیانیان لە دەستداوە، ئەم بۆردومانە جگە لە زیانی گیانی، زیانێکی زۆری مادیشی بەدوای خۆیدا هێناوە، بەشێک لە خانووەکانی ناو ڕانیە بە هۆی ئەم بۆردومانەوە ڕوخاون و تێکچوون، بۆ ڕۆژانی دواتریش بۆردومانی فڕۆکەکان درێژەی هەبووە، لە بناری حاجیلەی دەروازەی ڕانیە فڕۆکەکانی سوپای عیراق کەوتونە بۆردومانی هەڕەمەکی هاوڵاتیان و کەسێکیان کوشتووە، کە پیشەی گاوانی بووە لەگەڵ لەناو چوونی چەندین سەرئاژەڵی مەڕو بزن. بۆردومانی فڕۆکە بۆ سەر ڕانیە درێژەی هەبووە بۆ چەند ڕۆژێک دواتر جارێکی تر سوپای عیراق دەستیان بە تۆپبارانی ڕانیە کردۆتەوە و کەسێکیان بەناوی(حاجی عەبدوڵلا پەتک) کوشتووە[١].

پێشتر حکومەتی عیراق توانی بووی لە (١٩٧٤/٧/٢٢) شاری سلێمانی و ڕواندز داگیربکات و هێرشەکانی بەرەو داگیرکردنی تەواوی ناوچەکان بەردەوام بوو،[٢] لەدوای گرتنی شارەدێی چوارقورنەی نزیک ڕانیە، هێزی پێشمەرگە چەند بەرەیەکی بەرگری لە ڕانیە دەکاتەوە وەک بەرەی (چیای کێوەڕەش، بەرەی چیای ماکۆک، بەرەی دۆڵی شاور- ئاکۆ).[٣] هێزیکی پێشمەرگەش لە پشت گوندی هەنجیرە لە چیای کێوەڕەش خۆی جێگیر دەکات بە مەبەستی بەرگریکردن لە داگیرکردنی ڕانیە، دواتر سوپا ڕاستەوخۆ بەرەو ڕانیە دەچێت و دەستدەکات بە تۆپبارانکردنی چیای کێوەڕەش و[٤] لە (١٩٧٤/٨/٧) دەچێتە ناو ڕانیە بۆ ڕۆژێک دواتر شەڕێکی گەورە لە نێوان سوپاو پێشمەرگە لە چیای حاجیلە و کێوەڕەش ڕوودەدات، لەم شەڕانەدا سوپا عێراق سەرکەوتوو دەبێت و بەتەواوی دەستدەگرێت بەسەر شارۆچکەکەدا،[٥] لە کلکەی کۆڵینی دەروازەی ڕانیە سەربازگەیەک هێزی بێتواتەش بەسەرکردایەتی (ڕەشید سندی)، کە سەرپەرشتیاری هێزی پێشمەرگەی کردووە لە ناوچەی ڕانیە لە گوندی پڵنگانی ڕۆژئاوای ڕانیە خۆی جێگیردەکات، بەتالیۆنی شاور کەسەر بە هێزی بێتواتە بووە لە گوندی پاشقوتەڵی دوڵی شاور-ئاکۆ بە تۆپ بۆردومانی سوپای عیراق دەکات لە ناوچەکە.[٦]

دوای گرتنی چیای کێوەڕەش سوپای عیراق بەرەو ناوچەی سەرکەپکان و دوڵی شاور-ئاکۆ دەچێت و دوو سەربازگە لە سەرکەپکان و دیرێ دروستدەکات ودەڕوات تا گوندی بەردانگە. هێزی پێشمەرگە لە دوای گرتنی ڕانیە سەرجەم بارەگاکانیان دەگوازنەوە بۆ دۆڵی شاور- ئاکۆ و چیاکانی دەوروبەری ڕانیە، بەشێکی زۆری هێزی پێشمەرگە لە ناو گوندەکان بڵاودەبنەوە، بەرەنگاری سوپای عیراق دەکەن، سوپای عیراقیش بەردەوام بە تۆپ و فڕۆکە بۆردومانی ناوچەکە دەکات، تۆپخانەکانی پێشمەرگە زۆر بەهێز بەرگری دەکەن و سەربازگەکانی سوپای عێراق تەواو وێراندەکەن، پێشمەرگە

---

[١] حبیبە عەزیز بابان: بۆردومانە خوێناویەکەی ١٩٧٤ی ڕانیە، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(١١)، ئازاری ٢٠٠٥، ل١٦-١٧.

[٢] ئیبراهیم جەلال: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٩.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد عەلی ئیسماعیل، ٢٠١٦/١/٢٧.

[٤] توفیق مەلا سدیق: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨-١٠٩.

[٥] فەقێ بابەکر بۆسکێنی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٩.

[٦] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد عەلی سابیر، ٢٠١٦/١/١٧.

بە تۆپ و هاوەن زیانێکی گەورە بە سوپای عیراق دەگەیەنن، چەند هێلیکۆپتەرێک دەپیکن و دەخەنە خوارەوە، سەربازێکی زۆر بەهۆی نەشارەزایەوە لە ناوچەکە دەکوژرێن و بریندار دەبن، تا کۆتایی ساڵی (١٩٧٤) شەڕ لە ناوچەی ڕانیە درێژە دەکێشێت و بەرگری لە چیای ماکۆک و دەوروبەری ڕانیە تا مانگی ١٩٧٥/٣بەردەوام دەبێت.[١] لە (١٩٧٥/٣/٦) ڕێککەوتنێک لە نێوان عیراق و ئێران لە جەزائیر دەبەستریێت، کە بە ڕێککەوتنامەی جەزائیر ناسراوە،[٢] بەشێکی ڕێککەوتنەکە تایبەت بوو بە کێشەی سنووری نێوان عیراق و ئێران و چارەسەری کێشەکانی نێوانیان، ئەم ڕێککەوتنە کاریگەری خراپی لەسەر پرسی کوردو هاوکاریەکانی ئێران دەبێت بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشوری کوردستان.[٣] لەدوای ڕێککەوتنەکە مستەفا بارزانی وەک کەسی یەکەمی شۆڕشی کورد سەردانی ئێران دەکات و چاوی بە شا دەکەوێت، سێ هەڵبژاردن ئەدات بە مەلا مستەفا (خوبەدەستەوەدان بە عێراق، درێژەدان بە شورش بەبێ هاوکاری ئێران، هێنانی خەڵکەکەی بۆ ئێران) دوای گفتوگۆ کردن و ڕاویژکردن مەلا  مستەفا بڕیاری چەک دانان دەدات، لە (١٩٧٥/٣/٢٠) برووسکە بۆ هەموو هێزە چەکدارەکان دەنێرێ، کە چەکەکانیان دابنێن و واز لە شەڕبهێنن، لە (١٩-١٩٧٥/٣/٢٦) کۆتایی بە شۆڕش هات[٤]، حکومەتی عێراق بڕیارێکی لیبوردنی گشتی دەردەکات، بۆ ئەو کەسانەی کوردستانیان جێهێشتووە، یان وەک پێشمەرگە بەشداری شۆڕشیان کردووە، بەو هۆیەوە خەڵکێکی زۆر دەگەڕێنەوە ڕانیە، لە دەروازەی ڕانیە نزیک وێستگەی سووتەمەنی هاوڵاتیانیان ناونوس دەکرد و کەمێک خۆراکیان پێدەدان،[٥] بەشێک لەو پێشمەرگانەی کە بەهۆی لێبوردنی گشتی خۆیان بەدەستەوە دابوو گەڕابوونەوە ڕانیە، لە لایەن حکومەتەوە بەبیانووی دامەزراندنەوە دوورخرانەوە بۆ باشووری عیراق.[٦] لەماوەی شەڕەکانی (١٩٧٤-١٩٧٥) خەڵکێکی زۆری ناوچەی ڕانیە بەتایبەت دانیشتوانی گوندەکان ئاوارەی ئێران دەبن و لە ئۆردوگای شێر و خورشیدی سوور نیشتەجێدەبن.[٧]

**٢- ڕووداوەکانی نێوان (١٩٧٥-١٩٩١) و کاریگەریان لەسەر ناوچەکە.**

هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول لە ڕووی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە زیانی زۆری بەکورد گەیاند و کاریگەری خراپی کردە سەر باشووری کوردستان، هەر لە سەرەتاوە بەعس دەستی کرد بە سیاسەتی چەکداماڵینی کورد و ڕایانگەیاند چەک بە هەر کەسێکەوە ببینرێ لە سێدارە

---

[١] رائد خدر دەبباغ: بیرەوەریەکانم و توپخانەی شۆڕشی ئەیلولی مەزن، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٩٢-٩٩.

[٢] بۆزانیاری زیاتر. بروانە: کامەران بابان زادە: ڕێکەوتننامەی جەزائیر و ڕەهەندەکانی لەسەر کێشەی کورد لە باشوری کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٣.

[٣] هەمان سەرچاوە، ل٤٠٠-٤٠١.

[٤] نەوشیروان مستەفا ئەمین: لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ ، ل٢٩-٣١.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد عەلی ئیسماعیل،٢٠١٦/١/٢٧.

[٦] توفیق مەلا سدیق: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩.

[٧] کریس کۆچێرا: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩٦.

دەدرێت، وەک جۆرێک لە شێوازی ترساندن و دەستەمۆکردنی تاکی کورد، دواتر هەر لە ساڵی(١٩٧٥)دا بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژاو کەوتە جێبەجێکردنی سیاسەتی ڕاگواستن،[١] بەسوود وەرگرتن لە ئەزمون و دەسەڵاتی ڕژێمە تۆتالیتارە جیهانیەکان، ڕایگەیاند کە مەبەستی لەم کارە بەهێزکردنی کارە ئیدارییەکانە و بۆ باشتر کردنی دۆخی ژیانی کوردە، ناویشی لەم شوێنانە نابوو گوندی هاوچەرخ کە لە لای کورد بە ئۆردوگای زۆرە ملێ ناسرابوون.[٢]

لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٩) بە ناوی پرۆسەی ڕاگواستنەوە چەندین گوند وێرانکران،[٣] سێ جۆر ڕاگواستن هەبووە (ڕاگواستنی ناوچە سنووریەکان، نەوتیەکان، ستراتیژەکان بەمەبەستی بەرگریکردن)،[٤] لەگەڵ ڕاگواستنی ناوچە سنووریەکان، لە ناوچەی ڕانیە چەند ئۆردوگایەک دروستکران، وەک ئۆردوگای ڕانیە و ئۆردوگای چوارقوڕنە لە شارەدێی چوارقوڕنەی سەر بە ڕانیە.[٥] لە ساڵی (١٩٧٧) لە شارەدێی ناودەشت (٢٦) گوندی بەرەو شاری ڕانیەو هەولێر ڕاگواست، لە ساڵی (١٩٧٨) دا (١٣) گوندی تریشی لە هەمان شارەدێ بەرەو ڕانیە ڕاگواست،[٦] هەر لە ساڵی (١٩٧٨) ئۆردوگای (چوکە-کۆمتان) کە ژمارەیان لە (١٢٨٣) خێزان و (٦٦٠٢) کەس پێکهاتبوو، بۆجاری دووەم بەرەو سنووری ڕانیە ڕاگواست و لە ئۆردوگای ڕانیە نیشتەجێکران.[٧] هەڵمەتی ڕاگواستن و خاپورکردنی گوندەکان بەردەوام بوو، لە ساڵی (١٩٨٥) لە سنووری ڕانیە (١٨) گوندی تر خاپوورکران و دواتریش چەند گوندێکی تری لە سنورەکە راگواست.[٨] لە ساڵی (١٩٨٨) ئۆردوگای زۆرەملێی حاجیاوا لە نزیک ڕانیە دروستکرا کە ئێستا شارەدێیەو سەر بە ڕانیەیە، خەڵکی ناوچەکانی پشدەر، مەرگە، بناری کۆسرەت و دۆڵی خەلەکانی تێدا نیشتەجێکران،[٩] لە ساڵی (١٩٨٩) شارۆچکەی

---

[١] سەلام عەبدولکەریم: ژیانی سیاسی لە باشوری کوردستان ١٩٧٥-١٩٩١ سەرهەڵدانی ڕەوتی سۆسیالستی و دروستبونی حزبی سۆسیالستی کوردستان، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١١، ل٣١-٣٣.

[٢] سۆزان کەریم مستەفا: بەعسیزم و کورد(١٩٤٧-١٩٧٥)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٢٣٤.

[٣] نەجمەدین فەقێ عەبدوڵلا: تاوانێکی لە بیرکراو دەربارەی ئەنفال و تاوەنەکانی جینۆساید لە کوردستان، و: عادل عەلی، بلاوکراوەی ئەکادیمیای هۆشیاری و پیگەیاندنی کادیران، سلێمانی، ٢٠١٤، ل ٨.

[٤] فەرمان عبدالرحمن: پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد لە عێراقدا، بلاوکراوەی بیرو هۆشیاری(ی.ن.ک)، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١١٥.

[٥] ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بە عسیان، تەرحیل، تەعریب، تەبعیس، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٩٩.

[٦] مراد حەکیم محەمەد: ئاکامە کۆمەلایەتیەکانی ڕاگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعس، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٣١-١٣٢.

[٧] عومەر هەمزە سالح: ڕاگواستن (لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافی و مێژووی ڕاگواستنی زۆرەملێی گوندنشینەکانی کوردستانە-پشدەر وەک نمونە)، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٩، ل١٧٦.

[٨] مراد حەکیم محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨، ١٥٥.

[٩] قادر ئەحمەد بابەکر: شاروچکەی حاجیاوا (١٩٨٨-٢٠١٠)، پێداچونەوەی ڕەسوڵ ئیبراهیم ڕەسوڵ، قادر محەمەد، ئومێد ئیبراهیم، سلێمانی، ٢٠١٢، ل٧.

قەڵادزێ بەتەواوی شارەدێکانی و گوندو ئۆردوگا زۆرەملێکانیەو ڕاگوێزران.[1] لەماوەی شاڵاوەکانی ئەنفال و کیمیاباران لە ماوەی ساڵی (١٩٧٨-١٩٨٨) بە شارۆچکەی ڕانیە و شارەدێی چوارقورنە (٣٥) هاوڵاتی بە ژەهری کیمیایی کوژران،[2] بەشێک لەو گوندانەی ڕاگوازرابوون لە ئوردوگا زۆرەملێکانی ڕانیە و سنوری ڕانیە جێگیرکرابوون، پێشتر لەکاتی ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال، خەلک و ناوچەکانیان کەوتبوون بەر شاڵاوەکان.[3]

لە دوای هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول، دۆخێکی ئاڵۆز و دژوار باشووری کوردستانی دەگرێتەوە، لەکۆتایی (١٩٧٥) یاخیبوونی چەکداری لە بناری قەندیل سەرهەڵدەدا و لە (٢٥-١٩٧٦/٥/٢٦) لە ناوچەی حاجی ئۆمەران چەند شەڕێک لەگەڵ سوپای عیراق ڕوودەدات و دەبێتە سەرەتایەک بۆ دەستپێکردنەوەی شۆڕش.[4] لە (١٩٧٦/٦/١) (ینک)[5] بەبۆنەی ساڵێک بەسەر دامەزراندنیەوە یەکەمین دەستەی چەکداری خۆی لە سوریاوە ناردەوە ناو کوردستان،[6] دوابەدوای ئەوە (پدک)یش لە ژێر ناوی سەرکردایەتی کاتیەوە دەستی بە خەباتی چەکداری کردەوە.[7] لە هاوینی (١٩٧٦) لە ناوچەکانی ڕانیە، هەندێک شوێنی تر پێشمەرگە دەستی بە جموجۆڵ و چالاکی کردەوە، ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە بە ناو گوندەکاندا بڵاو بونەوە،[8] لەگەڵ دەسپێکردنەوەی شۆڕش لە(١٩٧٦/٩/١٠) هێزێک لە ژێر سەرکردایەتی بایز عەباس ئاکۆ لە ڕانیە بە (٦٠) کەسەوە پەیوەندیان بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردوە، لە یەکەم چالاکیاندا هێرشیان کردۆتە سەر گازینۆی ڕانیە، لەم چالاکیەدا کوژراوێکیان بەناوی (سلێمان ڕەسوڵ سلێمان) داوە، ئەم هێزە دواتر بە ناوی هێزی (١٤)ی ئاکۆ ناسرا و بەردەوامبوون لە چالاکی و ناردنی مەفرەزە بۆ ناو ڕانیە و

---

[1] مراد حەکیم محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤-١٥٥.

[2] جاسم محەمەد محەمەد عەلی: ڕۆڵی هۆکارە سیاسیەکان لە دابەشبونی دانیشتوانی پارێزگای سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٢٢٢.

[3] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: یوسف دزەیی: ئەنفال، کارەسات، ئەنجام و ڕەهەندەکانی، هەولێر، ٢٠٠١.

[4] جمال فتح الله طیب: بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشوری کوردستان(١٩٧٥/٣/٢١-١٩٨٠/١١/٢٨)، نامەی دکتورا(بلاونەکراوە)، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٩، ل٦٥-٦٦.

[5] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر دامەزراندن و ڕاگەیاندنی ئەم حزبە بڕوانە: د. سەروەر عەبدولرەحمان عومەر: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان(١٩٧٥-١٩٧٦)، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی هێڤی، هەولێر، ٢٠١١.

[6] هەمان سەرچاوە، ل١٩٩.

[7] کریس کۆچیرا: بزوتنەوەی نەتەوەی کورد و ویستی سەربەخۆی، و:حەسەن ڕەستگار، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣، ل٦٠-٦١؛ فاتح ڕەسول، بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستان، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٣٥٦.

[8] عەلی تەتەر نێروەی: بزافی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە کوردستانی عێراق لە ساڵەکانی جەنگی عێراق و ئێراندا (١٩٨٠-١٩٨٨)، پێداچونەوە و پێشەکی د. عەبدولفەتاح بۆتانی، چاپخانەی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٨٥.

دەوروبەری.[١] دواتر ڕێکخستنەکانی (ینک) دەستیان بەکار و چالاکی کرد لە ناو ڕانیە و ڕێکخستنی (تیشک) و ڕێکخراوی (کێوەڕەش) یان دامەزراند، کە لە لایەن (عمر حەمەد بەگ و عەلی حەسیر، سەید مستەفا و مام ڕەسول ناسراو بەڕەسوە شەل) سەرپەرشتی دەکران، ئەم ڕێکخستنانە سەر بەباڵی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان(ینک) بوون، دواتر کۆمەڵێک هاووڵاتی ناو شارۆچکەی ڕانیە لە ڕێگەی (عەزیز بەگ)ەوە پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکەن لە شاخ و چەند کەرت و تیپێک لە خەڵکی ناوچەکە دادەمەزرێنن وەک هەرێمی (١٤) کە لە پێنج کەرت پێکدەهات، لە لایەن (سوارە عەباس مەمەند) سەرپەرشتی دەکرا، تیپی (٩٩)ی بیتوێن، کە (غەریب عەسکەری) سەرپەرشتی کردووە.[٢]

لە دوای ڕاگەیاندنی سەرکردایەتی کاتی لە لایەن (پدک)ەوە، ڕێکخستنەکانی (پدک)یش لە ناوچەی مەرگە دەستیان بەکاری ڕێکخستن کردەوە و لە ڕانیە و چوارقوڕنەو بناری کۆسرەت و پشدەرەوە ژمارەیەک لە هاولاتیان پەیوەندییان پێوەکردن، کە بەشێکیان پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بوون. کەمال کەرکوکی سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی هەرێمی دووی دەکرد، کە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوکی دەگرتەوە و چالاکی حزبی و سەربازیان لە ناوچەکە دەستپێکردبۆوە، لە یەکەمین چالاکی سەربازیشیاندا هێرشیان کردە سەر سەربازگەی سوپای عێراق لە گوندی شارستێن کە بە شەڕی شارستێن بەناوبانگە.[٣] لە ساڵی (١٩٧٨) حزبی شیوعی عێراق بە هۆی مامەڵەی خراپی حزبی بەعس لەگەڵی لە (بەرەی نەتەوایەتی و پێشکەوتنخوازی) چووە دەرەوە و پاڵیاندایە شاخ، لە کوردستان دەستیاندایە خەباتی پارتیزانی و چەک هەڵگرتن،[٤] بارەگای حزبیان لە ناوچە ئازادەکانی کوردستان کردەوە، لە ڕانیە و چوارقوڕنە و ناوچەی بیتوێنەوە چەند هاوڵاتیەک پەیوەندییان پێوەکردن و بوون بە پێشمەرگە، کە ژمارەیان (٢٥) کەس بووە و بە دەستەی ناوچەی بیتوێن ناسرابوون، لە یەکەمین چالاکیان لە ناحیەی چوارقوڕنە دوو هاوڕێیان بە ناوەکانی ( عەلی مارف و شێخە خەرتەل) لە لایەن سوپای عیراقەوە دەکوژرێن، کە بەیەکەم قوربانی پارتیزانیی شیوعی دادەنرێن لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێدا.[٥] لە (١٩٧٩/٨/٨) بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان وەک باڵێکی ناو (ینک) جیابۆوە و بە ناوی (حزبی سوسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)ەوە خۆی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سوارە عەباس مەمەند: ٢٠١٦/١/٢١، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٥٣ لە ڕانیە لە دایک بووە، سالانی ١٩٧٦-١٩٨٥ پێشمەرگە بووە، دواتر بۆتە موستەشاری فەوجی سوک، ئێستا کاری ئازاد دەکات.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر حەمەد وسوو: ٢٠١٦/١/٢٧، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٥٤ لە ڕانیە لە دایک بووە، ماوەی سالانی ١٩٧٨-١٩٩١پێشمەرگە بووە، ئێستا ئەفسەرە بە پلەی موقەدەم و بەڕێوبەری بەشی پۆلیسی گرتن و گواستنەوەی ڕاپەڕینە لە ڕانیە.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد عەلی ئیسماعیل: ٢٠١٦/١/٢٧.

[٤] فاتح رسول: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کورد (١٩٨٢-١٩٩٠)، ب٣، سوید، ١٩٩٤، ل١٣٤-١٣٥.

[٥] سەلام حەوێز ئیسماعیل: کوردستانی باشور لە شۆڕشی چەکداریەوە بۆ ڕاپەڕینی ئازاری نەوەدویەک، هەولێر، ٢٠١١، ل١٤٨، ١٥١.

ڕاگەیاند، لە ساڵی (١٩٨١) ناوەکەی گۆڕا بە حزبی سۆسیالیستی کوردستان،[1] ئەم حزبە تا ساڵی (١٩٨٨) لە ناوچەی ڕانیە چالاکی سەربازی بەرفراوانیان دژی ڕژێمی عیراق هەبوو هەندێک جار بە تەنها و هەندێک جاری تر لە ژێر جموجوڵی کاری هاوبەش لەگەڵ حزبەکان.[2]

لە ساڵی (١٩٧٩) کۆمەڵێک ڕووداو ڕوویاندا، کە گرنگترینیان بەرپابوونی شۆڕشی گەلانی ئێران و دواتر ڕاگەیاندنی کۆماری ئیسلامی بوو لەو وڵاتە، لە عیراقیش چوونە سەرکاری (سەدام حسین) بوو وەک سەرکۆماری عیراق، ئەم دوو ڕوداوە چەندین کاردانەوەی جیهانی و ناوچەیی بەدوای خۆیدا هێنا.[3] دوای یەک ساڵ لە (١٩٨٠/٩/٢٢) شەڕی (ئێران/عێراق) دەستی پێکرد و باشووری کوردستان بوو بە بەشێک لە ململانێی شەڕی ئەم دوو دەوڵەتە، ناوچەی ڕانیەش بوو بە بە شێک لە هێڵەکانی شەڕ، بەپێی بەدواداچوونەکان لە ماوەی ئەم شەڕەدا بەپێی ئەو ناوانەی کە تۆمارکراوە لەناو ڕانیەدا (٣) کوژرا و (٩) و دیل و (٧) بێسەروشوێن هەبووە،[4] حکومەتی عیراقیش بەردەوام بڕیاری دەردەکرد، وەک نەمانی مۆڵەتی سەربازی و نەمانی جیاکاری لە تەمەنی سەربازی و ...هتد، گەنجێکی زۆر لە ڕانیە لەخزمەتی سەربازی رایانکرد، هەندێک کەسیش بە خێزانەوە ڕایدەکرد و خۆی دەشاردەوە، بەشێکیش دەبوون بە پێشمەرگە، جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆری خەڵک بوو بوو بە جەیشی شەعبی و چەکداری فەوجە سووکەکان (جاش)، ئەم دۆخە لە ڕانیە لە ماوەی ئەم جەنگە بەردەوام بووە.[5] لەم ماوەیەدا حکومەتی عیراق چەند هێزێکی لە عەشایرەکان و خێڵەکانی ناوچەکانی کوردستان دروستکردبوو، وەک: (فەوجی سووکەکان (جاش) و جەیشی شەعبی عەشایری، مەفرەزەی خاسە)، لە ڕانیە لەماوەی ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٦) چەند فەوجێکی سووک دروستکرا وەک فەوجەکانی (٢٢-٨٢ – ١٣٢) کە لەلایەن (هەمزە عەباس مامەند) و (ئاکۆ عەباس مامەند) و (سوارە عەباس مامەند)ەوە وەک ڕاوێژکار(موستەشار) سەرپەرشتی کراون، دامەزراندنی ئەم فەوجانە لە ژێر

---

[1] بەهرۆز گەلاڵی: ڕەسول مامەند، ٥٠ ساڵ تەمەن و ٣٣ ساڵ خەبات، چ٢، چاپخانەی سەفوەت، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٧٣،١٠٤.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد زرار فەقێ ئەحمەد: ٢٠١٦/١/٢٨، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٥ لە بنگرد لە دایک بووە، لە ساڵی ١٩٧٩ بۆتە ڕێکخستنی ناوشاری ئەو حزبە لە ڕانیە، دەرچووی کۆلێژی یاسایە و ئێستا ئەندامی ئەنجومەنی ناوەندی (ینک)ە.

[3] گۆران ئیبراهیم سالح: دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندیەکانی ئەمەریکاو عێراق ٦/ئازاری ١٩٧٥-٢/ ئابی١٩٩٠، هەولێر، ٢٠١٣، ل١٦٣-١٦٩.

[4] جمال فتح الله طيب: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٢،١٦٧؛ بۆزانیاری زیاتر لەسەر ناوی شەهید و بێسەروشوێن و دیلەکان. بڕوانە: کوژاو بێسەروشوێن و دیلەکانی ڕانیە کە سەربازبوون لە جەنگی(٨) ساڵەی عێراق و ئێران: گۆڤاری شمشارە، ژمارە(٥٢)، مانگی ١ی ٢٠١١، ل ٢٩-٣٤.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئازاد حەمە عەزیز (مەرگەیی): ٢٠١٦/١/٣١، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٥٨ لە ڕانیە لە دایک بووە، ١٩٧٧ بوتە ئەندامی (ینک) و دواتر بۆتە پێشمەرگە، دەرچووی ئامادەییەو ئێستا کارگێڕی مەڵبەندی ٢٤ ڕاپەڕینە لە ڕانیە.

فشار و پاڵەپەستۆوە بووە،[١] بە شێوەیەکی گشتی فەوجە سووکەکانی ڕانیە لە ئاست ڕووداوەکان خۆپارێز بوون.[٢] ڕانیە بەردەوام لە ڕووی سیاسیەوە ناوچەیەکی نا ئارام بووە، مەفرەزەی پێشمەرگە بەردەوام دابەزیونە ناو شار و چالاکییان ئەنجامداوە، حکومەتیش بەرامبەر ئەم کارە بە توندی هاوڵاتیانی مەدەنیی شاری سزا داوە، لە (١٩٨٧/٩/١) مەفرەزەیەکی(ینک) دابەزیوەتە ناو ڕانیە و ئەفسەرێکی سوپای عێراقیان لە گەڕکی قەڵات کوشتوە، حکومەت لە پەرچە کرداری ئەم کارە هەستاوە، بە ڕووخاندنی خانووەکانی گەڕەکەکەو تێکدانی تەواوی باخچەکانی ناوبازاڕ، بۆ ڕێگری لە ئاڵۆزبوونی دۆخەکە کەسایەتی ئاینی دیاری ڕانیە (شێخ مستەفای باقلان) وەک ڕیش سپی شارەکە چۆتە ناو کێشەکەوە و دۆخەکەی بەرەو هێور بوونەوە بردوە.[٣]

لە ساڵی (١٩٨٧) بەهۆی خراپی مامەڵەی حکومەت بەرامبەر هاوڵاتیان و گرتن و ڕاوەدونانی خەڵک خوێندکارێکی ئامادەیی ڕانیە بەناوی (موسلیح مستەفا نەبی) کە سەر بەڕێکخستنی (ینک) بوو بە بۆمبی دەست هێرش دەکاتە سەر خواردنگەیەک لە ناو بازاڕ کە ژمارەیەک پیاوی ئەمنی دەوڵەت نانیان لێدەخوارد، لەکاتی ئەنجامدانی کارەکە بۆمبەکە بە خویدا تەقیوەتەوە و برینداربووە، دواتر لەوێ بەبرینداری شەهیدکرا، لە ئەنجامی ئەم کارە بەشێک لە بنەماڵەکەی دەستگیرکران و بەشێکی ترشیان ڕایانکرد بۆ ئێران و خانووی ماڵەوەشیان تەقێنرایەوە،[٤] لە (١٩٨٨/١/١٧) بە هۆی کوژرانی ئەفسەرێک لە لایەن مەفرەزەی پێشمەرگەوە لە بەردەم خانوی هاوڵاتیەک بەناوی (ئەحمەد حەمەدەمین ڕەش) لەناو بازاڕی ڕانیە، حکومەت لە تۆڵەی ئەم کارە خانووەکەی تەقاندەوە و تەواوی بنەماڵەکەشی دەستگیرکردوە، هەموو ڕیزە دووکانەکانی ناوچەکەشی ڕوخاندوە[٥]. لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی نێوان عیراق– ئێران لە (١٩٨٨/٨/٨) شۆڕشی کوردی لە باشووری کوردستان بەرەو لاوازی دەچێت و بەشێک لەو پێشمەرگانەی کە لە دەرەوە بوون خۆیان ڕادەستی ڕژێمی بەعس کردەوە، ڕەشبینی خەڵکی کوردستان بەرامبەر شۆڕش تا هاتووە زیاتر بووە،[٦] حکومەتی بەعسیش

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەمزە عەباس مەمەند: ڕانیە، ٢٠١٥/١/٢٢.

[٢] سەلام حەوێز بەرید: زایەڵەی ڕانیە لە ئایارەوە بۆ ئازار، چاپخانەی کشتوکاڵ، ٢٠٠٥، ل٢٤؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئازاد حەمە عەزیز: ٢٠١٦/١/٣١.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (جەلال ئیبراهیم پیرۆت): ٢٠١٦/٢/٢٧، لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە. ناوبراو لە دایک بوی ١٩٦٩ ١٩٦٩ چوارقورنەیەو ئەنجامدەری ئەو چالاکییە، ئەم کارە لە تۆڵەی شەهید شەهریاری فەرماندەی (ینک) ئەنجامدراوە، جەلال ئیبراهیم لەم چالاکیە بەبرینداری دەربازی بووە، ئێستا ئەفسەرە بە پلەی ڕائید.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، حەیدەر مستەفا نەبی(مەلا): ٢٠١٦/٢/١٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایکبووی ١٩٧١ ڕانیەیە و برای شەهید موسلیحە، لە ساڵی (١٩٨٧)ەوە بۆتە پێشمەرگە ئێستا پێشمەرگەیە بە پلەی ڕائید.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، عەلی ئەحمەد قادر (بۆسکێنی): ٢٠١٦/٢/٢٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٧ بۆسکێنە، دەرچووی پەیمانگایە و ئەنجامدەری ئەو چالاکیەیە، ئێستا فەرمانبەری وەزارەتی ناوخۆیە.

[٦] د. فایەق گولپی: سیاسەتی نەتەوەپەرستی داگیرکەران، پەرچەکرداری خێڵەکی کورد، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٤٤٥.

زۆر توندوتیژ بووە، هێزێکی زۆری پاشماوەی شەڕی هێناوەتە ناو شارەکان، ڕاستەوخۆ دوای وەستانی جەنگ گەڕەکێکی لە باکووری ڕانیە بە بیانووی زیادەڕۆیی بەتەواوی وێرانکردوە و دانیشتوانەکەی ناچار بە ئۆردوگا زۆرە ملێکان کردوە، بەردەوام لە هەوڵی بچووک کردنەوەی ڕانیە دابووە بە مەستی ئامادەکردن بۆ ڕاگواستنی گشتی شارەکە، دەستی کردووە بە دەستگیرکردن و ڕەشبگیری و ڕاوەدونانی گەنجەکان و چەندین گەنجی خستۆتە زیندانەکانەوە، هەندێک لە گەنجەکان لە ترسی سەربازی و گرتنیان شەوانە لە چیای کێوەڕەش و دۆڵەکان خەوتوون، ئەم دۆخە تا ساڵی (١٩٩١) بەردەوام بووە.[١]

**٣- چالاکی پارتە سیاسییەکان لە ڕانیە**

لە دوای ساڵی (١٩٧٥) کۆمەڵێک پارت لە ڕانیە چالاکییان هەبووە و خاوەن ئەندام بوون و لایەنگریان هەبووە، هەندێکیان لایەنگیری حکومەت بوون بە ئاشکرا کاریانکردووە و هەندێکیشیان سەر بەشۆڕش بوون بە نهێنی کاریان کردووە، پارتە ڕێگەپێدراوەکان پێکهاتوون لە حزبی بەعسی ئیشتراکی، پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان- د.عەبدولستار، پارتی دیموکراتی کوردستان- عەزیز ئاکرەیی، پێشکەوتووخوازی کورد- عەبدوڵا ئیسماعیل(مەلا ماتۆڕ)، کە ئەم حزبە کوردییانە بە حزبی کارتۆنی ناسرابوون و تەنها بە رووکەش هەبوون و لایەنگری بەعس بوون، حزبی شیوعی عیراق، کەدواتر بوو بە ئۆپۆزسیۆن و چوو بۆ شاخ. ڕیگەپێنەدراوەکانیش بریتی بوون لە (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، حزبی سۆسیالستی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، ئالای شۆڕش، پارتی سۆسیالستی کورد(پاسۆک)، بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان) لە ناو ڕانیەدا لایەنگری (ینک) زۆر بە هێز بووە، تاڕادەیەکیش حزبی شیوعی، دوای ئەوانیش بەشێک لە پارتەکانی تر.[٢]

لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ ڕێکخستنە نهێنییەکانی (ینک) باڵی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) لە ڕانیە،[٣] دەستیان بە چالاکی کردووە، لە دوای (١٩٨٠) کەرتی ڕێکخستنی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، موەفەق حەمە مەجید، ٢٠١٦/٢/١٩، ڕانیە ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٥ ڕانیەیە و دەرچووی ئامادەییە، ١٩٧٨ چۆتە ناو ڕێکخستنی ناو شاری (ینک)، لە ساڵی ١٩٩٠ تا ١٩٨٥ ت لێپرسراوی بەنزینخانەی ڕانیە بووە بە هۆی کاری سیاسی لەکارەکانی دەرکراوە.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەمال عەبدولا حەمەعەزیز (مەرگەیی): ٢٠١٦/١/٢١، ڕانیە، لە ١٩٥٦ لە ڕانیە لە دایک بووە لە ساڵی ١٩٧٨-١٩٩١ خەریکی کاری ڕێکخستن و پێشمەرگایەتی بووە، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.؛ ڕەسوڵ مستەفا حەمە(بچکۆل): ٢٠١٦/٢/١٨، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٧٢، بەری مەرگەیە، دەرچووی زانکۆیە، لە ساڵی ١٩٨٨ بۆتە ڕێکخستی ناوشاری (ینک).

[٣] بە هۆی زۆری ناوی کەسایەتیەکان و فراوانی لایەنگرانی (ینک) لە ڕانیە نەمان توانی ئاماژە بە ناوەکانیان بکەین، بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ڕێکخستنەکانی(ینک) لە ناو ڕانیە لە ڕووی ناو و ژمارە و شێوازی کارکردنیان. بڕوانە: ڕەسول بۆسکێنی: ڕویشتن بە ناو ئازاردا بیرەوەریەکانی ڕوداوەکانی بەندیخانە(١٩٨٩-١٩٩١)، چاپخانەی هاوسەر، سلێمانی، ٢٠٠٩.؛ بوار نورەدین: ئەستێرەی سوور، بەشی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١٠٧-١٣٣.

ڕانیە لە بەردانگە کراوەتەوە کە سەر بە مەڵبەندی سێ بووە، ڕێکخستنەکان لە سەر شێوەی پۆل و شانە بووە لەسەر شێوازی هێشوویی، لە ڕانیە (٧) بۆ (١٠) هێڵ هەبووە، کارەکانیان بریتی بوو لە بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەو ئەدەبیاتی (ینک)، کۆبوونەوەی ماڵان، هۆشیارکردنەوەی جەماوەر، لەدیوار نووسین، نامەو زانیاری بۆ شاخ، ڕێنیشاندەری، ئەنجامدانی چالاکی ڕێکخستنەکانی (ینک) لە ڕانیە و چوارقورنەو سەرکەپکان و سەروچاوە و بۆسکێن، زۆر چالاک بوون پەیوەندیان هەبووە و چەندین گەنج و کەسایەتی کاریان تێدا کردووە بە هۆی فراوانی شێوازی کارکردنیان لە ساڵی (١٩٨٩) بەشێکی ڕێکخستنەکانی (ینک) لەڕانیە دەستگیردەکرێن و دەخرێنە زیندانەوە، کە بریتی دەبن لە (ڕەسوڵ حەمە عەبدولقادر، قادر ئەحمەد ئیسماعیل، عەلی ڕەسوڵ حەمەد، جەنگی ڕەسوڵ حەمەد، پیرۆت عەزیز عەبدوڵا)،[1] جگە لە ڕێکخستنەکانی (ینک) ڕێکخستنەکانی حزبی سۆسیالیست، بە هۆی نزیکیان لە بارەگای سەرکردایەتی خاوەن ڕێکخستنێکی فراوان بوون لە ڕانیە چەندین ڕێکخراوی نهێنیان هەبووە، لیژنەیەکی هاوبەشیان هەبووە لە نێوان ڕێکخستنەکانی ڕانیە و پشدەر، لە زۆرێک لەڕووداوەکان ڕۆڵیان هەبووە، بەهۆی زۆری چالاکیان ڕاستەوخۆ لە لایەن ڕێکخستنەکانی دەرەوەی ئەو حزبە سەرپەرشتی کراون، گرنگترین کەسە چالاکەکانی ڕێکخستنەکانی ناوشاریان بریتی بوون لە (محەمەد مستەفا، دڵشاد عوسمان، ئەحمەد زرار، حسن حەلاق، عەزیز بایز، خدر سۆفیانی، یاسین عوسمان، محێدین، هتد). [2] سەبارەت بە کاری ڕێکخستنی نهێنی شیوعیەکان لە ڕانیە لە دوای ساڵی (١٩٨٠) چالاک بوون، ئەمەش بەهۆی زۆری ژمارەی لایەنگرانیان و بوونی چەند بنەماڵیەکی شیوعی لە ناوچەکە، وەک بنەماڵەی(محەمەدی وەستا قادر، حەمەدەمین ئەڵاوێردی، حەوێزی بەرید، عەبدوڵا تاپڕ، برایم حاجی سورە، عەلیە درێژ، مام زاهیر، حەمەدەمین سەرسیانی، هتد)، بە هۆی چالاکیەکانیان لە ساڵی (١٩٨٢) دوو کەس بە ناوی (محەمەد کەمال، سدیق عەبدوڵڵا) لە ڕێکخستنەکانی ناوشاری ڕانیە دەسگیردەکرێن و دواتر لە سێدارەدەدرێن، شیوعیەکان خاوەن دوو ڕێکخستن بوون لە ناو شار و ڕاستەوخۆش بەسترابوونەوە بە ڕێکخستنی بیتوێنی حزبی شیوعی لە شاخ، کاری ڕێکخستنیان بریتی بووە لەبڵاو کردنەوەی بڵاوکراوەکانی حزب، ڕۆژنامە و گۆڤار، بەستنەوەی شار بە شاخ،

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، عەلی ئیبراهیم قادر (خەیات): ٢٠١٦/١/٢١، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٦ شاروچکەی چۆمانە، لە ١٩٨٢ بۆتە ئەندامی ڕێکخستنی نهێنی (ینک) بووە لە ناوچەی ڕانیە ئێستا کارگێری مەڵبەندی ٢٤ ڕاپەڕینە لە ڕانیە.؛ محەمەد ئەحمەد حەمەدەمین، ناسراو بە شامەروان، ٢٠١٦/١/٢٣، ڕانیە، لە دایک بووی ١٩٦٧ بناری قەندیلە، ١٩٨٢ بۆتە ئەندامی ڕێکخستنی ناوشاری (ینک) لە ڕانیە، ئێستا کارگێری مەڵبەندی ٢٤ ڕاپەڕینە لە ڕانیە.

[2] محەمەد شاکەلی: لە بزوتنەوەوە بۆ حزبی سۆسیالیستی کوردستان ٢٩٧٦-١٩٩٣، کەرکوک، ٢٠١١، ل٢٢.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد زرار فەقێ ئەحمەد: ٢٠١٦/١/٢٨.

ناردنی نامە و ئاگاداری و ڕینیشاندەری، چالاکیەکانیان گریدراوی یەک بووە لە ڕانیەو چوارقوڕنەو پشدەر، ئافرەتیش ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە جموجوڵ و چالاکیەکانیان.[١]

کاتێک ساڵی (١٩٨٧) بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان دامەزرا،[٢] پێش دامەزراندنی ئەم حزبە لە ڕانیە چالاکی سیاسی برایانی موسوڵمان و بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی بوونیان هەبووە، زۆرێک لە بانگخواز و مامۆستایانی ئاینی و کە سایەتییە ئیسلامییەکان سەر بە ڕەوتی ئیسلامی بوون.[٣] لە ساڵی (١٩٨٣) هەندێک کەسایەتی دیاری ئەوکاتی ئیسلامی لە ناوچەکە لە ڕێگەی مزگەوت و وتار و تۆماری کاسێتیەوە بیری ئیسلامی و دژە مارکسییان بڵاوکردۆتەوە، (عەلی باپیر)، کە لایەنگرێکی زۆری هەبووە یەکێک بووە لە کەسە دیار و چالاکەکانی ڕەوتی ئیسلامی لە ناوچەکە، لە ساڵی (١٩٨٤) کەسایەتی دیاری ڕەوتی ئیسلامی بەناوی عومەر مەستەفا(تیمار) دەکوژرێت و ڕاستەوخۆ (ینک) و کۆمەڵەی تیدا تۆمەتبار دەکریَ، لە شارەدێی چوارقوڕنەی سەر بە ڕانیە پرسەی بۆ دادەنرێت و لە پرسەکەیدا کۆبونەوەیەک دەکرێت بە ئامادە بوونی هەموو ئەوکەسایەتیە ئیسلامیانەی کە بڕوایان بە ڕەوتی ئیسلامی هەبووە لە کوردستانی عێراق، ئەم کۆبونەوەیە دەستپێک بووە بۆ دەستکردن بە خەباتی چەکداری،[٤] لەگەڵ دامەزراندنی بزوتنەوەی ئیسلامی کۆمەلێک کەسایەتی و گەنجی ئەم حزبە لە ڕانیەوە چوون بۆ شاخ، کە زۆرجار دەستەی چەکدارییان دابەزیوەتە ناو ڕانیە، لەگرنگترین چالاکیەکانیان لە ساڵی (١٩٨٩) کە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی بیتوێنی ئەم حزبەی تیادا دەکوژرێت، کاری نهێنی ئەو حزبەش خۆی بینیوەتەوە لە بڵاوکردنەوەی نامیلکە و نووسراوی حزبی.[٥]

سەبارەت حزبی بەعسی ئیشتراکی، شۆڕشگێڕی کوردستان- د. عەبدولستار، پارتی دیموکراتی کوردستان- عەزیز ئاکرەیی، پێشکەوتووخوازی کورد- عەبدوڵا ئیسماعیل (مەلا ماتۆڕ)، کە لەبەرەی دەوڵەتدا بوون ئەوانیش تاڕادەیەک ڕێکخستن و جوڵەیان هەبووە، خاوەن چەندین ئەندام ولایەنگر بوون لە ناو ڕانیە، بەڵام لای خەڵک بەچاوێکی باش سەیرنەکراون. (پدک) لە دوای هەرەسی شۆڕشی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد حوسێن حوسێن:٢٠١٦/٥/٢٥، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٣ ڕانیەیە و دەرچووی ئامادەییە و لە ١٩٨٠ ڕێکخستنی نهێنی ناوشاری شوعی بووە لەڕانیە؛ ئیسماعیل حەمەدەمین حەسەن(سەرسیانی): ٢٠١٦/١/٢٣، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٧٠ لە ڕانیە لە دایک بووەو پیشەی مامۆستایە و بە بنەماڵەوە شیوعین و لە ١٩٨٤ ڕێکخستنی نهێنی ناوشاری حزبی شوعی بووە لە ڕانیە.

[٢] مەحمەد فاتح: حزب وڕێکخراوە سیاسیە عێراقیەکان(١٩١٠-٢٠١٠)، سلێمانی، ٢٠١٢، ل١٧٠.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عوسمان حەمەدەمین عەبدولا، ٢٠١٦/٣/٤، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٧١ لە ڕانیە لە دایک بووە، لە ساڵی ١٩٨٧-١٩٩١ سەر بە ڕێکخستنی بزوتنەوەی ئیسلامی بووە لە ناو ڕانیە، دەرچووی پەیمانگای ئیسلامیە و ئێستا کارگێڕی مەڵبەندی کۆمەڵی ئیسلامییە لە ڕانیە.

[٤] حەسەن بابەکر: هەورازو نشێو، چاپخانەی سیما، ٢٠١١، ل٣١-٣٢، ٤٠-٤٣.

[٥] شەریف وەرزێر: ڕاپەڕین و سەروەری باسێک لە ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ ڕۆڵی بزافی ئیسلامی کوردستان، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٢٤؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عوسمان حەمەدەمین عەبدولا: ٢٠١٦/٣/٤.

ئەیلوولەوە لە ڕانیە لە ڕوی ڕێکخستنەوە زۆر چالاک نەبوون بەڵام لایەنگریشیان هەبووە،[1] لە ساڵی (١٩٨٢) یەکەم ڕێکخستنی نهێنی خۆیان لە ناو ڕانیە دامەزراندووە و ڕاستەوخۆ بەستراونەوە بە لقی دووی پارتی لە بالیسان، چەند شانەیەکی نهێنیشیان هەبووە، لە گرنگترینیان شانەی گوڵان بووە، ڕێکخستنەکانی پارتی بەشدار بوون لەو ڕاپەرین و خۆپیشاندان و چالاکیانەی کەدژی حکومەتی بەعس لە ڕانیە ئەنجامدراوە. گرنگترین بنەماڵە و کەسە چالاکەکانی پارتی لە ڕانیە بریتی بوون لە (د. لەتیف مەحمود، عومەر حەمە عەزیز، ئەحمەدی وەستا عەبدوڵا، ئەحمەدی سالح بەگ، محەمەد عەباس، قادر سەرسپی، قادر شەمام، ئەحمەد خدر)، بەڵام کارکردنی (پدک) لە ڕانیە سنوورداربووە بەهۆی ئەوەی (ینک) و (پدک) دوو حزبی گەورەی ڕکابەر بوون لە باشووری کوردستان، لە ناوچەی ڕانیەش (ینک) زاڵبووە.[2] دوای دروستبوونی ئالای شۆڕش لە ساڵی (١٩٨٥) ئەوانیش لایەنگر و ڕێکخستنی نهێنیان لە ڕانیە هەبووە، گرنگترین ئەندامەکانیان بریتی بوون لە (حاکم کەمال، جەمال عەبدوڵا مەرگەیی، سەربەست جیهاد، مامۆستا حەوێز حەمەدەمین).[3]

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ڕەسوڵ مستەفا حەمە: ٢٠١٦/٢/١٨.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد حوسێن حەمەد(خەزاڵ): ٢٠١٦/٥/٢٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٤ ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگایە یەکێک بووە لە ڕێکخستنە نهێنیەکانی پارتی لە ڕانیە؛ ئەحمەد عەبدوڵا ئەحمەد: ٢٠١٦/٥/٢٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ ڕانیە و دەرچووی ئامادەییە و یەکێک بووە لە ڕێکخستنەکانی پارتی لەو سەردەمەدا.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ڕەسوڵ مستەفا حەمە، ٢٠١٦/٢/١٨.

**تەوەری دووەم/ ڕاپەڕین و خۆپیشاندانەکانی ڕانیە لەماوەی ساڵانی (١٩٨٢-١٩٩١).**

لە ڕۆژی (١٩٨٢/٤/٢٤) دانیشتوانی شارۆچکەی قەڵادزێ، بۆ زیندوو کردنەوەی یادی کارەساتی (١٩٧٤/٤/٢٤) ی[١] ئەو شارۆچکەیە دەستیان کردووە بە خۆپیشاندان و ڕێپێوان، دواتر خۆپیشاندانەکە فراوان بووە و چەندین شارو ئۆردوگای گرتۆتەوە، ڕادیۆی (ینک) بەردەوام هەواڵەکانی گواستۆتەوە و لە گشت ناوچەکانی تری کوردستان هانی هاوڵاتیانیان داوە.[٢] بەهۆی جەنگی عیراق و ئێران، حکومەتی عیراق بەشێکی زۆری هێزەکانی لە ناوچە کوردیەکان گواستۆتەوە بۆ باشووری عیراق کە ئەم کارە بۆتە هۆی سود گەیاندن بە بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی لە ناوچەکە و[٣] هەر زوو ڕاپەڕین و خۆپیشاندان شارو شارۆچەکەکانی سلێمانی و هەولێر و ڕانیە و هەڵەبجەو هەندێک ناوچەی تری گرتەوە و کراوەتە بەهانەیەک دژی سیاسەتی ئەو کاتەی بەعس، کە خۆی لە سیاسەتی بەعەرەبکردن و بەبەعسکردن و ڕاگواستنی ناوچە کوردیەکان دەبینیەوە.[٤]

لە ڕۆژی (١٩٨٢/١/٥) لەشارەدێی چوارقوڕنەی سەر بە ڕانیە خۆپیشاندانێک سازکرا، حکومەت بەتوندی وەڵامی داونەوە و (٢٧) خوپیشاندەری لێ بریندارکردن،[٥] پاشان لە (١٩٨٢/٤/٢٤) ڕانیە جموجۆڵی تێکەوتووە و کۆبونەوەی بچووک بچووک لە چەند شوێنێک کراوە لە ئێوارەی (٤/٢٧) مەفرەزەیەکی سەر بە (ینک) کە پێکهاتبوو لە (١٢) پێشمەرگە بە سەرپەرشتی (عومەر حەمەد وسوو) چوونە ناو ڕانیە و چەند بڵاوکراوەیەکیان بڵاوکردۆتەوە بە خەڵکیان ڕاگەیاندوە، کە پێشمەرگە پشتگیری خۆپیشاندان دەکات، دواتر وا بڵاودەکرێتەوە لە ناو ڕانیە ڕۆژی (١٩٨٢/٥/١) خۆپیشاندان بکرێت، بەڵام بە هۆی ئەوەی ڕۆژەکە دەکەوێتە ڕۆژی هەینی و دەوامی خوێندکاران نەبووە، دوادەخرێت بۆ ڕۆژێک دواتر.[٦] لەو سەردەمەدا خوێندکاران لە ڕانیە زۆر چالاک بوون، چونکە کۆکردنەوەیان ئاسانتر بوو لە چین و توێژەکانی تری کۆمەڵگا، جگە لەمە خوێندکاران بەگشتی کەسێک یان خزمێکیان پێشمەرگە بووە، ناوچەکەیان نزیک بوو لە سنووری پێشمەرگە و

---

[١] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بۆردومان وکارەساتی ١٩٧٤/٤/٢٤ بڕوانە: عومەر هەمزە عومەر: کارەسات و بۆردومانی قەلادزێ لە ١٩٧٤/٤/٢٤(لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی و جوگرافی بۆردومانی قەلادزێ و ڕاپەڕینەکانی کوردستان)، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢.

[٢] نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری ئەشکینن، ل٢٥٦-٢٥٧.

[٣] هۆشمەند عەلي مەحمود: ڕاپەڕینی شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٩١ دا، چاپخانەی کۆمەڵگای شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٣.

[٤] صباح محي الدين امين: النزوح الكردي في العراق ١٩٧٥-١٩٩١، رسالة ماجستير(غير منشورة)، كلية الاداب، جامعة المنصورة، مصر، ٢٠١٥، ص٧٧.

[٥] عومەر هەمزە عومەر: کارەسات و بۆردومانی قەلادزێ لە ١٩٧٤/٤/٢٤، ل١٧٥.

[٦] نیازی حەمە عەزیز: ٤/٢٤ قەلادزێ و هاودەنگی ڕانیە لە ٥/٢ دا، ڕۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٢٥٧٦)، هەولێر، ١٩٩٨/٥/٢، ل٥.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر حەمەد وسوو: ٢٠١٦/١/٢٧.

چالاکیەکانیان، لە لایەکی تریش زەبرو زەنگی بەعس و هێنانی کۆمەڵێک مامۆستای سەر بە حزبی بەعس و چالاکییەکانی ڕێکخراوی یەکێتیی قوتابیانی بەعس پەرچەکرداری زۆری دروستکردوە، هەستی نەتەوەیی لە ناو خوێندکاران زۆر بەهێزکردووە، چالاکی و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانی سەر بە(ینک) ڕۆڵی بەرچاویان لەم بوارەدا هەبووە.[١] لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٢) یەکێتیی خوێندکارانی سەربە (ینک) لە ڕانیە دامەزراوە و خاوەن چاپخانەی خۆیان بوون و بەردەوام نووسراویان بڵاوکردۆتەوەو کۆمەڵێک کەس کاریان تێدا کردووە وەک (خەسرەو قادر، مامۆستا محەمەد ڕەسوڵ، جەلال عبدللە، مستەفا سەلیم، ...هتد)،[٢] لە شەوی (١-٢/٥/١٩٨٢) کۆبونەوەیەک لە ماڵی خەسرەو مام قادر بەبەشداری (عەلی مام قادر، حەمید عەبدوڵا، سۆران سەلیم، کاوە قادر) کراوەو لە کۆبونەوەکەدا بڕیاردراوە نامە بۆ کەسایەتیە جۆربەجۆرەکانی شار بنێردرێ و لیژنەیەک لە حزبەکان پێکبهێنرێ، کە بەنهێنی لە ناو ڕانیە چالاکی بکەن، دوای گفتوگۆ بڕیاردراوە کە خەسرەو قادر وەک وتەبێژ و سەرپەرشتیاری لیژنەکە کارەکان ئەنجامبدات، لەکاتی خۆپیشاندانیشدا سود لە مزگەوتی ڕانیە وەربگیرێت.[٣] بەم جۆرە شەوی (١-٢/٥/١٩٨٢) لەڕێگەی مایکرۆفۆنی بەشێک لە مزگەوتەکانی ڕانیەوە ئاگاداری خەڵک کراوەتەوە، کە سبەی خۆپیشاندان ئەنجام دەدرێت،[٤] لە(١٩٨٢/٥/٢) جەماوەری ڕانیە دەستیان کردوە بە خۆپیشاندان و ڕاپەڕین، کە تەکانێکی گەورەی ڕاپەڕینی بەسەرجەم شارەکانی تر بەخشیوە.[٥]

لە بەیانی ئەو ڕۆژەدا کۆمەڵێک خوێندکار لە بەردەم ناوەندیی ڕانیە بەرامبەر سەرچاوەی ئاوی قولە گردبوونەوەیەک ساز دەکەن، سەرەتا جێنشین و کۆمەڵێک کەس دەچن بۆ لایان کە خۆپیشاندان نەکەن و دەست هەڵگرن لەم کارە دواتر داوا لە ئاکۆی عەباس ئاغا دەکەن وەک کەسایەتی شار و سەرپەرشتی جەیشی شەعبی عەشایری ڕانیە بچێتە ناو خۆپیشاندەرەکان، ئاکۆ عەباس ئاماژە بەوە دەکات لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ خوێندکارەکان کەسێک بە ناوی عەبدوڵڵا ڕەش[٦] دەستی بە هوتاف

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ د. بەهزاد وسوو حەمەد بەگ: ٢٠١٦/١/٢٨، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٦٥ لە ڕانیە دایک بووە لە خۆپیشاندانی ١٩٨٢ خوێندکاری پێنجی ئامادەی بووە بەشەدار بووە لە چالاکیەکان، دەرچووی کۆلیژی پزیشکیە، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لەم بوارەدا.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەلال عبدللە حەمەعەزیز: ٢٠١٦/١/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٤ لە ڕانیە لە دایک بووە، لە ١٩٨٢- ١٩٩١ ئەندامی ڕێکخستنی ناو شاری یەکێتی بووە، لە ڕانیە ئێستا وازی لەکاری حزبایەتی هێناوەو پیشەی فەرمانبەرە.

[٣] خەسرەو مام قادر: ڕانیەی دەروازە لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی ١٩٨٢ دا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ(٢٤٤٢)، سلێمانی، ٢٠٠١/٥/٢، ل٩.

[٤] چاوپێکەوتن لەگەڵ سالار فەتاح بابەکر:٢٠١٦/١/٢٣، ڕانیە، لە دایک بووی ١٩٦١ ڕانیەیە، یەکێک بووە لە چالاکوانەکانی خۆپیشاندان و خوێندکاری پەیمانگا بووە، ئێستا نووسینگەی خانوبەرەی هەیە.

[٥] محەمەد خدر: ڕۆژانی پێشمەرگایەتی، چاپخانەی ماردین، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٩، ل٣٤.

[٦] عەبدوڵڵا ڕەش کە ئەو کات ڕێکخستنی حزبی شیوعی بووە و یەکێک بووە لە کەسە چالاکەکەنی خۆپیشاندانی ١٩٨٢ ئاماژە بەوە دەکات لە دەسپێکی کارەکان، بە مەبەستی خۆپیشاندان چوتە لای لایەنگرانی (ینک) بۆ

کێشان کردووە، بەمەش خۆپیشاندان دەستی پێکردووە و ئەو چەکدارانەی کە لەگەڵیدا بوون، بوون بە هێڵی بەرگری لە نێوان حکومەت و خۆپیشاندەران.[1] ئەو جەماوەرە لە سەرەتا ژمارەیان (١٠٠) کەس بووە بە هوتافی (ئەی شەهیدان) بەرەو ناو بازاڕی شار کەوتوونەتەڕی، لەوێ توشی بەربەستی پیاوانی ڕژێم بوون، بەڵام هەر زوو خویان هەڵاتوون و ڕایانکردۆتە ناو منەزمەو سەرا بۆ بەرگریکردن، ئاپۆرای جەماوەریش بە سەرجەم چینە جۆربەجۆرەکان لە ناو بازاڕ و قەڵات کۆبوونەوە و هوتافیان دژی حکومەت کێشاوە. بەوتنەوەی:"هێزی گەل لەبن نایە شەهید بوون دکتۆرایە، الجنود اخواننا و الفاشیون اعدائنا، ئەم دینارە بەوردە سەدام قۆندەرەی کوردە"، خەڵکیان هانداوەو جۆشی جەماوەریان داوە.[2]

هەر لە سەرەتای خۆپیشاندانەکاندا ئافرەت بە شێوەیەکی بەرچاو بەشداریان کردووە، سعادەت عەباس مەمەند ئاماژە بەوە دەکات هەر بەیانیەکەی کە گوێبیستی هەواڵی خۆپیشاندان بووە ڕوویکردۆتە ناوەندیی کچانی ڕانیە و بانگی خوێندکار و مامۆستاکانی کردووە و پێشڕەویکردوون بەرەو گۆڕەپانی خۆپیشاندان، جگە لە خوێندکارە کچ و مامۆستا ئافرەتەکان کۆمەڵێک ژنی ماڵەوەش چوونە ناو ئاپۆرای جەماوەرە، بە درێژایی خۆپیشاندانەکانی ڕانیە ئافرەت ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە هەموو چالاکیەکان، وتار و دروشمیان بە مایکرۆفۆن خوێندۆتەوە، یەکێک لە هۆنراوەکان کە کچان وتویانەتەوە ئەم پارچە شیعرە بووە:" تاکچی چواردە ساڵ بۆ زیندان نەبرێ، پرچە جوانەکەی دەستکەنە نەکرێ، ڕزگاری نابێت ئەم کوردستانە، تێدا دەرناچێت سوپای بێگانە" بەشێک لەو ئافرەتانەی بەشداریان کردووە دواتر ڕووبەڕووی لێپرسینەوە و سزادان بوونەتەوە.[3] لە (١٩٨٢/٥/٢) هێزەکانی ڕژێم بەتانک و ناقیلەی ئەشخاس چوونە ناو بازاڕ بۆ ترساندنی خۆپیشاندەران، دواتر خۆپیشاندان توند وتیژی لێکەوتەوەو سەرەتا چەند کەسێک بریندار بوون، لەوانە (دەرسیم عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵا ڕەش)، توندوتیژیەکان درێژەی هەبووە لە فولکەی ناوەڕاستی ڕانیە و بە هۆی دەستڕێژی

---

دەستکردن بە خۆپیشاندان، بەلام ئەوان وتویانە ئیمە لە ئێستادا ئامادەی خۆپیشاندان نین، دواتر بەناچاری هاتونە ناو خۆپیشاندانەکە و دەستیان کردووە بە خۆپیشاندان. چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدوڵڵا عەبدولرەحمان مستەفا (ڕەش): ٢٠١٦/٣/٢٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٥ ڕانیەیە و تاقۆناغی ناوەندی خوێندووە لە ڕاپەڕینی ١٩٨٢ بریندار بووە، ئێستا ئەندامی (پدک).

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئاکۆ عەباس مامەند: ٢٠١٦/١/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٥٧ لە سەرکەپکانی نزیک ڕانیە لە دایک بووە، ١٩٨٦ بۆتە ڕاوێژکاری فەوجی سوکی١٣٢ حکومەت، لە سلّی ١٩٩٠ بە تۆمەتی هاوکاری پێشمەرگە ١١ مانگ زیندانی کراوە ئێستا کاری ئازاد دەکات.

[2] ڕێبوار: ڕاپەڕینی ١٩٨٢/٥/٢ ڕانیە، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٨٤)، ١٩٩٢/٥/٥، ل٤.

[3] چاوپێکەوتن لەگەڵ سعادەت عەباس مەمەند: ٢٠١٦/١/١٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٦ ڕانیەیە، یەکێک بووە لە چالاکوانی خۆپیشاندانەکان، ئێستا ئافرەتی ماڵەوەیە؛ درەخشان میرزا محەمەد، ٢٠١٦/١/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٥ ڕانیەیە، یەکێک بووە لە چالاکوانی خۆپیشاندانەکان ئێستا فەرمانبەری بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی ڕانیەیە.

هـەرەمەکیـەوە دووکـەس بـەناوەکانی (بابـەکر محـەمـەد حەسـەن و عەبـدوڵڵا پیرۆت) کـوژراون، دواتـر کوژراوەکان لە سەرشانی خۆپیشاندەران بە ناوشاردا گێڕدراون بە مەبەستی جۆشدانی جـەماوەر، لـە سەر گازینۆی قولـە بـە هۆی فشـاری خۆپیشـاندەرانەوە جارێکی تـر پیاوانی ڕژێم تەقـەیانکردووە و چەند کەسێکی تر بریندارکراون کە ئافرەتیشیان تیدابووە لەوانە (مەریوان فەتاح، قادر سدیق، سـەیران کاکەمین، کەژاڵ ئیبراهیم)، بریندارەکان براونە نەخۆشخانەی گشتی ڕانیـە و نەخۆشـخانەی سـەربازی لەوێ چارەسەرکراون، بەشێک لە دکتۆرەکانیش ڕۆڵـی باشـیان هـەبووە لـە چارەسـەری بریندارەکان، هەرچەنـدە بەرپرسـی پـۆلیس و قائیمقـام هـەوڵی میانڕەوییـان دەدا، بـەڵام دۆخەکـە سـات دوای سـات گـرژی و ئاڵۆزییـەکانی زیـادی کـردوە، دکتـۆر لـەتیف مـەحمود کـە پزیشـکی ڤێتەنـەری بـووە وەک کەسایەتیەک لە شارەکە ڕۆڵی باشی بینیوە لە ئاراستەکردنی خۆپیشاندەران، دواتر ئاپۆڕای جـەماوەر بەرەو ئۆردوگای ڕانیە ڕۆیشـتووە خـەڵکی ئۆردوگـای ڕانیـەش چوونەتـە نـاو خۆپیشـاندەرانەوە، دوای فراوان بونی خۆپیشاندانەکان جارێکی تر توندو تیژی ڕویداوە، کەسیک بە ناوی (ئیسماعیل مـام کـاک) کـوژراوە کۆمـەڵێک کەسـی تـریش برینـداربوون وەک: (سـابیر مـەحمود، ئیسـماعیل مـەحمود، پیـرۆت عەزیز فەتحوڵا).[1] خۆپیشاندان تا ئێوارە بەردەوام بووە، ئێوارەی ئەو ڕۆژە تاکو بەرە بـەیان زۆرێـک لـە خەڵکەکـە نەخـەوتوون، حکومـەتیش وەک سـزادان کارەبـای شـاری بڕیـوە، بۆسـبەی (١٩٨٢/٥/٣) بەئامادە بوونی (١٥) هەزار کەس بە دروشم ولافیتە بە بەردەم منەزەمـە، تـەرمی کوژراوەکـان بـەرەو گۆڕسـتانی کێـوەڕەش بـردووە، لـەوێش دەسـتکراوە بـە خوێندنـەوەی وتـار وشـیعر، بـە شـێک لـە شیعرەکان لەلایەن (ئەحمەد شێواو)ی شـاعیری میللـی ڕانیـە خوێندراوەتـەوە، دواتـر لەسـەر گۆڕسـتان هەواڵی ئەوە هاتووە کە ملازم موحسین لـە سلێمانیەوە هـاتووە بـەرەو ڕانیـە کـە بـە ئەفسـەرێکی دژە کورد و توندوتیژ ناسرا بوو.[2]

دواجـار لـە ئێـوارەی (١٩٨٢/٥/٣) حکومـەت هانـای بـۆ چەنـد کەسـایەتیەکی نـاو ڕانیـە بـردووە بەمەبەسـتی کۆتـایی هێنـان بـە خۆپیشـاندانەکان و گفتوگۆ لەگـەڵیان، بۆ ئـەو مەبەسـتە کەسـایەتیەکان کاتژمێر (٩) شەو سەردانی مزگەوتی گەورەی ڕانیەیان کردووە لەوێ چاویان بە (خەسرەو قـادر و د. لەتیف مەحمود ئەحمەد) کەوتووە،ئەوانیش کۆمـەڵێک داوکاریـان داوە بـە حکومـەت وەک (ئازادکردنی گیراوەکـان، گـەڕانـەوەی هاوڵاتیـە ڕاگوێزراوەکـان، نەهێشـتنی سـتەم لـە سـەر جـەمـاور و سـزانەدانی هاوڵاتیان)، بەڵام حکومەت گوێی بە داواکاریەکان نەداوە بۆ بەیانیەکـەی دووبـارە دەسـتی کـردەوە بـە توندوتیژی، دەستگیرکردن.[3] لە شـەوی (٤-٥/٥) چەنـد مەفرەزەیـەکی (ینک) بـە ڕابەرایـەتی (مامۆسـتا

[1] سەلام حەوێز بەرید: زایەڵەی ڕانیە، ل١٩-٢٠.؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ سالار فەتاح بابەکر: ٢٠١٦/١/٢٣.

[2] نیازی حەمە عەزیز: نەعرەتـەی بیتوێن، ڕاپـەڕینی ٣/٥ پێنجی ئـازاری ١٩٩١، بێ شـوێن و جێگـای چـاپ، ١٩٩٢، ل٨؛ کاوە عبدالرحمان فاتحی: یادێک لە شاعیری میلی ئەحمەد شێواو، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(١٥)، ئازاری ٢٠٠٦، ل٤٦.

[3] ئاراس عەبدولرەحمان مستەفا: خۆپیشـاندان و ڕاپەڕینـەکانی باشـوری کوردسـتان لـە سـالانی(١٩٧٥-١٩٨٨)، نامـەی دکتۆرا(بلاونەکراوە)، فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەلایەتیەکان، زانکۆی کۆیە، ٢٠١٣، ل١١٢.

عەزیز سەرسپی، د.شالاو، د.مشیر، سوارە عەباس مەمەند، پێشڕەو سەید ئیبراهیم، عەزیز بەگ، عومەر حەمەد وسوو) دابەزیونەتە ناو ڕانیە، هەر ئەو شەوە پێشڕەو سەید ئیبراهیم لە مایکرۆفۆنی مزگەوتی گەورەی ڕانیەوە بە زمانی عەرەبی وتارێکی خوێندۆتەوە و هەڕەشەیان لە حکومەتی بەعس و ملازم موحسین کردووە، دواتر کۆمەڵێک چالاکی سەربازیان لە ڕانیە ئەنجامداوە و بۆ بەیانی ملازم موحسین بەناچاری ڕانیەی بەجێهێشتووە.[١]

ڕاپەرینی (١٩٨٢)ی ڕانیە بە کوژرانی (٣) هاولاتی و بریندار بوونی (١٥)ی تر کۆتایی هاتووە و حکومەت دوای ڕاپەڕینەکە دەستی کردووە بەگرتنی چالاکوانەکان و سزادانیان.[٢] بەهۆی گەورەیی قەبارەی ڕاپەڕینەکە (فاضل براک) بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عیراق چۆتە چوارقورنەو چاوی بە کۆمەڵێک لە سەرۆک فەوج و مستەشارەکان کەوتووە و بۆ هێمن کردنەوەی دۆخەکە سەرجەم گیراوەکانیان ئازاد کردووە،[٣] دواتر لە ڕۆژی (١٩٨٢/٦/١١) لە ناحیەی چوارقورنە، بەبۆنەی چل ڕۆژ تێپەڕبوون بەسەر قوربانیانی ڕانیە، ویستوویانە چەند چالاکیەک ئەنجامبدرێ لە لایەن (عەبدول حەمید عبدلله و خەسرەو قادر و محەمەد ئیبراهیم) دەست بە ئامادەسازی کراوە بۆ ئەم کارە، لەکاتی پۆستەر هەڵواسین لەلایەن عەبدولحەمید عەبدوڵلا و محەمەد ئیبراهیم، هەست بەکارەکانیان دەکرێت و بەدەستڕێژی گولە محەمەد ئیبراهیم علی دەکوژرێت، کە پیشەی مامۆستا بووە،[٤] هەر لە هەمانساڵدا لە ڕۆژی (١٩٨٢/٩/٦) بە بۆنەی یادی ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی، خوێندکارانی ناوەندی وئامادەیی ڕانیە مانگرتن و خۆپیشاندانیان ڕاگەیاندووە و حکومەت لە ترسی پەرەسەندنی ناقیلەو هێزی سەربازی بۆ بلاوەکردنیان بەکار هێناوەو کۆتایی بە خۆپیشاندانەکە هێناوە،[٥] ڕاپەڕینی (١٩٨٢)ی شارەکان بە هۆی نەبوونی پشتیوانی و شەڕی ناوخۆی هێزە کوردیەکان، وەک پێویست پشتیوانی نەکراون و کورد دەرفەتێکی گەورەی لە دەستداوە.[٦]

لە (١٩٨٣/٣/٢١) دوای ئاگرکردنەوەی نەورۆز خەڵکی ڕانیە بڕیاریانداوە کە دوکان و بازاڕ دابخەن جەماوەرێکی زۆر لە ناو بازاڕ و بەردەم مزگەوتی ڕانیە کۆبوونەوە بەدەم وتنەوەی سرودی نەورۆز و ئەی ڕەقیب دەستیان داوەتە خۆپیشاندان، هێزەکانی حکومەت بە پاڵپشتی ناقیلە و سەرباز

---

[١] چاو پێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سوارە عەباس مامەند: ٢٠١٦/١/٢١؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر حەمەد وسوو، ٢٠١٦/١/٢٧.

[٢] خەسرەو مام قادر: سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئاکۆ عەباس مامەند: ٢٠١٦/١/٢٤.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عبدولحەمید عەبدوڵلا میرزا: ٢٠١٦/١/٢٥، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٥٥ لە میرزا ڕۆستەمە لەدایک بووە و خاوەنی دوو بڕوانامەی بەکالوریۆسە(ئینگلیزی، کشتوکاڵ)، ١٩٧٦ساڵی بۆتە ڕێکخستنی (ینک)، ئێستا بەڕێوبەری ئیدارەی ڕاپەڕینە لە ڕانیە.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مستەفا سەلیم ئەحمەد، ٢٠١٦/١/٢١، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٠ ڕانیە و دەرچووی زانکۆیە بەکالۆریۆسی لە مێژوودا هەیە، ئێستا بەرپرسی مەکۆی بزوتنەوەی گۆڕانە لە ڕانیە.

[٦] حیکمەت محەمەد کەریم(مەلا بەختیار): شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکاریەکانی سەردەم،چ٣، هەولێر، ١٩٩٤، ل٨.

ویستویانە بەزۆر بڵاوە بە خۆپشاندانەکە بکەن، قفڵی دوکانەکانیان شکاندووە خەڵک بە ووتنەوەی "سەربازانی سەدام قفڵ و دەرابە شکێنن"، درێژەیان بە خۆپیشاندان داوە و دواتر هێزێکی تر لە ئاسایش و پۆلیس و هێزەکانی تر بەسەرپەرشتی جێنشینی ڕانیە بە زەبری چەک و تەقەکردن بڵاوەیان بەو خۆپیشاندانە کردوە.[1] لە (١٩٨٣/١٢/٢١)بە هۆی بڵاوبونەوەی دەنگۆی ڕێککەوتنی نێوان (ینک) و حکومەتی بەعس،[2] کۆمەڵێک خوێندکاری سەربەو حزبە و کۆمەڵێک خوێندکاری تر لە ناوەندی ڕانیەی کوڕان پێکهاتبوو لە (مستەفا ئەحمەد سەعید، توانا جەلال حەمەد، مەعروف سادق، بەختیار حسێن، ...هتد)، لە سەر قولە بەدەم وتنەوەی شیعرەکانی مامۆستا هێمن موکریانی و ئەحمەد شێواوی شاعیری میللی ڕانیە دەستیان بە خۆپیشاندان کردووە، پاشان بەرەو ناو بازاڕ چوون لە ناو بازاڕیش کۆمەڵێک گەنج کە ڕێکخستی (ینک) بوون لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی تر بە خۆپیشاندان ڕۆیشتن بەرەو ئامادەیی ڕانیە، ئەو ڕۆژە لەسەر داواکاری جێنشینی ڕانیە کۆتایی بە خۆپیشاندانەکە هێنراوە، بۆ سبەی واتا (١٩٨٣/١٢/٢٢) جەماوەر و خەڵکێکی زۆر لەبەردەم ئامادەیی ڕانیە کۆدەبنەوە بەمەبەستی خۆپیشاندان، لێپرسراوی مونەزەمەی ڕانیە (سامی مەحمود) دەچێت بۆ بڵاوەپێکردنیان و لەوێ تەقە لە خوێندکارێک دەکات بەناوی (جەلال حەمەد قادر)[3] برینداری دەکات و دواتر بەبرینداری دەکوژرێت، بەم کارەش هێندەی تر جەماوەری ڕانیە توڕەدەکات و سێ ڕۆژ لەسەر یەک دەستدەکەن بەخۆپیشاندان و تەرمی کوژراوەکە بە مەراسیمێکی گەورە بە خاک دەسپێرن.[4]

دواتر بۆ هێورکردنەوەی ئەم دۆخە نوێنەری (ینک) بەناوی حاکم شوان دەچێت بۆ ڕانیە و لەگەڵ دام و دەزگاکانی حکومەت و نوێنەری فیرقەی (٢٤) حکومەت لە چوارقوڕنە کۆبونەوە دەکات بۆ کۆتایی هێنان بە خۆپیشاندانەکان. بەم جۆرە تاساڵی (١٩٨٧) لە ڕانیە خوپیشاندانی بچووک بەشێوەی پچرپچر هەر بەردەوامی هەبووە،[5] لە (١٩٨٧/٥/١٧،١٦) بۆ هاوکاری و پشتگیری لە خۆپیشاندانەکانی شارەزور و سەیدسادق و هەڵەبجە خەڵکی ڕانیە دووکان و بازاڕ دادەخەن و دەستدەکەن بە خۆپیشاندان، بەڵام هەر زوو خۆپیشاندانی ناوچەکانی تری کوردستان سەرکوتکراو لە ڕانیەش ڕژێم دەستی کرد بە دەستگیرکردن و سزادانی ڕێکخەر و هەڵسوڕێنەری خۆپیشاندانەکان و

---

[1] ئاراس عەبدولرەحمان مستەفا: خۆپیشاندان و ڕاپەڕینەکانی باشووری کوردستان لە سالانی(١٩٧٥-١٩٨٨)، ل١٤٧.

[2] بۆ زانیاری زیاتر لە سەر دانوستانەکانی(ینک) لەگەڵ حکومەتی عێراق بڕوانە: د.سەروەر عەبدولرەحمان، د. دلێر ئەحمەد: دانوستانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ حکومەتی عێراق ١٩٨٤، هەولێر، ٢٠١١.

[3] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ڕوژی شەهیدبوونی بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٤).

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەل مستەفا ئەحمەد سەعید: ٢٠١٦/١/٢٥، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٦٩ لە ڕانیە لە دایک بووە، ئەوکات خوێندکاری ناوەندی بووە بەهۆی ئەوەی بنەماڵەکەی حیزبی بوون لایەنگری ینک بوون، یەکێک بووە لە ڕیکخەرانی خۆپیشاندانەکانی ١٩٨٣.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەل عەلی ڕەسوڵ حەمەد (بەفر فرۆش): ٢٠١٦/١/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٣ ڕانیە، لە ساڵی ١٩٧٨-١٩٩١ ڕێکخستنی نهینی (ینک) بووە لە ڕانیە لە ساڵانی ١٩٨٩-١٩٩١ زیندانی سیاسی بوووە، ئێستا پیشەی فەرمانبەرە.

ژمارەیەکی زۆری لێدەستگیرکردن و دوای هەفتەیەک لە ئەشکەنجەدان و ئازاردانیان لە ژێرفشاری جەماوەر ئازادکراون و کۆتایی بە خۆپیشاندانەکان هاتووە.[١]

لە ساڵی (١٩٨٨) لەکاتی شەڕو وەستانی شەڕی نێوان عیراق و ئێراندا، حکومەتی عیراق لە ناوخۆی وڵاتدا دەستی کرد بە ئەنجامدانی شاڵاوی ئەنفال و کیمیابارانکردنی کوردەکان و سەرکوتکردنی ڕاپەڕین و هێزە نەیارەکانی لە باشووری عیراق، بەمەش جگە لەو زەرەرو زیانانەی کە لە شەڕی (عیراق- ئێران) بەری کەوتبوو، لە ماوەی ساڵانی (١٩٨٨-١٩٩١) چەند کارێکی ئەنجامدا هێندەی تر بووە هۆی لاوازکردنی، لەوانە هەڵگیرسانی شەڕی کەنداوی دووەم، کە تیایدا کوێتی داگیرکرد، دواتر لە لایەن هێزی هاوپەیمانی نێودەوڵەتی گورزی کوشندەی لێدرا و تووشی داڕمانێکی سیاسی و سەربازی و ئابووری گەورە هات. هەر لەم ماوەیەدا یەکێتیی سوڤیەت تووشی ڕووخان هات و تا دەهات گەلەکۆمەکی وڵاتانی عەرەبی دژ بە عێراق زیادی دەکرد، ئەم لاوازیەش لە ناوخۆی عیراق سودی لێوەرگیراو لە مانگی (٢) بۆ (١٩٩١/٣/٣) لە ناوچەکانی باشوری عیراق دەستیانکرد بە ڕاپەڕین دژی حکومەت، هەرچەندە دواتر سەرکوتکران، لە ناوچە کوردیەکانیش دەست بە جموجۆڵ کرا، شاری ڕانیەش کەوتە ناو جموجۆلی حزبە سیاسیە کوردستانییەکان[٢] کە لە ناو شار و دەوروبەری دەستیان کردبوو بە چالاکی.[٣]

لە ناو ڕانیە هەریەک لە حزب و ڕێکخراوەکانی وەک: (یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، حزبی شیوعی عێراق (هەرێمی کوردستان)، حزبی سۆسیالیستی کوردستان، بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، ئالای شۆڕش، ڕەوتی کۆمۆنیست کە ڕێکخراوێکی مارکسی عیراقی بووە، ڕێکخراوی دەستەی ڕاپەڕین، کە جوڵانەوەیەکی چەپی کوردستانی) بوو، دەستیان کردبوو بە ئامادەسازی و خۆرێکخستنەوە بە مەبەستی ئەنجامدانی ڕاپەڕین،[٤] لە ڕۆژی (١٩٩١/٣/٥) ڕاپەڕین لە ڕانیە دژی حکومەتی بەعس بەرپابوو و دواتر هەموو ناوچەکانی تری باشوری کوردستانی گرتەوە.[٥]

---

[١] نیازی حەمە عەزیز: نەعرەتەی بیتوێن، ل١٦.

[٢] عەبدولڕەزاق مەرزنگ: ڕاپەڕین و بەهاری ئازادی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٥٢-٦٢.

[٣] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەسعود عبدالخالق: ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان (ڕەوتیان، ئایدۆلۆژیان، هەڵسەنگاندنیان)، چ٢، هەولێر، ٢٠١٤.

[٤] سەلام حەوێز ئیسماعیل: سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨-١٩٠؛ عەبدولڕەزاق مەرزنگ: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٧.

[٥] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ڕاپەڕینی ١٩٩١/٣/٥ ڕانیە بڕوانە: ئاراس عبدولرەحمان: ڕاپەڕینی ئاداری ١٩٩١ لە باشوری کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٩.

# بەشی دووەم
# بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ڕانیە
# (١٩٩١-١٩٥٨)

باسی یەکەم: باری ئاوەدانی و هەلومەرجی دیمۆگرافی و پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی ناوچەکە
باسی دووەم: پێکهاتەی چینە کۆمەڵایەتیەکان و هۆزەکان لە ڕانیە
باسی سێیەم: کلتوور و دابونەریتی ناوچەکە
باسی چوارەم: بارودۆخی خوێندن و تەندروستی
باسی پێنجەم: بارودۆخی ڕۆشنبیری ڕانیە

## بەشی دووەم :بارودۆخی کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری ڕانیە (١٩٥٨-١٩٩١)

### باسی یەکەم/ باری ئاوەدانی و هەلومەرجی دیمۆگرافی و پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی ناوچەکە

بەشێوەیەکی گشتی شارە کوردییەکان لە لایەن سیستەمی دەربەگایەتیەوە دامەزراون، بۆ دروستبوونی شار ئەوەندە بەس بووە، کە کەسێکی دەسەڵاتدار کۆشکێک و شوێنێکی خواپەستی لەم شوێنە دروست بکات بە لەبەرچاوگرتنی نزیکی لە ئاو و زەوی سروشتی و لایەنی قایمکاری و بەرگریکردن.[١] سەرەڕای ئەوەی دانیشتوانی شارە کوردیەکان هەمان تایبەتمەندی داب و نەریتی گوند و هۆزیان هەیە و لێکچوونی زۆر لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام نابێت ئەوەش پشتگوێ بخرێت کە شار قەرەباڵغترە و سروشتی لەگەڵ گوند جیاوازە، تا شار بچووکتربێت نەریتی لەگەڵ گوند نزیکترە.[٢]

ڕانیە لەماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) بریتی بووە لە (١١) گەڕەک (قەلات، ڕەشەمێرگ، سەرا، گڵێنجان، قولە، کێوەڕەش، مامۆستایان، شەهیدان، ئازادی، سەیداوا و ئۆردوگا)، خاوەنی چەند سەرچاوەیەکی ئاویی کانیی سروشتی بووە، وەک (سەرچاوەی ڕەشەمێرگ، قولە، کوێرەکانی، کانی مەلا سلێمان، قەلات) بوونی ئەم سەرچاوە ئاویانە وای کردووە هەر لە کۆنەوە ببێتە شوێنی کۆبونەوە و نیشتەجێبوونی دانیشتوان،[٣] لەڕووی سیمای ژیاری و شارستانیەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست بەدواوە لە ڕانیە نەخۆشخانە و خوێندنگە، خزمەتگوزارییەکانی وەک ئاو و کارەبا و تەلەفون لە گەڕەکەکانی شاردا بوونی هەبووە، دامەزراوە کارگێڕییەکان بەپێی گۆڕانکارییەکانی سەردەم بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەیان کردووە، بازاڕی گەورەی هەمەجۆر و گازینۆ و چاخانەو چێشتخانەو خواردنگەی لێکراوەتەوە. دروستبونی باخی گشتی ڕانیە لە ساڵی(١٩٥٧)دا و دروست بوونی گەرماوەکانی وەک (قولە و قەلات و شارەوانی لە گەڕەکی گڵێنجان) بۆ ژنان وپیاوان، کردنەوەی ئوتێلەکانی وەک: (یونس شەهاب، ڕانیە، ئەنوەر)، دروستبوونی تەکیەی شێخ مستەفای باقڵان لەپەنجاو شەستەکانی سەدەی بیستەم، بونی هەندێک ئارامگە(گۆڕستان)ی ڕێکخراو وەک گۆڕستانی (سەید عەلی، سەیداوا، کونەسێ) هێندەی تر تایبەتمەندیی بنەماکانی شاری پێبەخشیوە، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نەبووە بووبێتە شارێکی تەواو و لە سیماکانی گوند ڕزگاری بووبێت،[٤] لە

---

[١] د. بەدرخان سندی: کۆمەڵگای کوردی لەدیدی ڕۆژهەڵاتناساندا، و: د. ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٨، ل ٥٦٤.

[٢] هادي رشيد الجاوشلي: الحياة الاجتماعية فى كردستان، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٧٠، ص٦٥.

[٣] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار، بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی ڕانیە، بەشی نەخشەی بنەڕەتی، ٢٠١٦/٣/١.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خەیروڵا عەبدوڵلا عەبدوڵلا: ٢٠١٦/٣/٩، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٥٠ لە ڕانیە لە دایک بووە تا قۆناغی ئامادەیی خوێندووە، بەڕێوەبەری فەرمانگەی تاپۆی ڕانیە بووە، ئێستا فەرمانبەری خانەنشینە.

ڕووی خانوو و بیناکارییەوە لە پێش ساڵی (١٩٦٠) جگە لە هەندێک بینای حکومی وەک بینای سەرا، دادگا، نەخۆشخانە، کە چیمەنتۆ بوون، زۆربەی خانوەکانی تری ناو شار بە خشتی قوڕ بەشێوەی سواغ دروستکرابوون لە شێوەی دوو ژوور و سێ ژوور، دواتر گەچ پەیدابووە، لە ساڵی (١٩٦٥) بلۆک و چیمەنتۆ پەیدابووە، بەڵام سادە بووە بە دەست دروست کراوە لە ساڵی (١٩٧٠) خانووی کۆنکرێت و چیمەنتۆ پەیدا بووە، لە دوای ساڵی (١٩٧٥) و بەشێوەیەکی باش گەشەی کردووە و تا ڕادەیەک شێوازی ئەندازیارییان تێدا بەکارهاتووە، خانووەکانیش زیاتر لەسەر شێوازی ڕۆژهەڵاتی دروستدکراون.[1] ڕانیە ناوچەیەکی دابڕاو نەبووە لەگەڵ دەوروبەری، گۆڕانکارییەکان و پێشکەوتنەکان کاریگەرییان لە سەر ناوچەکە هەبووە، لە دوای ساڵی (١٩٥٠) ئۆتۆمبێلی کەسی هێنراوەتە ناوچەکە، ئەمە جگە لەوەی ئۆتۆمبێلی نەفەر هەڵگر لە نێوان ڕانیە و سلێمانی و قەڵادزێ هەبووە، هەر لە ساڵانی پەنجاکاندا ئامێری ڕادیۆ و کامێرای فۆتۆگرافی، دواتریش ئامێری تەلەفزیۆن لە جۆری ڕەش و سپی بەشێوەیەکی کەم لە هەندێک ماڵ و بەشێک لە چایخانەکانی ڕانیە پەیدابووە، لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی بیستەم ڕێگاکانی ڕانیە و دەوروبەری قیرتاوکراون، کە بۆتە پاڵنەرێکی باش بۆ تێکەڵبوون و کار ئاسانی هاتوچۆی هاوڵاتیان.[2]

لە ڕانیە کۆمەڵێک دیوەخانی گەورە و بچووک هەبووە، کە بەشێوەیەکی جیاواز دابەش ببوون، لەوانە دیوەخانی عەباسی مامەند ئاغا و کوڕەکانی لە گەڕەکی ئازادی و سەرکەپکانی نزیک ڕانیە، دیوەخانەکانی عەلی قادر ئەحمەد ناسراو بە عەلی بەگ و سابیری کوێخا کەریم و حاجی ئەحمەد سەلکە لە گەڕەکی قەڵات، دیوەخانی حاجی خدر شاوری لە گەڕەکی ڕەشەمێرگ،[3] شێخەکانی سەیداواش خاوەن دیوەخان بوون، شێخ حوسێنی بۆسکێنیش لە گوندی بۆسکێنی نزیک ڕانیە دیوەخانێکی گەورەی هەبووە، ئەم دیوەخانانە ڕوویەکی شارستانی و ئاوەدانییان بە ناوچەکە بەخشیوە و شوێنێک بوون بۆ مانەوە و کۆبوونەوەی خەڵک لە قۆناغە جیاجیاکاندا.[4]

لە ڕانیە و ناوچەی ڕانیە کۆمەڵێک چاک و پیر هەیە، وەک (سەید عەلی، چاکە چکۆل، پیاوچاکی تیتوکە، بەستە هیزە، ئەندێک و ئەنگوز، سەیدە فەقیرە، شێخ پیرس)، کە وەک کەسایەتی ئایینی پیرۆز

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عوسمان عەبدوڵڵا ڕەسوڵ: ٢٠١٦/٣/٢، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٥٧ لە ڕانیە لە دایک بووە، دەرچووی زانکۆی سلێمانی کۆلێژی ئەندازیارییە، ئێستا فەرمانبەرە لە ئیدارەی ڕاپەڕین.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فاروق فاتیح عەبدول حەمید عەسکەری: ٢٠١٦/٣/٢٦، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٤٩ لە ڕانیە لە دایک بووە شارەزاییەکی باشی هەیە لە سەر مێژووی ڕانیە بەشێوەی تۆماری کەسی، دەرچووی ئامادەییە، ئێستا فەرمانبەرەری خانەنشینە.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەلی خدر حەمەد ناسراو بە ئاڵی نفوس: ٢٠١٦/٣/٧، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٥٥ لە ڕانیە لە دایک بووە دەرچووی ئامادەییە، شارەزایی باشی هەیە لە سەر لایەنی کۆمەلایەتی و گەشەی دانیشتوان، ئێستا فەرمانبەرە لە دادگای بەرایی ڕانیە.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئازاد جونەید ڕەزا: ٢٠١٦/٣/٤، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٦٥ لە ڕانیە لە دایک بووە دەرچووی ئامادەییە، ئێستا لێپرسراوی سەندیکای کرێکارانی ڕانیەیە.

سـەیرکراون، تایبەتمـەندی باشـیان بـە ناوچەکـە بەخشـیوە بـە سـەردانیکردن و ناسـاندنی ناوچەکـە و ئالوگۆڕی هاوڵاتیـان.[1] بـە هـۆی ئـەوەی زۆرینـەی خـەڵکی ڕانیـە سـەر بـە ئایینی ئیسـلامن، مزگـەوت ڕۆڵێکی گرنگی بینیووە لە ڕوی ئاوەدانی و کۆبونەوەی خـەڵک، لـە ڕووی تـەلارسازیشـەوە سیمایەکی تایبەتی بە شار بەخشیوە، وەک نەریتی زۆرێک لە ناوچە کوردییەکان، لەگەڵ دروست بوونی شار و نیشتەجێبوونی هاوڵاتیان وەک سەرەتا کار هەوڵ بۆ دروسـتکردنی مزگـەوت دراوە، ئـەم دیاردەیـەش بە ڕوونی لە ڕانیە دا هەستی پێدەکرێت، مزگەوتی گەورەی ڕانیەش وەک یەکەم مزگـەوتی ئـەم شـارە گەواهیدەری ئـەم بۆچونەیـەو بـە پێوەرەکانی نیشـتەجێبوون، بـە بۆچـونی زۆرێـک لـە هاوڵاتیـان ئـەم مزگەوتـە مێژوویـەکی کۆنی هەیـە و بەدەسـتپێکی ئاوەدانی و بیناکاری دا دەنرێت لـە شـارەکەدا، لـە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) کۆمـەڵێک مزگـەوت لـە ڕانیـە دروسـتکراون. لـە خشـتەی (١) دا مێژووی دروسـتبوون و نـاوی مزگـەوت و شـوێنی جوگرافیـان بـە پێـی دابـەش بـوون بەسـەر گـەڕەکـەکان خراوەتەڕوو:

**خشتەی (١) ناوی مزگەوتەکانی رانیە و بەرواری دروستکردنیان لە ماوەی نێوان (١٩٥٨- ١٩٩١) دا**

| ژ | ناوی مزگەوت | ساڵی دروستبوون | شوێن |
|---|---|---|---|
| ١ | گەورەی ڕانیە | مێژووەکەی نەزانراوە | گەڕەکی قەڵات- ناوبازاڕ |
| ٢ | سەیدە فەقیرە | مێژووەکەی نەزانراوە | گەڕەکی سەیداوا |
| ٣ | ڕەشەمێرگ | ١٩٥٨ | ڕەشەمێرگ |
| ٤ | شێخ مستەفا باقڵان | ١٩٦٥ | سەرا |
| ٥ | سەید قادر | ١٩٧١ | قولە |
| ٦ | کێوەڕەش | ١٩٧٩ | کێوەڕەش |
| ٧ | حاجی فەیسەڵ | ١٩٧٩-١٩٨٠ | گڵێنجان |
| ٨ | گەورەی ئۆردوگا | ١٩٧٩-١٩٨٠ | ئۆردوگای ڕانیە |
| ٩ | مەلا محەمەد ڕەسوڵ | ١٩٧٩-١٩٨٠ | ئۆردوگای ڕانیە |
| ١٠ | خەدیجە خاتون | ١٩٨٠ | شەهیدان |
| ١١ | عەبدوڵڵا خەسرەو | ١٩٨٠ | گڵێنجان |
| ١٢ | ناجیە خان | ١٩٨٠-١٩٨١ | قەڵات-ناوبازاڕ |
| ١٣ | ئازادی | ١٩٨٣ | ئازادی |
| ١٤ | نەورەسی | ١٩٨٤ | قولە |
| ١٥ | حاجی خدر چنارنەیی | ١٩٨٧ | قولە |
| ١٦ | حاجی مینە | ١٩٨٧ | ئازادی |
| ١٧ | حاجی ئیسماعیل عەوداڵان | ١٩٨٨ | کێوەڕەش |
| ١٨ | هەمزا ئاغا | ١٩٩٠ | کێوەڕەش |

سەرچاوە: بەدواداچوونی مەیدانی توێژەر بۆ مزگەوتەکانی ڕانیە، لە ڕۆژانی ٩-١٠/٣/٢٠١٦.

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر حسێن ئەحمەد، ناسراو بە مەلا خدر هەرتـەلی: ٢٠١٦/٣/٥، ڕانیـە، نـاوبراو لـە ١٩٣٠ لـە گونـدی هەرتـەل لـە دایک بـووە دەرچـووی خانـەی مامۆسـتایانە، لـە چلـەکانی سـەدەی بیسـتەمەوە لـە ڕانیـە نیشتەجێیە، ئێستا مامۆستای خانەنشینە.

له ڕووی پێکهاتەی نەتەوەیەوە دانیشتووانی باشوری کوردستان، لەگەڵ کورد چەند گروپێکی نەتەوەیی دیکەش پێکهاتوون وەک (هیندۆئەوروپی، سامی، تورک، ئەرمەن)، بەڵام بە هۆی ئەوەی لە سەرژمێری و تۆمارەکاندا، زمان کراوەتە پێوەر بۆ دەستنیشان کردنی شوناسی نەتەوەیی، شێواویەکی زۆر ڕوویداوە لە دیاریکردنی پێکهاتەی نەتەوەیی لە ناوچەکاندا.[١] لەگەڵ ئەوەشدا ڕانیە ناوچەیەکی کوردنشینە، جگە لەکورد زۆر بە دەگمەن نەتەوەی تر لە ڕانیە نیشتەجێ بووە، ئەگەر هەشبوبێت لە شێوەی تاکە کەس یان خێزان بووە، کە بەهۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی یان بۆ کارکردن یان سەربازیکردن ڕوی لە ناوچەکە کردووە واتە نیشتەجێبوونەکە هەمیشەیی نەبووە، پەیوەست بووە بە کار و کاتەوە.[٢]

ڕانیە بەردەوام شوێن و پەناگەیەک بووە بۆ مانەوەی خەڵکی غەریب و ئاوارە، چەندین هاوڵاتی بە هۆکاری سیاسی یان ئیداری یان هەر هۆکارێکی تر، ڕویان کردۆتە ئەم شارۆچکەیەو تێیدا ماونەتەوەو نیشتەجێبوون وەک خەڵکی شارۆچکەکە و هاوشارییەک مامەڵەیان لەگەڵ کردوون و ڕێزیان لێگیراوە، ئیدیۆمێکی باو هەیە دەڵی: "ئاوی قولەی خواردۆتەوە"، واتا ئەوەی ئاوی ئەو شارۆچکەیەی خواردەوە هۆگری دەبێت و بە زەحمەت دەتوانێت جێی بهێڵێت.[٣] هەستی میوان دۆستی و حزمەتکردنی خەڵکانی دەرەوەی ڕانیە وای کردووە تا ساڵی (١٩٧٠) بەکرێدانی خانوو لە ڕانیەدا بەکارێکی نەشیاو سەیرکراوە، خانوو لە زۆربەی کاتدا بێبەرامبەر بەخشراوە، کەئەمە نیشانەی بە هێزی گیانی تەبایی و برایەتی و پێکەوە ژیان بووە لە ناوچەکە، ئەمە جگە لە دیاردەی سەردانیکردن و پەیوەندی پتەوی نێوان هاوسێ و هاوشاریان لەوپەڕی باشیدابووە.[٤]

له ڕووی ئاینیشەوە شوێنی جوگرافیی هەرێمی کوردستان یارمەتی دەربووە بۆ پەیدابوون و سەرهەڵدانی ئایینی جۆربەجۆر لە ناوچەکە، وەک: (زەردەشتی، جولەکە، مەسیحی، ئێزیدی، ئیسلام) کە لە ناوچەکانی کوردستان بونیان هەبووە،[٥] زۆرینەی خەڵکی ڕانیە لە ڕووی ئایینیەوە ئیسلامن و سەر بە ڕێبازی شافیعین، جگە لە ئاینی ئیسلام هەندێک ئاینی تریش لە ناو ڕانیە و ناوچەکە بوونی هەبووە، وەک ئاینی مەسیحی و جولەکە، مەسیحیەکان خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە نەبوون، فەرمانبەری حکومی بوون بە هۆی کاری ئیداری و ئیشوکارەوە کەوتونەتە ناوچەکە، بەڵام جولەکەکان[٦]

---

[١] عەبدوڵلا غەفور: ئەتنۆ- دیمۆگرافیای باشوری کوردستان، چاپخانەی ئاپێک، سوید، ١٩٩٥، ل٣٣.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ موەفەق حەمە مەجید: ٢٠١٦/٣/١.

[٣] هەرێم: ئاوی قولە، گۆڤاری ڕانیە، ژ(٥)، ئابی ٢٠٠٣، ل٤٧.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد سەلیم سەعید: ٢٠١٦/٣/٢٣، ڕانیە، ناوبراو ١٩٥٦، لە ڕانیە لەدایک بووە تاقۆناغی ناوەندی و خوێندنی حوجرەی خوێندووە ئێستا فەرمانبەرە لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی ڕانیە.

[٥] جەزا تۆفیق تالیب: بایەخی جیۆپۆلەتیکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٦٢.

[٦] لەپێش دروستبوونی دەولەتی ئیسرائیل، لە ڕانیەو ناوچەی ڕانیە جولەکەیەکی زۆر بوونی هەبووە، بە تایبەت لە ناوچەکانی دۆڵی خۆشناوەتی ڕانیە، بڕوانە: بەختیار محەمەدەمین عوسمان دواوەیی: جولەکەکانی کوردستان، چاپخانەی شەهاب، هەولیر، ٢٠١١.

دانیشتوان و خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بوون، لە گەڕەکی قەڵاتی ناوشار نیشتەجێبوون، تا سەرەتای پەنجاکانیش بوونیان هەبووە، بەڵام دواتر بەهۆی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە لە ڕانیە کۆچیان کردووە، ئەوانەش کە مانەوە موسڵمان بوون و پێیان وتراوە (بنە جوو).[1] لەگەڵ ئەم ئاینانەدا چەند ڕێباز و تەریقەت و بزوتنەوەی ئایینی تر لە ڕانیە و ناوچەکەدا هەبوون، هەقەکان،[2] کە لە ناوچەکانی میرزا ڕۆستەم و بنگرد و دێهاتەکانی ناوچەی بیتوێن و خەڵەکان نیشتەجێ بوون و لە ناو ڕانیەش شوێنکەوتەیان هەبووە، بە هۆی دروستکردنی بەنداوی دوکانەوە بەشێک لە ناوچەکانیان کەوتۆتە ژێرئاوەوە، بەناچاری بەسەر هەندێک ناوچەی تردا دابەش بوون،[3] شاکر فەتاح کە لە ماوەی (١٩٤٤-١٩٤٦) جێنشینی ڕانیە بووە، لە یاداشتەکانی ئاماژە بەوە دەکات کە ئاغاکانی (پشدەر و ڕانیە و کۆیە) ویستوویانە گوند و دێهاتی هەقەکان لە ناوچەی ڕانیە داگیربکەن، بەڵام ئەو ڕێگری لێکردووە و نەیهێشتوە ئەم کارە ڕووبدات.[4] وەک تەریقەتیش شێخ و سەیدەکانی ڕانیە کە بەشێکیان لە سەیداوا و بەشێکی تریان لە گەڕەکی سەرا نیشتەجێبوون، شێخەکانی نەوەی شێخ قادری سندۆڵانی پشدەرن، لە کۆنەوە کەوتونەتە ڕانیە و گوندی بۆسکێنی نزیک ڕانیە، سەر بەتەریقەتی قادرین و لە هەندێک کاتدا دەروێش و موریدیان هەبووە، بەڵام دواتر وازیان لەم کارە هێناوە، بەڵام شێخەکانی گەڕەکی سەرا کە بە شێخی باقلان ناسراون، سەر بەتەریقەتی قادرین، تا ئێستاش بەردەوامن لەسەر کاری موریدایەتی، لە شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە بەڕابەرایەتی شێخ مستەفای باقڵان تەکیە و مزگەوت و دیوەخانیان لەگەڕەکی سەرای ڕانیە دروستکردووە و خاوەن چەندین شوێنکەوتەن لە ڕانیە، لە ڕووی ئایینی و سیاسی و کۆمەلا یەتی ڕۆڵی بەرچاویان لە ڕانیەو ناوچەکەدا هەبووە.[5]

بەمەبەستی ڕونکردنەوە و تایبەتمەندی دیمۆگرافیای ناوچەی لێکۆڵینەوە پشت بە کۆمەڵێک سەرژمێری بەستراوە کە لە عێراقدا کراون لەوانە سەرژمێریەکانی(١٩٥٧، ١٩٧٧، ١٩٨٧)، بەپێی پێوەرەکان سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) بەباشترین سەرژمێری دادەنرێت، لە ڕووی داتا و دانپێدانانی شارەزایانی بواری ئامار، بە چاوخشاندنمان بە خشتەی (٢) دەردەکەوێت کە ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی (١٩٥٧) دا (٣٦٠٩٧) کەس بووە، ئەم ژمارەیەش تاڕادەیەک کەمتر بووە بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تر، ئەوەش بەهۆی ئەوەی هەڵکەوتەی شارۆچکەی ڕانیە ناوچەی نیمچە

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر حسێن ئەحمەد ناسراو بە مەلا خدر هەرتەلی: ٢٠١٦/٣/٥.

[2] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئاشنا بوون و تێگەیشتن لە ڕێبازی هەقەکان. بڕوانە: مستەفا عەسکەری: ئاوڕدانەوەیەک لە بزوتنەوەی هەقە، پێداچونەوەو داڕشتنەوەو پەراوێز نوسینی محەمەد مەلا کەریم، چ٢، بلاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

[3] جەمال بابان: یاداشتەکانم ئەزمونەکانی ژیانم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٨٢-١٨٣.

[4] یاداشتەکانی شاکر فەتاح: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٢.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ شێخ عەبدوڵڵا حوسێن مستەفا، ٢٠١٦/٣/٧، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٧٣ لە ڕانیە لە دایک بووە، دەرچووی ئامادەییە، ئێستا جێنشینی شێخ مستەفای باقلانە لە ڕانیە؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئازاد جونەید ڕەزا، ٢٠١٦/٣/٤.

شـاخاوییە و دوورە لەسـەنتەری سـەرەکی پارێزگاکـان، بۆیـە لـەم قۆناغـەدا خواسـتی راکێشـانی دانیشـتووانی کـەمتر بـووە، بـەهۆی ئـەوەی شـارۆچکە، کـە رێگاوبـان و خزمەتگوزارییـە گشـتی و پـەروەردەییـەکانی وەک پێویسـت تێـدا نـەبووە، بـوونی ئـەم خزمەتگوزاریانـەش بنەمایـەکی گرنگـی راکێشانی دانیشتوانن، سەرەڕای ئەمەش لە سەرەتای پەنجاکان تەواوی جولەکەکانی شاری رانیە کۆچیان کردووە بۆ وولاتی ئیسرائیل، ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان، لەگەڵ بوونی ئەمانەشدا خەڵکی ئەم ناوچەیە بۆ مەبەستی خوێندن و بازرگانی کۆچیان بۆ شارەکانی تر کردووە، ئەمە جگە لەوەی تا ئەو کات رانیە لەڕوانگەی ئاوەدانییەوە سیمای گوندیانەی پێوەدیار بووە، هۆکاری کارگێڕیش ڕۆڵی هەبووە، چونکە شارۆچکەی ڕانیە لە ساڵی (١٩٥٦) لە پارێزگای هەولێر جیاکراوەتەوەو خراوەتە سەر پارێزگای سلێمانی، زۆرترین ژمارەی دانیشتوانیش کەوتووەتە سـەنتەری شـارۆچکەکە بریتیـە بـووە لـە (١٨٧٨٣) کـەس بـەڕێـژەی (٥٢.٠٣%)ی کـۆی ژمـارەی دانیشـتوانی شـارۆچکەکە، دوای ئـەویش شـارەدێی چنـاران پلـەی دووەمـی گرتـووە، کـە ژمـارەی دانیشـتوانی گەیشـتوەتە (١٠٢١١) کـەس و بـەڕێـژەی (٢٨,٢٨ %)، دواتـریش شـارەدێـی ناودەشـت کـەمترین ژمـارەی دانیشـتوانی هەیـە، کەبریتیـە لـە (٧١٠٣) کـەس، بـەڕێـژەی (١٩,٦٧). لـەڕووی ژینگەییشەوە بە پێی خشتەی (٣)، (٣٩١٥) کەس بەڕێژەی(١٠,٨٤%)نیشتەجێی شاربوون و (٣٢١٨٢) کـەس بـەڕێـژەی (٨٩,١٥%) گوندنشـین بـوون، زیـاتر ژمـارەی دانیشـتوانەکەی ئەوانـە بـوون، کـە لەگوندەکانـەدا نیشـتەجێ بـوون، ئەمـەش بـۆ ئـەوە دەگـەڕێتـەوە کـە هەمیشـە ڕێـژەی وەچەنانـەوە لەگوندەکان بەرزترە بەبەراورد لەگەڵ شارەکان.

**خشتەی (٢) ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی (١٩٥٧)**

| ژ | یەکەی کارگێڕی | ژمارەی دانیشتوان | % |
|---|---|---|---|
| ١ | ن.سەنتەر | ١٨٧٨٣ | ٥٢.٠٣ |
| ٢ | چناران | ١٠٢١١ | ٢٨,٢٨ |
| ٣ | ناودەشت | ٧١٠٣ | ١٩,٦٧ |
| کۆ | | ٣٦٠٩٧ | ١٠٠ |

المصدر: بیان حسین علي: التحلیل الجغرافي اتجاهات النمو الحضري في محافظة السلیمانیة، أطروحة دکتوراه، (غیرمنشورة)، الکلیة العلوم الانسانیة، جامعة السلیمانیة، ٢٠٠٨، ص١٥٦.

**خشتەی (٣) دانیشتوانی قەزای ڕانیە بەپێی ژینگەی نیشتەجێبوون لەساڵی (١٩٥٧) دا**

| ژ | ژینگەیی | ژمارەی دانیشتوان | % |
|---|---|---|---|
| ١ | شارنشین | ٣٩١٥ | ١٠.٨٤ |
| ٢ | گوندنشین | ٣٢١٨٢ | ٨٩.١٥ |
| کۆ | | ٣٦٠٩٧ | ١٠٠ |

المصدر: الجمهورية العراقية وزارة التخطيط: الجهاز المركزي للاحصاء، هيئة التعداد العام للدراسات السكانية، نتائج ترقيم المباني وحصرالسكان لسنة ١٩٥٧، ص٩.

لە ڕووی دیمۆگرافیەوە ناوچەی ڕانیە لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوەکەدا گۆڕانێکی زۆر بەسەر قەبارەی دانیشتوانیدا هاتووە، زادەی هەردوو جوڵەی سروشتی و شوێنجێی بووە کەبەسەر شارۆچکەکەدا هاتووە، سەبارەت بە ڕەگەزی دانیشتوان لە شارۆچکەی ڕانیە لە ساڵی ١٩٥٧ دا کە لەخشتەی (٤)دا خراوەتەڕوو، ڕەگەزی نێر (١٨٤٨٩) کەس بەڕێژەی (٥١,٢٢%) بووە و ڕەگەزی مێ (١٧٦٠٨) کەس بەڕێژەی (٤٨,٧٧%) بووە.

**خشتەی(٤) دانیشتوانی قەزای ڕانیە بەپێی ڕەگەز لەساڵی (١٩٥٧)**

| ژ | ڕەگەز | ژمارەی دانیشتوان | % |
|---|---|---|---|
| ١ | نێر | ١٨٤٨٩ | ٥١.١٩ |
| ٢ | مێ | ١٧٦٠٨ | ٤٨.٧٧ |
| کۆ | | ٣٦٠٩٧ | %١٠٠ |

المصدر: الجمهورية العراقية وزارة التخطيط: الجهاز المركزي للاحصاء، هيئة التعداد العام للدراسات السكانية، نتائج ترقيم المباني وحصرالسكان لسنة ١٩٥٧، ص٩.

ئاشکرایە زۆرێک لە کۆمەڵگەی کوردستان پەیڕەوکەری ئایینی ئیسلام بوون، دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیەش وەک بەشێک لە هاوڵاتیانی کوردستانی عێراق لە پەیڕەوکەرانی ئاینی ئیسلام بووە، هەرچەندە وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا ڕێژەیەک لە جوولەکە هەبووە بەڵام دواتر کۆچیان کردووە بۆ ئیسرائیل. بەشێوەیەکی گشتی بوونی پێکهاتە ئاینییەکانی تر لە ڕانیە بۆ کارکردن لە دامەزراوە حکومیەکان دەگەڕێتەوە، تەنانەت هەندێکیان ماڵیان هێناوە بۆ ڕانیە وەک فەرمانبەر وپۆلیس و سەرباز، لەخشتەی (٥) دا بارودۆخی ئایینی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی (١٩٥٧) خراوەتەڕوو، بەجۆرێک (٣٦٠٥٠) کەس ئایینیان ئیسلام بووە، کە دەکاتەی ڕێژەی (%٩٩,٨٦)ی ژمارەی دانیشتوان، هەروەها هەریەک لە ئایینی مەسیحی (٤٦) کەس و ئاینی ئێزیدی (١) کەس بووە لە شارۆچکەکەدا.

**خشتەی(٥) بارودۆخی ئایینی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی (١٩٥٧)**

| ژ | ئاین | ژمارەی دانیشتوان | % |
|---|---|---|---|
| ١ | موسڵمان | ٣٦٠٥٠ | ٩٩.٨٦ |
| ٢ | مەسیحی | ٤٦ | ٠.١٢ |
| ٣ | ئێزیدی | ١ | ٠.٠٠٢ |
| کۆ | | ٣٦٠٩٧ | ١٠٠ |

المصدر: الجمهورية العراقية وزارة التخطيط: الجهاز المركزي للاحصاء، هيئة التعداد العام للدراسات السكانية، نتائج ترقيم المباني وحصرالسكان لسنة ١٩٥٧، ص١٢.

دەربارەی دابەشبوونی ژینگەیی و ڕەگەزی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە بەپێی یەکە کارگێڕییەکانی لە خشتەی (٦) دا دەردەکەوێت، شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی(١٩٧٧) دا کۆی ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەکە (٥٣٣٧٢) کەس بووە، کە سەرجەمی ژمارەی دانیشتوانی شارنشین (١٨٥٠٥) کەس بووە وە کۆی ژمارەی گوندنشین (٣٤٨٦٧) کەس بووە، بەجۆرێک بەرزترین ژمارەی دانیشتوانی شارنشین لە شارەدێی سەنتەر (٨٥٩٤) کەس بووە و کەمترین ژمارەی دانیشتوانی شارنشین لە شارەدێی (بێتواتە) بووە بەڕێژەی (٥٨٠)کەس، هەروەها بەرزترین ژمارەی دانیشتوانی گوندنشین لە شارەدێی (مەرگە) یە، کە (١٦٦١٣) کەس بووە، کەمترین ژمارەی دانیشتوانی گوندنشین لە شارەدێی سەنتەر بووە، کەتەنها (١٠)کەس بووە.

**خشتەی (٦) دابەشبوونی ژینگەیی و ڕەگەزی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە بەپێی یەکەکارگێڕیەکان لەسالی(١٩٧٧) دا**

| ژ | یەکەی کارگێڕی | شارنشین | | | گوندنشین | | | کۆ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ |
| ١ | ن.سەنتەر | ٤٤٥٨ | ٤١٣٦ | ٨٥٩٤ | ٥ | ٥ | ١٠ | ٤٤٦٣ | ٤١٤١ | 8604 |
| ٢ | مەرگە | ٨٩٥ | ٥٠٤ | ١٣٩٩ | ٩٠٠٤ | ٧٦٠٩ | ١٦٦١٣ | ٩٨٩٩ | ٨١١٣ | 18012 |
| ٣ | چوارقورنە | ٤٠٩٤ | ٣٨٣٨ | ٧٩٣٢ | ٥٢٦١ | ٤٨٠٧ | ١٠٠٦٨ | ٩٣٥٥ | ٨٦٤٥ | 18000 |
| ٤ | بێتواتە | ٢٨٧ | ٢٩٣ | ٥٨٠ | ٤١٩٢ | ٣٩٨٤ | ٨١٧٦ | ٤٤٧٩ | ٤٢٧٧ | 8756 |
| کۆ | | ٩٧٣٤ | ٨٧٧١ | ١٨٥٠٥ | ١٨٤٦٣ | ١٦٤٠٥ | ٣٤٨٦٧ | ٢٨١٩٦ | ٢٥١٧٦ | ٥٣٣٧٢ |

المصدر: الجمهورية العراقية وزارة التخطيط: الجهاز المركزي للاحصاء، هيئة التعداد العام للدراسات السكانية، نتائج ترقيم المباني وحصرالسكان لسنة ١٩٧٧، ص٣٦.

سەبارەت بە ڕەگەزی دانیشتوان، وەک لە خشتەی(٦) دا ئاماژەی پێکراوە، لەسەر ئاستی شارۆچکە کۆی ژمارەی ڕەگەزی نێر بریتی بووە لە (٢٨١٩٦) کەس و کۆی ژمارەی ڕەگەزی مێ (٢٥١٧٦) کەس، هەروەها زۆرترین ژمارەی ڕەگەزی نێر کەوتووەتە شارەدێی (مەرگە) کە بریتی یە لە (٩٨٩٩) کەس، کەمترین ژمارەی ڕەگەزی نێر کەوتووەتە شارەدێی سەنتەر کە (٤٤٦٣)کەس، سەبارەت بەڕەگەزی مێینەش زۆرترین ژمارەی ڕەگەزی مێ کەوتووەتە شارەدێی چوارقورنە کە بریتی بووە لە (٨٦٤٥) کەس، و کەمترین ژمارەی ڕەگەزی مێ کەوتووەتە شارەدێی سەنتەردایە، کە (٤١٤١)کەس بووە.

سەبارەت بە ژمارەی خێزان بەپێی ژینگەی گوندنشین و شارنشین لە شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی (١٩٧٧) جیاوازییەکی زۆر هەیە بەپێی یەکە کارگێڕییەکان، وەک لەخشتەی (٧)دا خراوەتەڕوو، بەجۆرێک کۆی ژمارەی خێزان بریتییە لە (١٥٤٥١) خێزان.

**خشتەی (٧) ژمارەی خێزان بەپێی دابەشبوونی ژینگەیی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی (١٩٧٧)دا**

| ژ | یەکەی کارگێڕی | ژمارەی خێزان | | |
|---|---|---|---|---|
| | | شارنشین | گوندنشین | کۆ |
| ١ | ن.سەنتەر | ١٦٠٦ | ٠ | 1606 |
| ٢ | مەرگە | ١٩٢ | ٣١٥٠ | 3342 |
| ٣ | چوارقورنە | ٩٨٠ | ١٨٣٧ | 2817 |
| ٤ | بێتواتە | ١٣٥ | ٧٥٥١ | 7686 |
| کۆ | | ٢٩١٣ | ١٢٥٣٨ | ١٥٤٥١ |

المصدر: الجمهورية العراقية وزارة التخطيط: الجهاز المركزي للاحصاء، هيئة التعداد العام للدراسات السكانية، نتائج ترقيم المباني وحصرالسكان لسنة ١٩٧٧، ص ١٥، ١٨.

بەسەیرکردنی خشتەی ژمارە (٧) دەردەکەوێت کەزۆرترین ژمارەی خێزان کەوتۆتە شارەدێی (بێتواتە) بریتیە لە (٧٦٨٦) خێزان و کەمترین ژمارەی خێزان کەوتووەتە شارەدێی (سەنتەر) بریتیە لە (١٦٠٦) خێزان، هەروەها سەبارەت بە ژمارەی خێزان بەپێی بارودۆخی ژینگەیی، کۆی ژمارەی خێزان لە ژینگەی شارنشینی دا بریتیە لە(٢٩١٣) خێزان و لەبارودۆخی گوندنشینیشدا بریتیە لە (١٢٥٣٨) خێزان، زۆرترین ژمارەی خێزان لەژینگەی شارنشیندا بریتیە لە (١٦٠٦) خێزان لە شارەدێی (سەنتەر) و کەمترین ژمارەی خێزان لەژینگەی شارنشین بریتیە لە (١٣٥) خێزان لە شارەدیی بیتواتە، هەروەها زۆرترین ژمارەی خێزان لەژینگەی گوندنشین بریتیە لە (٧٥٥١) خێزان لە شارەدێی (بێتواتە) و کەمترین ژمارەی خێزان لەژینگەی شارنشین بریتیە لە (٠) خێزان لە شارەدێی (سەنتەر) واتە هیچ خێزانێک لە شارەدێی سەنتەردا کە لەژینگەی گوندنشینیدابن نیە.

بەوردبوونەوە لە داتا و ژمارەکانی ساڵی (١٩٧٧) بەبەراورد بە ژمارەو داتاکانی ساڵی (١٩٥٧) دەبینین ژمارەی دانیشتووانی شارۆچکەی رانیە (گوندوشار) رۆژ بەرۆژ بەرەو زیادبوون هەنگاوی خێرای ناوە، دیارە ئەم زیادبوونەش هۆکاری گشتی و تایبەتی خۆی هەیە، لەم ساڵەدا زیادبوونێکی خێرا لەشارۆچکەکەدا ڕویداو دەرەنجامی گۆڕانکارییەکی گەورەی لێکەوتەوە لەڕوانگەی دیمۆگرافیەوە، ژمارەو داتاکان بەڵگەن بۆ ئەوەی کەشار بەرەو فراوان بوون و گەشەکردن هەنگاوی ناوە، دەتوانین هۆکاری گەشەکردن و فراوانبوونی ژمارەی دانیشتوانی شارنشین بەبەراورد لەگەڵ گوندنشین لە شارۆچکەی رانیەدا بۆ چەند هۆکارێکی گرنگ بگێڕینەوە، لەوانە:-

١- کۆچی گوندنشینەکان لەوماوەیەدا بەهۆی هەبوونی خزمەتگوزارییە جۆربەجۆرەکانی سێکتەری ژیان لەشارۆچکەی ڕانیە و نەبوونی لەگوندەکاندا، وێرانکردنی زۆربەی گوندەکانی دەوروبەری شارەدێکانی شارەکە بە هۆی هەبوونی هێزەکانی پێشمەرگە لەناوچەکەدا، کردنەوەی چەند فەرمانگە و یەکەی کارگێڕی لە ناوچەکە، لەگەڵ ئەنجامدانی چەند پڕۆژەیەکی خزمەتگوزاری لە شارۆچکەی ڕانیەدا ، کە تا ساڵی (١٩٧٧) پرۆژەی خزمەتگوزاری گشتی زۆر لەرانیە چۆتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەتایبەت لە بواری ڕێگاوبان، بوونی ئەم خزمەتگوزاریانە بوونە هۆی کێشکردنی گوندنشینەکان بۆ شارۆچکەی ڕانیە.[1]

٢- دیاردەی بەزۆر ڕاگواستنی گوندە سنورییەکان بەتایبەت دوای ڕێکەوتنامەی (جەزائیر) لە ساڵی(١٩٧٥) دەستی پێکرد، چونکە بە پێی خاڵەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە حکومەتی عێراق بەبیانووی پشتێنەی ئاسایشەوە بە قوڵایی (٣٠کم) دەستی کرد بە ڕاگواستنی دانیشتوانی گوندە سنورییەکان و لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا نیشتەجێیکردن، بەم هۆیەشەوە ڕێژەیەکی زۆری گوندنشینەکانی شارۆچکەی پشدەر تووشی ڕاگواستن بوون و ڕێژەیەکی بەرچاو خەڵکی ئەم گوندانە لە سنوری شارۆچکەی ڕانیەدا نیشتەجێکران و بەشێکیان ڕوویان کردە شارۆچکەی ڕانیە.[2]

٣- دوای ئەوەی حکومەتی عێراق بڕیاری ڕاگواستنی دانیشتوانی گوندە سنورییەکانی دا، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان ئۆردوگای زۆرەملێی دروستکرد، بۆ نیشتەجێکردنی ڕاگویزراوەکان، بەم هۆیەشەوە لە سنوری شارۆچکەی ڕانیە هەردوو ئۆردوگای (ڕانیە و چوارقوڕنە)ی لە ساڵی (١٩٧٨) دا دروستکرد. بەهۆی بەردەوامبوونی شاڵاوەکانی ڕاگواستنەوە لە ساڵی (١٩٧٧) دا لە ناحیەی (ناودەشت)ی پشدەر(٢٦) گوند ڕاگوێزران، هەر لە هەمان شارەدێدا لە ساڵی (١٩٧٨) دا (١٣) گوندی تر ڕاگوێزران و ژمارەیەکی بەرچاویان لە ئۆردوگای ڕانیە نیشتەجێکران، دواتر بەهۆی نزیکی لە

---

[1] خەلیل ئیسماعیل محمد:شیکردنەوەی جوگرافیایی دانیشتوانانی سەنتەرە شارستانیەکانی پارێزگای سلێمانی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ، ژمارەی(٤)، ١٩٩٧، ل١١.

[2] مراد حەکیم محمد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٩- ١٣٠.

شارۆچکەی ڕانیەو فراوانبوونی شارۆچکەکەوە کەوتە ناو سنووری شارەوانی و بوون بەبەشێک لەشارۆچکەی ڕانیە، بەمەش ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە بەرزکردنەوەی ڕێژەی گەشەی دانیشتوانی شـاری ڕانیـە، چونکـە پێکهـاتبوو لـە (٦٠٩) خێـزان، کـەژمارەیان (٣٥٣٢) کـەس بـووە، لەوەشــەوە دەردەکـەوێت، کـە شـالاوەکانی ڕاگواسـتنی گونـدە سـنوریەکان ڕۆڵێکـی گرنگـی هــەبووە لـە بـەرز کردنــەوەی ڕێــژەی گەشــەی دانیشـتوانی شــارۆچکەی ڕانیــە.[1] فاکتــەرە مرۆییــەکانیش، کــەخۆی دەبینێتـەوە لـە چالاکییـە ئابووریـەکان لـەجیاوازی شـێوازی کشـتوکاڵکردن و بازرگـانی و کردنـەوەی ئوتێـل و چـاککردنی ڕێگاوبـان ...هتـد، ڕۆڵـی هــەبووە لەســەر شـێوازی دابەشـبوون و فراوانبـوونی شارۆچکەی رانیە لە ڕوانگەی دانیشتوانەوە لەبەشێکەوە بۆ بەشێکی تر.

لە ڕووی پێکهاتەی نەتەوەیی شارۆچکەی ڕانیـە بـەگوێرەی سـەرژمێری سـاڵی (١٩٧٧) ڕێژەی کورد دەگاتە (٩٦.٩٩%) کە ژمارەیان دەگاتـە (٥١٧٦٥) کـەس، لـە کۆی دانیشـتوانی شـارۆچکەکە وەک زانراویشــە تـا سـاڵی (١٩٩١) دامودەزگاکـانی حکومــەتی عێـراق لــە شـاری رانیـە بوونیـان هــەبوو، ژمارەیـەکی زۆری کارمەنـدانی ئـەم دامودەزگایانـە بەتایبـەتی دامودەزگـا سـەربازییەکان، کـە خـۆی دەبینیەوە لـە سـەرباز و ئاسـایش و هـەواڵگری (استـخبارات) وفیرقـەو ناوچـەی ڕاهێنانی سـەربازی.[2] ژمارەیـەکی زۆری ئـەم کارمەندانـە لـەڕووی نەتـەوەیی کـورد نـەبوون، بـەڵام بەشـێوەیەکی گشـتی شارۆچکەی رانیە زیاتر ژمارەی دانیشتوانەکەی کوردبوون، بە بـەراورد لەگـەڵ شـارەکانی تـر کـەمتر گـۆڕانی دیمـوگرافی لـە دانیشـتوانەکەیدا ڕویـداوە چونکـە هاوڵاتییـەکانی زیـاتر خـەڵکی دەوروبـەری ناوچەکە بوون.

لەخشتەی (٨) ژمارەو ڕێژەی نەتـەوەکان لەسـەرجەمی دانیشـتوانی شـارۆچکەی ڕانیـە لەسـاڵی (١٩٧٧) خراوەتەڕوو، کە هەریەک لە نەتەوەکانی (کورد، عەرەب، تورکمـان، ئەرمـەن، سـریان، و هیتـر) لـە شـارۆچکەی رانیـەدا بوونیـان هـەبووە، بـەڕێـژەی جیـاواز بـەجۆرێک زۆرتـرین ژمـارەی دانیشـتوان لەنەتەوەی کورد  کە (٥١٧٦٥) کەس بووە بەڕێژەی (٩٦.٩٩%)ی کۆی ژمارەی دانیشـتوان، هـەروەها دوای ئەو نەتەوەی عەرەب (١٤٦٨)کەس و بەرێژەی (٢.٧٥١%) ی کۆی ژمارەی دانیشتوان، هـەروەهـا کـەمترین ژمـارەی دانیشـتوانیش لەنەتـەوەی سـریان بـووە کەتـەنها (٣) کـەس بـووە بـەڕێژەی (٠.٠٠٦%)ی کۆی ژمارەی دانیشتوان.

[1] جاسم محمد محمدعەلی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٧،١٩٨،٢٠٠.

[2] پێشرەو سەمەد تۆفیق: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٢.

**خشتەی (٨ ) ژمارەوڕێژەی نەتەوەکان لەسەرجەمی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە (١٩٧٧)**

| ژ | نەتەوە | ژمارە | % |
|---|---|---|---|
| ١ | کورد | ٥١٧٦٥ | ٩٦.٩٨٩ |
| ٢ | عەرەب | ١٤٦٨ | ٢.٧٥٠ |
| ٣ | فەیلی | ٩ | ٠.٠١٦ |
| ٤ | تورکمان | ٢١ | ٠.٠٣٩ |
| ٥ | ئەرمەن | ٦ | ٠.٠١١ |
| ٦ | سریان | ٣ | ٠.٠٠٥ |
| ٧ | هیتر | ١٠٠ | ٠.١٨٧ |
| کۆ | | ٥٣٣٧٢ | ١٠٠ |

سەرچاوە: عبدالله غفور: پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان لە باشوری کوردستاندا (بەپێی سەرژمێری دانیشتوانی عێراق – ١٩٧٧)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٤٨.

ئەوەی پەیوەستە بە ژمارەی دانیشتوان و خێزان بەپێی بارودۆخی ژینگەیی لەساڵی (١٩٨٧)دا، بە بەراوردکردنی داتاکانی ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەی رانیە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٧) بۆ (١٩٨٧) دا دەبینین ژمارەی دانیشتوان بەرزبوونەوەی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، لە ڕوانگەی شارنشین و گوندنشینەوە ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە لەساڵی (١٩٨٧)دا گەیشتۆتە (٧٧٠٥٦) کەس، هەروەها کۆی ژمارەی خێزانیش زیادی کردووە بۆ (١٥٤٤٨) خێزان، بەڕوانین بە خشتەی (٩) دەردەکەوێت کە زۆرترین ژمارەی دانیشتوان کەوتووەتە شارەدێی سەنتەر کە بریتیە لە (٦٥٠٩٥) کەس، کەمترین ژمارەی دانیشتوانیش کەوتوەتە شارەدێی (بێتواتە) کە بریتیە لە (١١٩٦١)کەس، سەبارەت بە ژمارەی خێزان بەپێی بارودۆخی ژینگەیی و کۆی ژمارەی خێزان لە ژینگەی شارنشینی دا بریتیە لە(١١٣٤٩) خێزان و لەبارودۆخی گوندنشینیش دا بریتیە لە (٤٠٩٩) خێزان، زۆرترین ژمارەی خێزان، لە ژینگەی شارنشین بریتی بووە لە (١١٣٤٩) خێزان لە شارەدێی (سەنتەر) و هەروەها زۆرترین ژمارەی خێزان لەژینگەی گوندنشین بریتیە لە (٢٥٩٩) خێزان لە شارەدێی (سەنتەر) و کەمترین ژمارەی خێزان لەژینگەی شارنشین بریتیە لە (١٥٠٠) خێزان لە شارەدێی (بێتواتە).

**خشتەی (٩) ژمارەی دانیشتوان و خێزانی شارۆچکەی ڕانیە بەپێی بارودۆخی ژینگەیی لە ساڵی (١٩٨٧)دا**

| ژ | یەکەی کارگێڕی | ژمارەی خێزان | | | ژمارەی دانیشتوان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | شارنشین | گوندنشین | کۆ | شارنشین | گوندنشین | کۆ |
| ١ | ن.سەنتەر | ١١٣٤٩ | ٢٥٩٩ | ١٣٩٤٨ | ٤٩٩٨٦ | ١٥١٠٩ | ٦٥٠٩٥ |
| ٢ | بێتواتە | ٠ | ١٥٠٠ | ١٥٠٠ | ٠ | ١١٩٦١ | ١١٩٦١ |
| کۆ | | ١١٣٤٩ | ٤٠٩٩ | ١٥٤٤٨ | ٤٩٩٨٦ | ٢٧٠٧٠ | ٧٧٠٥٦ |

المصدر: الجمهورية العراقية وزارة التخطيط: الجهاز المركزي للاحصاء، هيئة التعداد العام للدراسات السكانية، نتائج ترقيم المباني وحصرالسكان لسنة ١٩٨٧، ص٢٠-٢٢.

گەشەو زۆربوونی دانیشتوان هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە، بەرزی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان لە شارۆچکەی ڕانیە لەو قۆناغەدا بۆ چەند هۆکارێک دەگەڕێتەوە کە لە چەند خاڵێکدا باس دەکرێت:

١- نادروستی ئەنجامەکانی سەرژمێری لە (١٩٨٧) دا، چونکە لە کاتێکدا ئەنجامدراوە کەجەنگی عێراق و ئێران لە ئارادا بووە، بارودۆخی سیاسی کوردستانی عێراق ناجێگیر بووە.

٢- فراوانبوونی رووبەری شارۆچکەی رانیە کە بە درێژایی ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٩١) دووچاری گەلێ گۆڕانکاری هاتووە لەڕووی رووبەرەوە، ئەمەش لەمیانەی ئەوگۆڕانکارییە کارگێڕییانە بووە کە بەسەر شارۆچکەکەدا هاتووە کە رەنگدانەوەی دیاری لەسەر زیادبوون وگەشەی دانیشتوان هەبووە.

٣- بەشێوەیەکی گشتی سەنتەری شارۆچکەکان، بەسەنتەری کارگێڕی و خوێندن و سەلامەتی و بازرگانی و ڕێگەوبان و ئاوەدانیەکانی تر دادەندرێن.

## باسی دووەم/ پێکهاتەی چینە کۆمەڵاتیەکان و هۆزەکان لە ڕانیە

گەر سەیرێکی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کوردستان بکەین لە سەردەمە جیاجیاکاندا جیاوازیەکی زۆر گەورە نابینرێت لە نێوان چینە کۆمەڵایەتیەکان، بەڵام دەتوانرێت لە تەماشاکردنی ڕووکەشی هەست بە دیاردەی جیاوازی بکرێت لە کەسەکاندا، لە ڕووی ڕەفتار و قسە و جلوبەرگ و ئاستی رۆشنبیریدا، بەڵام ناتوانرێت پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی بەراورد بکرێت بە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو کە جیاوازی چینایەتی زۆر زەق و دیارە.[1] لە ڕانیەدا چەند چین و توێژاڵیک هەبووە، بەشێوەیەکی گشتی وەک هەر ناوچەیەکی تری کوردستان و ناوچەکە سێ چین بوونی هەبووە، خاوەن زەویە گەورە و مام ناوەندەکان کە خۆیان لە شێخ و ئاغا و کوێخاو هەندیک بنەماڵە وەک (شێخ حسێنی بوسکێن، ئاغاکانی ئاکۆ، شێخەکانی سەیداوا، بنەماڵەی عەلی بەگ، سابیری کوێخا کەریم، کاکەمین عەزیز ئاغا، سابیری کوێخا کەریم، سەید حسامەدین، بنەمالەی حەمەزلە، عەلیە درێژ، عەبدوڵلا مەرگەیی، حاجی سورە، ...هتد) دەبینیەوە، چینی ناوەندیش کە لە فەرمانبەر، پیشەگەر و بازرگانەکان پێکدەهات، لەگەڵ چینی گشتی یان سێیەم، کەزۆرینەی خەڵکی ئاسایی دەگرێتەوە.[2]

لەڕووی پێکەوە ژیانەوە خەڵک و دانیشتوانە کە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی ڕانیە جووتیار و خەریکی کشتوکاڵ بوون، بەسەرکزی و داماوی ژیاون و ئەگەر لەگەڵ ئاغا و بازرگانی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان ناکۆکی و ململانێشیان هەبووبێ پەردەپۆشیان کردووە و خۆیان لێ بێدەنگ کردووە، ئەم بێدەنگ بوونەش لە ناهۆشیاریەوە نەبووە، چونکە جوڵانەوەی دیموکراسی و رزگاری خەڵکی کوردستان لە قۆناغی جیا جیادا دەرفەتی ئەوەی دروستکردووە، جووتیاری کورد بە باشی لە جیاوازی چینایەتی تێبگا و بەرژەوەندی خۆی لە خاوەندارێتی زەوی وچاکسازی کشتوکاڵی ببینێتەوە، زەمینەی شۆڕشی نیشتمانی لەبارتر بووە و هەلومەرجی کوردایەتی رەخساوتر بووە، ململانێی چینایەتی کاڵبووە، زۆرتر پێکەوە ژیانی ناچاری بووە لە نێوان ژێردەست و سەردار.[3] بەڵام کەم تازۆر ململانێ لە نێوان چینی جووتیار و خاوەن زەویەکان هەبووە، بەتایبەت دوای شۆڕشی (١٩٥٨)ی عیراق، کە بەجۆرێک لە جۆرەکان جووتیاری لە مافەکانیان بە ئاگا هێنابۆوە، لەگەڵ ئەوەشدا گیانی تەبایی و هاوکاری و پێکەوەژیان لە ناوچین و توێژەکان زۆر پتەوبووە، تا چاکسازیە کشتوکاڵیەکانی حکومەتی عیراق لە ساڵی (١٩٧٠) و (١٩٧٥) نەیتوانی کاریگەری خراپ لەسەر ئەم

---

[1] هادي رشيد الجاوشلي: المظاهر الاقتصادية في تراث منطقة كردستان، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٧٨، ص ٥٥-٥٦.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەلیم نوری قادر: لە ٢٠١٦/٣/١٢، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ی ڕانیەیە و دەرچووی کۆلێژی کارگێری و ئابوری زانکۆی سلێمانیە، ١٩٨٠، ئێستا فەرمانبەری خانەنشینە؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ موەفەق حەمە مەجید: ٢٠١٦/٣/١.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەربەست جیهاد سدیق: ٢٠١٦/٣/٢٦، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٨ی ڕانیەیە و بڕوانامەی دبلۆمی هەیە لە ڕاگەیاندندا و ئەزموونێکی زۆری هەیە لە ڕاگەیاندندا و نووسەرە و چەندین وتاری جۆربەجۆری هەیە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان.

پێکەوە ژیانە دروست بکات، دیاردەی ئاژاوە و شەڕو و کوشتن ڕێژەکەی ئەوەندە کەم بووە، چۆتە خانەی نەبوونەوە.[1] ڕانیە و ناوچەکە لەماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) دا لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و چینایەتیەوە لەبەرئەوەی ناوچەیەکی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بووە، سیمای خێڵایەتی و دیاردەی خزمایەتی و گرنگی دان بە هۆز و بنەماڵەو پێکهاتەکانی تر تیایدا زاڵبووە، هەمیشە هەست بە دیاردەی جیاکاری و ناو هێنانی لە نێوان هۆز و تایفەی ناوچەکە کراوە و زۆرجار پێکهاتەی گەڕەکێک یان ناوچەیەک تەنها پەیوەست بووە بە ناوی هۆز و تیرەیەک یان بنەماڵەیەکەوە.

هۆز (tribe)[2] دەستەواژەیەکە بۆ ناوچەی نیشتەجێبوونی کۆمەڵێک مرۆڤ بەکاردەهێنرێت، لە بنچینەدا کۆمەڵەیەکی سیاسیەو لەیەک بەرە باب یان زیاتر پێکهاتووە، پێی دەوترێت(تایفە)[3] پێکهاتەی هۆزایەتی و خێڵایەتی ڕانیە بریتیبووە لە(ئاکۆ، شاور، جاف، بڵباس و هۆزەکانی، شیلانە، خۆشناو)، جگە لەم هۆزانە کۆمەڵێک بنەماڵەی بابانی و باڵەکی و وەرتی، ناوچەی مەرگەو کۆیە و قەڵادزێ و بناری کۆسرەت و شکاکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و هەمەوەند نیشتەجێی ناوچەکەبوون.[4] لە دوای ڕاگواستنی ناوچەی پشدەریش لە ساڵی (١٩٨٩) کۆمەڵێک هۆز و تایفەو بنەماڵە ڕویان لە ڕانیە کردووە، لەوانە بڵباس و ئاکۆکانی پشدەر، شۆڕی، خوار، نورەدینی، ترکە ڕەشە، نیگار، وەیسەمەرە، بەگزادەکانی میراودەلی.[5] گرنگترین هۆزە و گروپە دیارەکانی شارۆچکەی ڕانیە بریتین لە:

**١- هۆزی ئاکۆ**

هۆزی ئاکۆ، کۆمەڵ یان جۆرێکە لە یەکگرتن کە یەکگرتنێکی بەربڵاو و نا ئاساییە، کۆمەڵەکانی ئەم یەکگرتنە بەسەر سێ شوێنی جوگرافی سەرەکیدا دابەش بوون، (ناودەشت، شاور، ڕانیە) لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا ئەم هۆزە لەلایەن باش ئاغاکان سەرپەرشتی کراوە، کە مامەند ئاغا براگەورەیان بوو لە سەرکەپکانی نزیک ڕانیە دادەنیشت، ئاکۆکانیش ئەویان بە سەرۆکی خۆیان

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ دادوەر: کمال عەبدوڵلا ڕەفیق: لە ٢٠١٦/٣/٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ ی ڕانیەیە و دەرچووی کۆلێژی یاسایە ساڵی ١٩٨٠، ئێستا سەرۆکی دادگای تاوانەکان لە سلێمانییە؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەلیم نوری قادر: ٢٠١٦/٣/١٢.

[2] بۆ زانیاری لەسەر زاراوەی چەمک و خێڵ بڕوانە: گۆران سەلام: کاریگەری خێڵ و ئاین لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٨٤٧-١٨٨١)، چ٣، چاپخانەی کەمال، هەولێر، ٢٠١٤، ل١٠-٢٤.

[3] ئی.ئار.ئیج: ڕەوشی ئابوری و کۆمەلایەتی کوردی ڕەواندز، و، عەزیزگەردی، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٣٣.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەلی محمد عبدلله، ناسراو بە عەلی بەگ، ٢٠١٦/٣/٨، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٤ی ڕانیەیە، خوێندەوارە، کەسێکی کۆمەڵایەتییە و شارەزای کۆمەلایەتی ناوچەکەیە، خەریکی کاری ئازادە.

[5] مۆفەق میراودەلی: عەشیرەتی میراودەلی، پێداچوونەوەی، کامەران بابان زادە، مستەفا سەید مینە، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٧١؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئیسماعیل محەمەد عەلی: لە ٢٠١٦/٣/٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٢ پشدەرەو و شوینەوارناسەو سەرنوسەری گۆڤاری شمشارەیە، ئێستا فەرمانبەرە لە بەڕێوەبەرایەتی شوینەواری ڕاپەڕین.

دەزانی.[١] لە دوای ئەویش کوڕەکەی جێگەی گرتەوە بەناوی عەباس مامەند ئاغا، بە شێوەی گشتی ئاکۆکان هۆزی کۆچەری و نیمچەکۆچەربوون،[٢] عباس عەزاوی لە کتێبەکەیدا (عشائر العراق)، هۆزی ئاکۆ بە بەشێک لە فیدراسیۆنی بڵباس هەژمار دەکات.[٣] بەڵام ئەم زانیاریە لە هیچ سەرچاوەیەک پشتڕاست نەکراوەتەوە، لە کتێبی شەرەفنامە هۆزی ئاکۆ بە هۆزێکی سەربەخۆ ناوی هاتووە، (د.عیماد عەبدولسەلام) لە کتێبەکەی ئاماژە بە بڕیارێکی سوڵتانی عوسمانی کردووە لە ساڵی ١٧٤٤ز دەربارەی ئەو زەوییانەی کە ئەم هۆزە لە ئێران داگیریکردووە، ناوی ئاکۆ و بڵباسی بە دوو هۆزی جیاواز ناوبردووە، گەریدەی ئینگلیز (مارک سایکس) بە هەمان شێوە وەک هۆزێکی سەربەخۆ ناوی بردووە.[٤] ئاکۆکانی ڕانیە خۆیان بە دانیشتوانی ڕەسەنی ڕانیە دەزانن و ئاماژە بە مێژوویەکی زۆر کۆن دەکەن کە لەم ناوچەیە بونیان هەبووە تیایدا نیشتەجێ بوون، تیرەو بنەماڵەکانیان، لە سنووری ڕانیە لە ناو ڕانیەو چوارقورنەو حاجیاواو سەروچاوە نیشتەجێن و بەشێکی زۆری ئاکۆکانی ڕانیە لەلایەن کوڕەکانی عەباسی مامەند ئاغای باش ئاغایی وەک براگەورە سەرپەرشتی دەکرێن، بەشێکیشیان سەربەخۆن و پابەندبونیان نیە. گرنگترین تیرە و بەرەبابەکانیان لە ناوچەکە بریتین لە: (باش ئاغایی، بێکۆدی، نێوکوڵە، جەلک، مەمک، زەنگڵ، مەلا زادە، بنزێری، شارۆشی، مخە، خیلە، مەروان، مەندەمەرە، باوەبیە، دەلاڵ، بەردەخە، قەیمەس، بۆڵی، بابۆڵی)، ئاکۆکان بەشێوەی گشتی مسوڵمانی سونین و لەسەر ڕێبازی شافیعین.[٥]

**٢- کونفدراسویۆنی بڵباس**

بڵباس کۆنفدراسیۆن یان یەکگرتنێکی گەورەیە، شوێنی جوگرافی ڕەسەنیان ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، لە چەند هۆزێک پێکدێن، وەک (مەنگوڕ، مامەش، پیران، ڕەمک، سن، ئوشاک)،[٦] ئەو بڵباسانەی کەوتونەتە پارێزگای سلێمانی مسوڵمانی سونەن و لە سەر ڕێبازی شافعین،[٧]

---

[١] سیسل جۆن ئیدمۆنس: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧١-١٧٢.

[٢] ویلیام ایلغتون: القبائل الكردیة، ت: د. احمد محمود خلیل، موكریان للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠٦، ص١٠١.

[٣] عباس العزاوي: عشائرالعراق، الجزء الثاني، مكتبة الصفا و المروى، لندن، بدون تاریخ الطبع، ص١٢٨.

[٤] میر شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامە، و: مامۆستا هەژار، چ٣، ٢٠٠٦، ل ٣٧٧؛ د. عماد عبدالسلام رؤوف: دراسات وثائیقیة فی تاریخ الكرد الحدیث و حضارتهم، اربیل، ٢٠٠٨، ص٢٤٣؛ مارک سایکس: القبائل الكردیه فی الامبراطوریة العثمانیة، ت: ا.د. خلیل علی مراد، تقدیم ومراجعة و تعلیق، ا.د. عبدالفتاح علي بوتاني، دار الزمان، دمشق، سوریا، ٢٠٠٧، ص٤٢.

[٥] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ، ئاکۆ عەباس مامەندئاغا: ٢٠١٦/١/٢٤؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، عبدللە ئاورەحمان بایز: ٢٠١٦/٣/٢٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٦ ڕانیەیەو لە تیرەی بێکۆدەی ئاکۆیە، خوێندەوارە، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

[٦] مجموعة من الباحثین: عشائر الكردستان، رابطة كاوا للثقافة الكردیة، اربیل كردستان-بیروت لبنان، ٢٠٠١، ص٢١٧.

[٧] کەیوان ئازاد ئەنوەر: هۆزە کوردەکانی کوردستانی عیراق، گۆڤاری پەیڤین، ژ(٩)، تەمموزی ٢٠٠٠، ل١٨٤.

### أ- پیران

ناوی ئەم هۆزە بۆ ناوچەی پیران لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەگەڕێتەوە، بەشێکیان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەژین و بەشەکەی تریشیان لە باشوری کوردستان لە ڕانیە و چوارقوڕنە نیشتەجێن، لە ڕابردودا کۆچەری بوون و گەرمیان و کوێستانیان کردووە، بەڵام دواتر نیشتەجێ بوون و مەڵبەندەکەیان گوندی سەرخمە، گرجان و قەرەنی ئاغایە، سەر بە شارەدێی چوارقورنەیە، لە ناو ڕانیە و چوارقورنە و حاجیاوادا دابەش بوون، لە ڕابردوودا لەلایەن سوارە حەمەد ئاغا وە سەرپەرشتی کراون، کە یەکێک بووە لەو کەسایەتیانەی لە جوڵانەوەی خەباتی کوردا ڕۆڵی هەبووە، دواتر کوڕەکەی بە ناوی ئیسماعیل جێگەی گرتۆتەوە، دواتر سوارە ئیسماعیل سوارە بۆتە سەرۆکی هۆزەکەیان و تا ئێستاش وەک برا گەورەی هۆز سەرپەرشتیان دەکات.[١]

### ب- مەنگوڕ و مامەش، ڕمک، سن

ئەم هۆزانە کۆچەرین و گەرمیان و کوێستانیان کردووە، لە ناوەڕاستی سەدەی نوزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، بە شێوەی کۆچەری هاتوون بۆ ناوچەکانی پشدەر، پێنجوێن، کۆیە، سلێمانی، ڕانیە، نیشتەجێ بوون مەنگوڕەکانی باشووری کوردستان دوو جۆرن، زوودی و ڕووتە، سنەکانیش دوو لقن، سن و تافا، هەرچی مامەشیشە یەک پێکهاتەیە و بە ژمارە زۆری ئەندام ناسراون،[٢]بەشێکیان لە دوای ڕاگواستنی ناوچەی پشدەر لە ساڵی (١٩٨٩)، چوونەتە ڕانیە و حاجیاوا و چوارقورنە و تیدا نیشتەجێبوون.[٣] هەرچی ڕەمک (ڕاماک- ڕامەک- ڕێمک) ئەم هۆزە سەردەمێک بە هێزترین هۆز بووە لە ناو بڵباسدا، لە سەردەمی نادرشای فەرمان ڕەوای ئێراندا (١٧٣٦-١٧٤٧)، سوپایەکی بە هێزیان هەبووە، دواتر بوون بە هۆزێکی بچووکی نیشتەجێی دەشتی بیتوین لە ڕانیە، تا ساڵی(١٩٨٠) کۆچەری بوون و گەرمیان و کوێستانیان کردووە دواتر بە یەکجاری نیشتەجێبوون. ڕەمک دابەشی دوولق بوون: میر خدری کە سەرۆکەکەیان ئیبراهیم ئاغا، کەچەل و کڵاو سپیشیان پێدەووترێ، لقی دووەم، فەقێ وەیسی سەرۆکەکەیان کاکە ئاغا،[٤] پێکهاتەی ڕمک ئاغاو جوتیارە، زۆرێکیان لە ناو ڕانیە نیشتەجێن، وەک براگەورە پابەندبوونیان هەیە و لە لایەن ئاغاکانەوە ریش

---

[١] ئیبراهیم بالیسانی: سەربردەی ڕانیەو دەوروبەری، گۆڤاری ڕوانین، ژ(٥)، ئەیلوولی ١٩٩٩، ل١٤١-١٤٢؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سوارە ئیسماعیل سوارە: ٢٠١٦/٣/٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧، ڕانیەیە و براگەورەی پیرانەکان و ئێستاخەریکی کاری ئازادە.

[٢] خالید مەحمود کەریم: دەوڵەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لە کوردستانی باشور، سلێمانی، ٢٠١٢، ل١٢٤-١٢٧.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئیسماعیل محەمەد عەلی: لە ٢٠١٦/٣/٣.

[٤]مؤلف مجهول: العشائر الكردية، ترجمة و علق عليه، فؤاد حمه خورشيد، مطبعة الحوادث، بغداد،١٩٧٩، ص٣١-٣٢؛محمود احمد محمد: مێژووی هۆزی بڵباس لە کۆنەوە تا ئیمڕۆ، ب١، سلێمانی، ١٩٨٩، ل٢١٠-٢١٢.

سپی و براگەورایەتیان بەسەرداکراوە. سنەکانیش وەک گوند گوندیان نیە وەک خێزان و بنەماڵە لەناو شارۆچکەی ڕانیە و دەوروبەری نیشتەجێن.[1]

### ٣- هۆزی خۆشناو

ئەم هۆزە لە سەدەی هەژدەی زایینی لە ناوچەی سنەوە کۆچیان کردووە بۆ باشوری کوردستان،[2] لە کۆنەوە دەستەی فەرمانڕەوابوون، بە ژیر و ئازایی و سەرکێش ناسراون، لە ڕووی ئایینیەوە مسوڵمانی سونین و لە پەیڕەوانی هەردوو ڕێبازی قادری و نەقشبەندین، چەندین زانای ئایینیان تێدا هەڵکەوتووە، هۆزێکە، لە لایەن میرەوە سەرکردایەتی دەکرێن، کە نازناوێکی عوسمانییە،[3] ئەم هۆزە چەند گروپێکیان هەیە، ئەوەی پەیوەستە بە ڕانیەوە بریتییە لە لقی پشتگەلی، کە باپیرەگەورەیان ناوی ئەندێز بووە، سەرۆکەکەیان ڕەشید بەگی کوری ئەحمەد بەگ بووە لە شارەدێی بێتواتەی سەر بە ڕانیە جێگربووە، سەرپەرشتی چەند گوندێکی کردووە لە سنووری ڕانیە و شەقڵاوە،[4] بەشێکی پێکهاتەی دانیشتوانی ناو ڕانیە و دەوروبەری سەر بە هۆزی خۆشناون.

### ٤- هۆزی شیلانە

لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە کۆچیان کردووە بۆ باشووری کوردستان، مێژووی کۆچکردنەکەیان نادیارە و لە ناوچەی مەرگە (بنگردە) نیشتەجێ بوون، بەهۆی بوونی زۆری گوڵە شیلانە لە ناوچەکەیان ئەم ناوەیان بەسەردابڕاوە،[5] مەحمود ئەحمەد محەمەد، لە کتێبەکەی شیلانەی بە بەشێک لە تیرەی کادەروێشی هۆزی مەنگوڕ هەژمار کردووە،[6] شیلانە لە سێ تیرەی سەرەکی پێک دێن: (پیرە: لە گوندەکانی بێموشە و هەڵونەن، هەندێکیشیان دوای ژێرئاو کەوتنی گوندەکانیان چوونە ڕانیە و چوارقورنەو ژاراوە و ئەسکی کەڵەک/ شوانە: لە گوندەکانی بنگرد، سۆفیان، سەرچیا، هەندێکیشیان دوای ژێرئاو کەوتنی گوندەکانیان چوونە ژاراوە و سوڵتانەدێ/ ڕەجەب یان ئاڵی: لە بەردەشان دادەنیشن و بەشێکیشیان دوای ژێرئاو کەوتنی گوندەکانیان کۆچیان کردووە بۆ ناوچەی بازیان).[7] محەمەد ئەمین زەکی بەگ ژمارەی گوندەکانی بە

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ وریا فەتاح بابکر: لە ٢٠١٦/٣/٩، ڕانیە، ناوبراو لە لە دایک بووی ساڵی ١٩٥٩ لە ڕانیە و یەکێکە لە بنەماڵەی ئاغاکانی ڕمک، ئێستا نوسینگەی کڕین و فرۆشتنی خانو زەو هەیە لە ڕانیە.

[2] ویلیام ایلغتون: المصدر السابق، ص١٠١.

[3] منذر الموصلي: عرب و اكراد رؤيا عربية للقضية الكردية، دار الغصون، بيروت، ١٩٨٦، ص٤٣٨.

[4] عباس العزاوی: المصدر السابق، ص١٣١-١٣٢.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ زیاد محەمەد حەمەد: ٢٠١٦/٢/٢٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی١٩٣٨بنگردە، دەرچووی خانەی مامۆستایانە، خاوەنی چەندین پەرتووکە، ئێستا مامۆستای خانەنشینە.

[6] محمود احمد محمد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧.

[7] نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل٣٢٤-٣٢٥.

(١٠-١٢) گوند داناون،[١] شیلانەییەکان خۆیان ئاماژە بە ژمارەی(٢٠-٢٥) گوند دەکەن، لە سنوری ڕانیە جگە لەم تیرە و بەرەبابانەی باسکران هەندێک تیرەی ترشیان هەیە وەک:(کوێخا شوان، عەبابەکر، حاجی حوسێن، سمایلە گچکە)، لەماوەی (١٩٥٨-١٩٩١) دا دوای ڕاگواستنیان لە ناو ڕانیە و چوارقورنەو ئۆردوگای حاجیاوا نیشتەجێبوون، وەک سەرۆک هۆز سەرۆکیان نەبووە، بەڵام پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و خزمایەتی و براگەورەی بنەماڵەیی تیایاندا زۆر بەهێزە.[٢]

**٥- هۆزی جاف**

جاف بە یەکێک لە هۆزە ناودار و گەورەکانی نەتەوەی کورد دادەنرێ، بنەڕەت و شوێنی ڕەسەنی نیشتەجێبونیان ناوچەی جوانڕۆی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە،[٣] میکایلی گەورەترین تیرەیە لە ناو هۆزی جافدا،[٤] لە چوار لقی سەرەکی پێکدێن، محەمەد ئەلوەیسی، ڕەشوبوری، شوانکارە، ئالیی بەگ.[٥] بەپێی قۆناغ و گۆڕانکارییەکانی مێژوو گۆڕانکاری لەو تیرە و گروپانەدا دروستبووە، جافەتی، یان جافی تەلان، کە لە شارەزورەوە کۆچیان کردووە بۆ ناوچەی سورداش و دوکان دابەشی دوو بەش بوون، جافەتی- تەلانی لەگەڵ ڕەشکە، ئەم دوو گروپە بەشێکیان چوون بۆ ناوچەی مەرگەی بنگرد و بوون بە خاوەنی ژمارەیەک گوند لە ناوچەکە،[٦] بە هۆی ئەوەی شارەدێی بنگرد، ماوەیەک سەر بە ڕانیە بووە، نزیک بووە لە ناوچەکە لە دوای ساڵی (١٩٥٠) دا وەک خێزان و گروپ ڕوویان کردۆتە ڕانیەو نیشتەجێبوون، دواتریش بە هۆکاری ڕاگواستن بە شێوەیەکی چڕتر چوونەتە ناو ڕانیە و چوارقورنەو ئۆردوگای حاجیاوا، لە ڕانیە لە چەندین گەڕەکدا نیشتەجێن و هەندێک لە گەڕەکەکان هەر بەناوی خۆیانەوە ناونراوە، ڕیش سپی و براگەورەیان هەیە و وەک سەرۆک هۆزیش بە کوێخاکانی تەلانەوە پابەندن.[٧]

---

[١] محمد امین زکی بک: تاریخ السلیمانیە وانحائها، ت، محمد جمیل بندی الروزبیانی، ط٣، مطبعة وزارة الثقافة، السلیمانیة، ٢٠٠٢، ص٢٠٣.

[٢] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ ڕەسوڵ مستەفا قادر: ٢٠١٦/٣/٩، شارەدێی حاجیاوا ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٥ بنگردە یەکێکە لە ڕیش سپیەکانی ئەم هۆزە و شارەزایی باشی هەیە لە سەر مێژووی هۆزەکە، ئێستا، پێشمەرگەی خانەنشینە.

[٣] مەحمود عەزیز حەسەن: مێژووی هۆزی جاف و تیرەکانی، چاپخانەی خاک، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٦.

[٤] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبەوهەوارگە چمکێک لە مێژوو کولتوری چەند تیرەو هۆز و ناوچەیەکی کوردستان، ئوفسێتی قانع، سلێمانی،٢٠٠٣، ل٨٥.

[٥] کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: تەئریخی جاف، د.حەسەن جاف، پێشەکی محەمەد عەلی قەرەداغی، بغداد، ١٩٩٥، ل١٢٥.

[٦] محمد امین زکي بك: تاريخ السليمانية وانحائها، ص٢٠٣.؛ مەحمود عەزیز حەسەن: سەرچاوە پێشوو، ل١١-١١٧.

[٧] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ ئیسماعیل محەمەد خدر(جاف): ٢٠١٦/٣/٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ بنگردە یەکێکە لە ڕیش سپیەکانی ئەم هۆزە، کاری ئازاد دەکات.؛ خدر محەمەد ئەمین ئەحمەد(جاف): ڕانیە، لە ٢٠١٦/٣/٦، لە دایک بووی ١٩٦١ بنگردە، خوێندەوارە، ئیستا بەرپرسی لیژنەی کۆمەڵایەتی ڕانیەیە.

**٦- شاوور**

شاور بە دۆڵێک دەوترێ لە سێ لاوە بە چیای سەخت دەورە دراوە، لە بەر پێگە جوگرافیەکەی بە ناوچەیەکی گرنگ دەژمێردرێت، شاوور یان ساهوور، وشەیەکی لێکدراوە (شا)، کە مانای گەورە دەگەیەنێ و وشەی (وور) لە بنچینەدا ئاوورە، کە مانای ئاگر ئەدات، بەڵام پیتی ئا لە ئاخاوتندا سواوە و بەم ناوە ڕۆیشتووە، ناوی شاوور بۆ ناوی کەسێکی دەسەڵاتدار دەگەڕێتەوە کە لە ناوچەکە فەرمانڕەوا بووە، بەشێک مێژووی دەسەڵاتکردنی دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی دوای زاین و بەکەسێکی پەیڕەو بە ئایینی مەسیحی دادەنێن، هەندیکیشیان دەیگێڕنەوە بۆساڵانی پێش زاین.[١] ئیدمۆنس شاوری بە ناوچەیەکی جوگرافی ناوبردووە، نەک وەک هۆز، یان گروپێکی خێڵەکی.[٢] ئاکۆکانی ڕانیە شاور بە تیرەو بەرەبابێک لە خۆیان دەزانن.[٣] کتێبی (عشائر الکردیە)دا، شاوری بەسەر دووبەشدا دابەشکردووە، شاوری دۆڵە ڕەقە و شاوری گوڵان، بەبێ ئاماژەکردن بە ریشە و ڕەچەڵەکیان، تا ساڵی نووسینی کتێبەکە کە ساڵی (١٩٧٩) یە، شاوری وەک بەشێک لە هۆزی ئاکۆ هەژمارکردووە.[٤] شاووریەکان بەشێکیان ئاماژە بەوە دەکەن، کە شاوور لە هۆزی ئاکۆ جیاوازە و شاور هۆز و تیرە و پێکهاتەی خێڵی تێدا نیە، بەڵکو زیاتر لە شێوەی گروپ و جڤاتدایە، جگە لەوەی لەڕووی ئاخاوتن و دابونەریتەوە لەگەڵ ئاکۆدا جیاوازیان هەیە، لەڕووی نیشتەجێبونیشەوە جیاوازن، ئاکۆ زیاتر کۆچەری و نیمچە کۆچەری بوون، بەڵام شاووریەکان نیشتەجێن و بەکشتوکاڵەوە خەریک بوون، پەیوەندی خزمایەتی و گیانی هاوکاری تیایاندا بە هێزەو لە بەشێک لە گەڕەکەکانی ناو ڕانیە نیشتەجێن و ژمارەیەکیشیان کەوتونەتە شارەدێی چوارقوڕنەو ئۆردوگای حاجیاوای سەر بە ڕانیە.[٥]

---

[١] عەبدلواحید دیبەگەیی(حەکیم) : شائاوور...شائاگر، گۆڤاری ڕامان، ژمارە: (٤٥)، ئاداری ٢٠٠٠، ل٢١٧-٢١٨.

[٢] سیسل جۆن ئیدمۆنس: سەرچاوە پێشوو، ل٢٧١.

[٣] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ ئاکۆ عەباس مامەندئاغا: ٢٠١٦/١/٢٤.

[٤] مؤلف مجهول: العشائر الکردیة، المصدر السابق، ص١٢.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سلێمان ئەبوبەکر ڕەسوڵ: ناسراو بە هاوڕێ سلێمان، ٢٠١٦/٦/٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٢ دۆڵی شاورەو لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان نوسینی هەیەو شارەزای مێژووی ناوچەکەیە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد حەمەد خدر(لالۆئەحمەد): ٢٠١٦/٦/٣، ڕانیە، لە دایک بووی ١٩٦٤ دۆڵی شاورە، کەسێکی بەئاگاو شارەزایە لە بواری کەلتوری ناوچەکەدا.

## باسی سێیەم/ کلتوور و دابونەریتی ناوچەکە

ڕانیە لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) دا لەگەڵ ئەوەی هەنگاوی باشی ناوە لەڕووی پێشکەوتن بەرەو کلتووری[١] شار و ئاشنا بوون بە کۆمەڵگایەکی شارستانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیوە بەتەواو خۆی لە کەلتوری خێڵ و گوند و سیماکانی دەرباز بکات، هەڵکەوتی جوگرافی و خراپی دۆخی سیاسی و کارگێڕی و ئابوری و کۆمەلا یەتی عێراق و ناوچەکە بەگشتی کاریگەری لەسەری هەبووە، بۆتە هۆی ئەوەی نەتوانێت ببێتە شاریکی خەملیوو بنەماکانی شاری تێدا پچەسپێ و پێناسەی شارێکی تەواو و کراوە و هاوچەرخ بەرجەستە بکات، وەک ئاشکرایە لێکچواندنێکی زۆر هەیە لە کەلتور و دابونەریتی،[٢] شار و ناوچە کوردیەکانی باشووری کوردستان. ئەم لێکچواندنەش پەیوەست بە قەبارە و بچوکی و گەورەیی شار و دووری و نزیکی گوند لە شار و شار لە شار، هاتووچۆ و تێکەڵاو بونیان و کرانەوە بە ڕووی دەورووبەردا، مێژووی کەلتوور و دابونەریتی ناوچەکە دابەش دەبێت بەسەر چەند خالێکدا، کە لە خوارەوە باسی دەکەین:

### ١-خێزان – ئافرەت-پەروەردەی منداڵ- پرۆسەی هاوسەرگیری:

خێزان پێکهاتەو بەردی بناغەی هەموو کۆمەڵگایەکە، بە هۆی خێزانەوە ئاشنا دەبێت بە هەموو تایبەتمەندیە نەتەوەییەکانی گەلێک، خێزانی کورد ئاوێنە و ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگاکەیەتی و باشی و خراپی کۆمەڵگای کوردی پەیوەستە بە خێزانەوە.[٣] بە شێوەیەکی گشتی خێزانی کوردی پێکهاتووە لە پیاو ژن و منداڵ بە هەردوو ڕەگەزەوە،[٤] سروشتی خێزانی کوردی یەکگرتووە و باوک و باوکە گەورەو نەوەکان لە ناو یەک خیزان ژیان بەسەردەبەن، ئەم ژیانە هاوبەشە وا لە تاکەکان دەکات، کە هەست بە پشت و پەنا بکەن، کاتیک خێزان خواردن و جل وبەرگ و پێویستییەکانی بۆ دەستەبەر بکات، تاک هەست بە دورە پەرێزی و گۆشەگیری نەکات، لە ڕووی پەیوەندی خێزانیەوە باوکە گەورە دەسەڵاتی گەورەی هەیە و لەدوای ئەویش باوک دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی خێزانی هەیە بەڕەچاوکردنی بۆچوونی ئافرەت و منداڵەکانی، دایکیش لە خێزاندا پایەیەکی گەورەی هەیە،[٥] مینۆرسکی دەڵێت: "لە ناو گەلانی مسوڵماندا کورد زۆرترین سەربەستی بە ئافرەت داوە"، ئافرەتی کورد، جگە لە بەجێگەیاندنی ئەرکی خێزانی، هاوشانی پیاوەکانیان ئیش و کاری دەرەوەش دەکات

---

[١] بۆ زانیاری زیاتر لە سەر کلتوور و ئاشنابوونی زیاتر پێی بروانە: داریوش ئاشوری: چەمک و پێناسەی فەرهەنگ (کەلتوور)، و، ئیبراهیم حەسەن پور، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٣.

[٢] بۆ زانیاری زیاتر لە دابونەریت چییە و چی ئەگرێتەوە بروانە: د. حوسێنی خەلیقی: کۆمەڵناسی کوردەواری، ب٢، بەغدا، ١٩٩٢، ل٤٧-٥١.

[٣] د.احمد محمود الخليل: الشخصية الكردية، مطبعة موكريان، اربيل، ٢٠١٣، ص٢١٣.

[٤] مارتین ڤان برونەس: ئاغاو شێخ و دەوڵەت، و:د.کوردۆ عەلی، چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٩٣.

[٥] د.احمد محمود الخليل: السابق، ص٢١٤.

بۆیە زوو دیاردەی پیرییان لێهەڵدەدات، لەڕووی ڕەوشتیشەوە زۆر ڕەوشت بەرزن.[١] ژیانی ئافرەت لە ڕانیە دابڕاو نەبوو لە ناوچەکانی تری کوردستان، کاری ئافرەت وەک پیشەیەکی ڕۆژانە بریتی بووە لە بەخێوکردنی منداڵ، ئامادەکردنی خۆراک، نانکردن، ڕێکخستنەکانی ناوماڵ، پێش هاتنی ڕاکێشانی بۆڕی ئاو بۆ گەڕەکەکانی ناوشار. دەبوایە بە سەتڵ و تەنکە ئاو لە سەرچاوەی قولەو ڕەشەمێرگ بهێنن وەک پێویستەیەکی ماڵداری و ڕۆژانە ئەم کارە دووبارە بۆتەوە و ئەرکێکی زۆریان پێوە کێشاوە، زۆرجار بە هۆی بە خێوکردنی ئاژەڵ لە ناوشار سەرچاوەکان پیس بوون و بۆتە گرفتێکی گەورە بۆ ئافرەتی شارۆچکەکە، بەڵام دواتر بە هێنانی خزمەتگوزاری و ڕاکێشانی ئاو بۆ گەڕەکەکان ئەم کارە کۆتایی هاتووە، ئافرەت جگە لەئیشی ماڵەوە لەگەڵ پیاو بەشدار بووە لە بەدەستهێنانی سەرچاوەکانی بژێوی ژیان، وەک دروستکردنی بەرهەمەکانی شیرەمەنی ئاژەڵ و فرۆشتنیان لە بازاڕ و کاری هەرەوەزی کشتوکاڵ.[٢]

لە ڕووی کەلوپەل و قاپ و پێداویستییەکانی ناوماڵ تا حەفتاکانیش لە ڕانیە تەنها قاپی شووشە و مس هەبووە کە مامەڵە لەگەڵیان قورس بووە، دواتر فافۆن پەیدابوە لە هەشتاکانیش پلاسکۆ ونایلون پەیدابووە، پێش پەیدابوونی سفرەی نایلۆن بۆ نانخواردن سینی بەکارهاتووە، دواتر بووبە نایلۆن نانخواردنیش لەسەر زەوی بووە، مێزیان بەکار نەهێناوە،[٣] بە شێوەیەکی گشتی ژیانی ئافرەت لەڕانیە زۆر قورس بووە، کەلتووری خێڵ لە ناوچەکە باوبووە، سەربەستی بۆ ژن زۆر کەم بووە، تا ساڵی (١٩٦٠) خەڵک بەکارێکی نەشیاویان زانیووە، کچ بنێرن بۆ قوتابخانە، سانسۆر لە سەر ئافرەت زۆر بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ساڵی (١٩٩١) دیاردەی خۆکوشتن و خۆسوتاندن لە ناو ئافرەتاندا نەبووە.[٤] لە دوای ساڵی (١٩٦٠) بەهۆی ئەو دۆخە سیاسیەی هاتۆتە ئاراوە هۆشیاری لای ئافرەتان گەشەی سەندووە و لە ساڵی (١٩٦٣) کۆمەڵەی ژنانی ڕانیە وەک ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەلا یەتی، لەلایەن کۆمەڵێک ئافرەتەوە دامەزراوە لەوانە(مریم صدیق، گەلاوێژی وەستا شەفیق، ئاسۆس میرزا مەنگوڕی، میری محەمەدنەبی، مەلاحەت عومەر ئاغا)، ئەم ڕێکخراوە لەم کاتەدا ڕوڵی گرنگی هەبووە، لە ڕووی کۆبوونەوە لە ماڵان و ئاشناکردنی ئافرەت بە مافەکانی، بەڵام دواتر بە هۆی

---

[١] وەرگیراو لە: باسیلی نیکیتین: الکرد دراسة سوسیولوجیة و تاریخیة، تقدیم، لویس ماسینون، نقلة من الفرنسیة و علق علیة، د.نوری طالبانی، مکتب الفکر و التوعیة (الاتحاد الوطني الکردستاني)، سلیمانیە، ٢٠٠٦، ص١٧٣-١٧٤.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ حەبیبە عەلی ڕەشید: ٢٠١٦/٣/٥، ڕانیە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٦ لە ڕانیە لە دایک بووە، ژیانی هاوسەری پێکهێناوە و خاوەنی چەندین منداڵ و نەوەیە.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریم حمد شێخە: ٢٠١٦/٣/١٢، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٦ ڕانیەیە و دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵە، ئێستا پیشەی فەرمانبەرە، چالاکوانی بواری ئافرەتانەو لێپرسراوی لقی ڕاپەڕینی یەکێتی ژنانی کوردستانە.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، ئامینە مەلا عومەر محەمەد: لە ٢٠١٦/٣/١٦، ڕانیە، ناوبراو لەدایک بووی ١٩٥٥، ڕانیەیەو تا قۆناغی ناوەندی خوێندووە و خێزاندارەو ژنی ماڵەوەیە.

ئـاڵۆزبوونی دۆخـی سیاسـی ڕێکخراوەکـە هەڵوەشـاوەتەوە،[1] لـە مـاوەی سـاڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) دا کۆمەڵێک ئافرەتی ناودار و پایەبەرز لە بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیاندا لە ڕانیە دەرکەوتوون، وەک (کۆتر خاڵند بەگ شکاک ناسراو بە نەنەکۆتر، ناجیە حەمە مستەفا، ئایشە باپیر خدر ناسراو بەئایشە قەساب، عائیشە ئیسماعیل ڕەحمان ناسراو بە ئایشە ڕانک، حەلیمە خدر ناسراو بە نەنەحەلە، هەمین حەمە خدر هەمینە شۆڕ).[2]

یەکێک لە ئەرکە گرنگ و قورسەکانی ئافرەت برتیی بووە لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ و[3] چاودێری کردنی،[4] بە هۆی کەمی خزمەتگوزاری و نەخۆشخانە و نەبوونی دکتۆری پسپۆر لەناوچەکە، زۆریک لە ئافرەتەکان لە کاتی منداڵبووندا بە هۆی نەبوونی نەشتەرگەری گیانیان لە دەستداوە، تا ساڵی (١٩٨٢) زۆر بەکەمی نەشتەرگەری منداڵبوون لە ڕانیە ئەنجامدراوە، ئەو نەشتەرگەریەی کە کراویشە زۆر سەرکەتوو نەبووە، لە ڕێگەی مامانییەوە زۆرێک لە کارەکان ئەنجامدراوە، جگە لەوە نەخۆشی لە ناو منداڵان زۆر بڵاو بووە، وەک نەخۆشیەکانی (ئاوەڵە، زەردویی، سووورێژە، مێکوتە)، زۆرێک لە منداڵەکان بەهۆی نەخۆشیەوە گیانیان لە دەستداوە[5]

جگە لەوەنەریتی ناوچەکە وەک هەر ناوچەیەکی تری کوردەواری لەدایک بوونی منداڵی کوڕ خۆشەویست تر بووە وەک لە کچ، کاتێکیش منداڵ لەدایک بووە، مەلا یان شێخیان بردووە سێ جار بانگیان بە گوێی دا چرپاندووە قورئانێکیان لەلا داناوە، شەوانەش بەجێیان نەهێشتووە تابەیانی بەرامبەری وەستاون نەوەک شەوە[6] لێی بدات کاتێک گەشکەو زەردویی یان هەرنەخۆشیەکی تری توشبووە وتویانە شەوە لێیداوە تەواوی خێزان بەرامبەری وەستاون، لەگەڵ گەشەکردنی دروستکراوی لانکە، لانکە بۆ بەخێوکردن بەکارهاتووە، شیریش زیاتر شیری دایک بووە بەڵام شیری قوتوش بەکارهاتووە، بۆ پاک و خاوێنی منداڵ تەنها پەڕۆ و نایلۆن بەستن هەبووە پێیان وتوە بەسمە، ئەو کاتە دایبی(nappy) بەکارنەهاتووە، تۆزی بۆدرەش بۆ سووتانەوە سودی لێوەر گیراوە، کاتێکیش منداڵ تەمەنی گەیشتۆتە قۆناغی بە پێ ڕۆیشتن، جا کچ بووبێت، یان کوڕ خەتەنە کراوە،

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریەم سدیق ئەحمەدخان بەگ: لە ٢٠١٦/٣/٩، ڕانیە، ناوبراو لەدایک بووی ١٩٤٨، ڕانیەیەو خوێندەوارە و لە ساڵی ١٩٦٥ بۆتە پێشمەرگەو چۆتە شاخ، ئێستا خانەنشینە بە پلەی عەقید.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریم حمد شێخە: ٢٠١٦/٣/١٢.

[3] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بەخێوکردنی منداڵ و ژیانی ئافرەت لە کوردستان بڕوانە: هێنی هارۆڵد هانس: ژیانی ئافرەتی کورد، و:عەزیز گەردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٨٣.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، ئامینە مەلا عومەر محەمەد: لە ٢٠١٦/٣/١٦.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فاتمە عەلی ئەحمەد: لە ٢٠١٦/٤/١، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٥ ڕواندزەو لە ١٩٦٥ هاتۆتە ڕانیە و دەرچووی ئامادەیی پەرستاریی هەولێرە و ئێستا فەرمانبەری خانەنشینە.

[6] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر دیاردەی شەوە بڕوانە: تۆمابوا: ژیانی کوردەواری، و: حمە سعید حمەکریم، ١٩٨٠، ل١٢٤-١٣٦.

وەک پـەروەردەی منـداڵیش دایەنگـە لـە ڕانیـە نـەبووە، باخچـەی سـاوایانیش لـە دوای سـاڵی (١٩٧٥) پەیدابووە، کاتێکیش منداڵ تەمەنی بووە بە شەش بۆ حەوت ساڵ خراوەتە بەر خوێندن.[١]

پرۆسەی هاوسەرگیری لەناو کوردا زۆر بە شێوازێکی داخراو ئەنجامدراوە، وەها نەبووە، کە ببێتە هۆی دروستبونی خێزانێکی بەختەوەر خەرجی ژنهێنانیش پەیوەست بووە بە داهاتی ئابووری کەسـەکانەوە،[٢] کـچ کـە گەیشـتۆتە تەمـەنێکی پێگەیشـتوو داخـوازی کـراوە، دوای ڕەزامەنـدی کچەکـە کەسوکاری کوڕەکە چوون بۆ داخوازی،[٣] کچەکەش پرسـی بـە دایکی کردووە، دوای بیرکردنـەوەو لێکدانەوە بە باوکی وتراوە، دواتر بە چوونی کۆمـەڵێک پیاوی ڕێزدار بۆ مـاڵی کچ، قۆنـاغی شـەکراو خواردن و مارەبڕین دەستی پێکردووە.[٤] لـە ڕانیـە تـا سـاڵی (١٩٧٠) کـەمتر لـە داخـوازی کـردن پـرس بەکچ کراوە، پرس پێکردنیش هـەبووبێ کـەم بووە، کاتێک کەسێکی ڕیش سپی چۆتـە مـاڵی کچەکە، باوک و دایکی کچە بە کەسەکەیان وتووە ئێمە لە بـەر شکۆی تـۆ ئـەم کچـە دەدەینـە ئـەم کوڕە، هـیچ قورساییەک بۆ بڕیاری کچ دانەنراوە، کچ مارەکردنیش لە سەر شـێوازی ئیسـلام و مەزهـەبی شـافیعی بووە.[٥]

لــە ڕووی زێڕکردنەیشــەوە زێـڕ (١٠) بـۆ (١٢) مســقاڵ کـراوە و دواتـر گۆڕانکـاری بەســەر ڕێژەکەی داهاتووە، خانووی سەربەخۆ بۆ هاوسەرگیران زۆر کەم بووە، نەریت بووە لە لەگەڵ دایک و باوکی کوڕەکە بژیایە.[٦] دیاردەی عەشـق و خۆشەویسـتی و هـەبووە، بـەڵام سنوردار بووە، کوڕو کچـە خوێنـدەوارەکان لـە ڕێگـەی نامـەی نووسـراو ئـەم پەیوەندیـەیان بەسـتووە و ئەوانـەی کـە خوێندەواریشـیان نـەبووە لـە ڕێگـەی کەسـێکەوە کـە پێـی ووتـراوە دەڵاڵ کـە زیـاتر ئـافرەت بـووە کارەکـەیان ئـەنجام داوە، لـە ڕانیـەش شـێوازی ژن هێنـان و شـووکردن وەک هـەر ناوچەیـەکی تـری کوردسـتان بووە، چەنـد جۆرێکی هـەبوو.[٧] کـە بریتیبوون لـەم شێوازانە:(شـیربایی/ بڕێـک پـارە یـان هەرجۆرێکی تـر لـە سـامان لـەبری پێدانی کچ وەرگیراوە، زاوابەند/ زاوا دەبوو بـەرەنجبـەری ماڵێک دواتر کچەکەیان داوە پێی، گەورە بە بچووک/ ئافرەتێکی هـەرزەکار ئەگوڕدرایەوە بـە کچێکی منداڵ یان بە دووان، کە گەورە دەبوون دەدرانەوە بەماڵی کچە وەرگیراوە هەرزەکارەکە، خوێن خوشکردن/ کچێک یان دووان دەدران بە ماڵی کوژراو لەبری خوێن، ژن بەسەر هێنان/ پیاو بۆی هـەبوو تـا چوار

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئامینە مەلا عومەر محەمەد: ٢٠١٦/٣/١٦.

[٢] حسـێن ئیسـماعیل عـەزیز: ژیـانی کۆمـەڵایـەتی لیـوای سـلێمانی لـە نێـوان سـاڵانی(١٩٢١-١٩٥٨)، تێـزی دکتـۆرا (بڵاونەکراوە)، کۆلیژی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠١٤، ل١٢٤.

[٣] لەسـەر نەریتـەکانی داخـوازیکردن و هاوسـەرگیری بڕوانـە، حـەمید ڕەشـاش: ژیـانی کـوردەواری، چاپخانـەی حـاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، ل٩٣-٩٧.

[٤] زکیە ڕەشید محەمەد ئەمین: نەریت و کلتووری کوردی، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٢، ل٤٩.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد سەلیم سەعید: ٢٠١٦/٣/٢٣.

[٦] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ حەبیبەعەلی ڕەشید: لە ٢٠١٦/٣/٥.

[٧] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریم حمد شێخە: ٢٠١٦/٣/١٢.

کچ بهێنێ، بنەتۆو/ کوڕ کاتێک هاوسەری دەکرد گەر خوشکی نەبوایە دەبوایە لە داهاتوو کچێک یان دووان بداتەوە ماڵی خەزووری، سێ بەسەرە/ گۆڕینەوەی کچ لە نێوان سێ خێزان یان کوڕ، ئەم شێوازە خولی بووە خێزانی یەکەم دەیدا بە دووەم، دووەم بە سێیەم، سێیەم بەیەکەم، ...هتد).[١]

لە سەر قوربانی دانی ئافرەت لە سەر ئەم شێوازی شووکردنانە، لە ڕانیە لە چیای کێوەڕەش لە دۆڵی دۆڵیشکێ، شوێنیک هەیە پێی دەڵێن گۆڕ مریەم، کە بەناوی کچێکەوە ناونراوە ناوی مریەم بووە، لەبەر ئەوەی ئامادە نەبووە شوو بەکەسێکی زۆر بەتەمەنتر لە خۆی بکات لەوێ کوژراوە، کە تا ئێستاش وەک ڕەمزی قوربانیدان و چەوساندنەوەی کەلتووری مێینە ئەم ناوە بەزیندویی ماوەتەوە،[٢] جگە لەم شێوازی شووکردنانە، کە باسکرا، دیاردەی ڕەدوکەوتن و کچ و ژن هەڵگرتن تا (١٩٨٠) لە ڕانیە و ناوچەکانی دەورووبەری هەبووە، بەڵام دواتر زۆر کەم بووە، کاتێک کچ گواستراوەتەوە ئاهەنگ ساز کراوە، پێش ساڵی (١٩٥٨) کە جوولەکەکان لە ڕانیە بوون بوکیان سواری ئاژەڵەبەرزە کردووە و پەردەیەکیان پێداداوە بەناو شار گێڕاویانە، ئەم دیاردە دواتر خەڵکی تریش کردوویەتی، لە کاتی بووک گواستنەوە ڕۆژێک یان سێ ڕۆژ هەندێک جار تا یەک هەفتە ڕەشبەڵەک و شایی و دەهۆڵ و زورنا لێدراوە، لەکاتی گواستنەوە و شەوی گواستنەوە تەقە بەچەک کراوە، بەتەقەکەرانیش ووتراوە (لەشکری بوکێ)، ئەم دیاردە تا ساڵی (١٩٧٠) لە ڕانیە بوونی هەبووە، لە دوای گواستنەوەش کێشەی بەستن هەبووە لەگەڵ کێشەی نەگونجانی بووک و خەسوو، زاوای بەستراویش براوەتە لای مەلا، یان شێخێک بۆ ئەوەی لەو بەستراویە ڕزگاری بێت.[٣]

**٢- بۆنە نەتەوەیی و ئایینییەکان**

لە ڕانیە جگە لە مسوڵمان، جولەکە و مەسیحیشی تێدا ژیاوە، جولەکەکان تا سەرەتای ساڵانی پەنجاکان لە ڕانیە بوونیان هەبوو دواتر بەتەواوی کۆچیان کردووە، ئەم جولەکانە جەژنێکیان هەبووە پێیان وتووە (کەپرە شین)، کە بۆ ڕزگار بوونی پێغەمبەر موسا (د.خ) سازکراوە، ماڵە جولەکەکان بە گوڵ و کەلوپەلی جوانکاری کەپرێکیان لە بەردەم ماڵیان ڕازاندۆتەوە و شیرینیان دابەش کردووە، مەسیحیەکانیش کە فەرمانبەر بوون لە ناو ماڵی خۆیاندا یادی بۆنە ئایینیەکانیان کردۆتەوە.[٤] بە گوێرەی ئایینی ئیسلام دوو جەژنی سەرەکی هەیە (ڕەمەزان و قوربان) ئەم جەژنانە ئامادەکاری

---

[١] بوار نورەدین: دەنگی مێینە لە گۆرانی فۆلکلۆری کوردیدا، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٠-٣١.

[٢] مێژووی ڕووداونی ئەم ڕووداوە بۆ سەدەی(١٨) دەگەڕێتەوە، مریەم کچێک بووە خەڵکی گوندی چنارانی ناوچەی بناری کۆسرەت بوو، بە هۆی بێکەسی و لە دەستدانی بنەماڵەکەی بۆتە خزمەتکاری ماڵێک لە ناوچەی مەرگە، لای پیاوێک بەناوی حاجی بایز، ئەم حاجی بایزە، داوا لە مریەم دەکات شووی پێبکات، بەڵام مریەم ئەمە ڕەتدەکاتەوە ڕادەکات بۆ ڕانیە و دواتر بۆ چیای کێوەڕەش، لەوێ لە لایەن حاجی بایزوە دەکوژرێ. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: کامەران: ناوی گۆڕمریەم لە چیەوە هاتووە، گۆڤاری ڕانیە، ژ(١٨)، کانونی یەکەمی ٢٠٠٦، ل٣٥.

[٣] چاوپێکەوتن لەگەڵ خدر حسێن ئەحمەد( هەرتەلی): ٢٠١٦/٣/٥؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ عەلی خدر حەمەد(ئالی نفوس): ٢٠١٦/٣/٧.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر حسێن ئەحمەد(هەرتەلی): ٢٠١٦/٣/٥.

زۆریان بۆکراوە لەلایەن مسوڵمانانەوە، وەک کڕینی جلوبەرگی تازە و هەندێک پێویستی تر، ڕۆژێک پێش جەژن خواردن ئامادەکراوە و خەڵک بۆ ڕۆژی جەژن ڕوویان کردۆتە مزگەوتەکان و دوای گەردن ئازادی و جەژنە پیرۆزە گەڕاونەتەوە بۆ ماڵەوە و خواردنی بەیانیان ئامادەکراوە، بەیانیانیش سەردانی گۆڕستانیان کردووە، دواتر سەردانی کردنی ماڵان و شیرینی و شەربەت و نوقڵ و چوکلێت دابەشکراوە، لەگەڵ ئاشتکردنەوەی ئەو کەسانەی کە پەیوەندی نێوانیان تێکچووە.[١]

مانگی ڕەمەزان لە ڕانیە تایبەتمەندیی خۆی هەبووە، لە ڕەمەزاندا شەوانە یاری فۆلکلۆری ئەنجامدراوە، هاوشاریان زۆر بە چێژ و تامەزرۆوە ڕوپانکردۆتە ئەم یارییە فۆلکلۆریە کوردییانە،[٢] لە کاتی بەربانگ و پارشێوان لەلایەن بەناوی مام عەبدوڵلا (کوێرە) دەهۆڵ لێدراوە، کە زۆر خۆشەویست بووە لای خەڵک،[٣] جگە لەمام عەبدوڵلا دواتر فەرەجی دەهۆڵ کوت و عەباسە شەل، درێژەیان بەم کارە داوە، لە جەژنی قوربانیشدا وەک ئەرکێکی ئایینی بەپێی پێویست ئاژەڵ سەربڕدراوە، گۆشت بەسەر ماڵاندا دابەشکراوە.[٤] لە جەژندا خەڵکی ڕانیە لەماڵ چوونەدەرەوە بۆ سەرگردە دێمە وسەروچاوەی ڕەشەمێرگ بۆ سەیران، لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا لە زۆربەی جەژنەکان منداڵان بە سواری تراکتور، کە هی ماڵی سەعید بەگ و عەلی بەگ بووە بردراون بۆ بۆسکێن و سەیداوا و دەربەند بۆ پیاسە و گەڕان، لەناو ڕانیە یەک چەرخ وفەلەکی چوار کورسی هەبووە، کەمنداڵان لە جەژنان چوون بۆ سوار بوونی.[٥]

مەولودنامەش بۆنەیەکی تری ئایینی بوو، کە لەڕانیە ئەنجام دراوە ئەم بۆنەیە بۆ ڕۆژی لە دایک بوونی پێغەمبەری ئیسلام محمەد (د.خ)، ئەنجامدراوە کەسی مەولود ئەنجامدەر ئاژەڵێکی سەربڕیوە خۆراکی ئامادەکردووە، کە زیاتر گەنمەکوتاو بووە، تەنزیلەیان ئەنجامداوە بۆ بۆنەکە کە بریتی بووە لە سەڵاوات، سرود، ستایش.[٦] جگە لە بۆنە ئایینیەکان بۆنەی نەتەوەییش هەبووە لە ڕانیە وەک نەورۆز،[٧] لە پێش ساڵی (١٩٥٨) واتا سەردەمی پاشایەتی یادکردنەوەی نەورۆز لە ڕانیە قەدەغە

---

[١] حسێن ئیسماعیل عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠.

[٢] کامەران عەبدە سالح: شەوانی ڕانیە و یاریە فۆلکلۆریەکان، گۆڤاری ڕانیە، ژ(٩)، ئەبلولی٢٠٠٤، ل١٢.

[٣] عەبدولواحید و هێرش: فاروقی مەلا فاتح بیرەوەریەکانی بۆ گۆڤاری ڕانیە ئەگێڕێتەوە، گۆڤاری ڕانیە، ژ(٥)، ئابی ٢٠٠٣، ل٢١.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئازاد فەقێ ڕەسول: ٢٠١٦/٣/٢٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٤ ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگای تەکنەلوجیای موسڵەو ئێستا فەرمانبەرە لە شارەوانی ڕانیە، شارەزای کەلتوری ناوچەکەیە.

[٥] عەبدولواحید و هێرش: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١.

[٦] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر حسێن ئەحمەد(هەرتەلی): ٢٠١٦/٣/٥.

[٧] یادکردنەوەی نەورۆز لە باشووری کوردستان مێژوویەکی زۆر کۆنی نیە و بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، پیرەمێردی شاعیر بە پێشەنگی یادکردنەوەی ئەم دیاردەیە دادەنرێت. بڕوانە د.هیمداد حوسێن: کەلتور وفەرهەنگی کوردی، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٩، ل٥١.

بووه، بە شێوەی شاراوە و نهێنی یادی ئەم بۆنەیە کراوەتەوە،[١] لە دوای ساڵی (١٩٥٨) زیاتر لە ماڵان ئاگری نەورۆز کراوەتەوە بە هاتنی ئەم یادە منداڵان ئاگری بچوکیان لەسەربانی خانووی ماڵان داگیرساندووە، بەڵام لە دوای (١٩٧٠) شێوازێکی فەرمیی وەرگرتوە و لەسەر چیاکانی دەوربەرەری ڕانیە ئاگر کراوەتەوە تایەی ئۆتۆمبێل سوتێنراوە، بەڵام دواتر بەهۆی تێکچوونی دۆخی سیاسیەوە بۆنەی نەورۆز دووبارە قەدەغەکراوەتەوە، گەنجەکان زیاتر منداڵانیان هانداوە بۆ یادکرنەوەی ئەم بۆنەیە، حکومەتی عیراقیش هەندێک جار چاوپۆشی لێکردووە، هەندێکجاریش پەرچەکرداری هەبووە، ئۆتۆمبێلی ئاگرکوژێنەوەی ناردوە بۆ کوژانەوەی.[٢] لە دوای ساڵی (١٩٦٠) لە بەهار و هاتنی نەورۆز خەڵک چووەتە دەرەوەی شار، بەتایبەت بۆ سەروچاوەی ڕەشەمێرگ، لەوێ شایی و ڕەشبەڵەکیان کردووە و خواردنیان ئامادەکردووە.[٣]

**٣- یارییە فۆلکلۆرییەکان و نەریتەکانی هاوشێوەی**

یارییە فۆلکلۆرییەکان لە ڕانیە بەپێی تەمەن دابەش بووە (بچووک، ناوەند، گەورە) یارییەکان بریتی بوون لە (تەڵە ڕێوی، هەی داد، جۆجۆیانێ، شێتەڕەقە، ڕسمانێ، لوزیلە، بندەستە، پێنج بەردانێ، لیگاو، ڕمبازی، کۆلارەهەڵدان، خش خشۆکە لەگردەدیمە دەکرا، دەست بڕین، کەلایانێ-هەڵماتێن، محەلەبی شکاندن، لەقلەقێنێ، بازبازێن، تۆپی داری، کێلە بەردانێ، قەرەقەڕۆ، ...هتد)، یاری دامە و نۆڕیزە و سێڕیزەش لەم ماوەیەدا لە ناو باخی گشتی ڕانیەدا بەبەرەوامی کراوە،[٤] جگە لەم یارییانە بووکە بەبارینێش هەبووە، کە لەسەرەتای وەرزی پایزان ئەنجامداوە، منداڵ پەڕۆیەکیان بەدارێک دا کردووە و گێڕاویانە، بە گۆرانی "بووکە بەبارانێ، سەعاتی جارانێ ..."، بەماڵاندا گەڕاون و لەکاتی گەڕاندا کەسێک هاتۆتە دەرەوە و ئاوی بەبوکەکەدا کردووە، گوایە ئەم کارە دەبێتە هۆی باران بارین، شەوانی بەراتیش هەبووە منداڵان تورەکەیەکیان هەڵگرتووە بەماڵاندا گەڕاون بە گۆرانی "ئەم شەو شەوی بەراتە، ..."، شیرینی و خواردنیان کۆدەکردۆتەوە، لەکاتی گیرانی مانگیشدا لە تەنەکەدان هەبووە، کە کەسێک بە توندی کێشاویەتی بەتەنەکەکەدا، گوایە بەم کارەی مانگ لە گیران ڕزگاری دەبێت، شەڕە گەڕەکیش کە بەشەڕە بەرد ناسراوە، جۆرێکی تر بوو لە نەریتی ناوچەکە، کە لە نێوان

---

[١] عەبدولواحید و هێرش: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئازاد فەقێ ڕەسول: ٢٠١٦/٣/٢٠.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریم حمد شێخە: ٢٠١٦/٣/١٢.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ کاکەمین ڕەسوڵ کاکەمین: ٢٠١٦/٣/٢٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٤ ڕانیەیە و هونەرمەندە و وێنەکێشە، دەرچووی پەیمانگای تەکنەلۆجیای موسڵەو ئێستا فەرمانبەری شارەوانیە؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر ئەحمەد ئیسماعیل: ٢٠١٦/٣/٢٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٧١ ڕانیە و بەئاگا و شارەزای کەلتووری ناوچەکەیە و نووسین لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا هەیە، کاری ئازاد دەکات.

گەڕەکی سەراو و ڕەشەمێرگ و گلنجان و ئازادی و ئۆردوگای ڕانیە لە لایەن منداڵ و گەنجەکان ئەنجام دراوە، تیایدا قۆچەقانی و دار لاستیک بەکارهاتووە.[١]

هەندێک یاری فۆلکلۆری تایبەتیش هەبووە، کە شەوانە لە بۆنەکاندا کراوە، وەک (سینی وفنجان، چەپەڵە زڕێ، ڕاوەژیشک، کۆڵ کۆڵێنە، مەلا تەقتەقێنە، حەوت ئەستێرە بژمێرە، کڵاوێن)،[٢] شەڕەکەو و شەڕە کەڵەباب و شەڕە سەگ نەریتێکی تری ناوچەکە بووە، بەڵام شەڕە سەگ زۆر کەم بووە. دیاردەی ڕاگرتن و گرنگیدان بە باڵندە و پەلەوەر لە ڕانیە بۆ ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، زیاتر لە ناو ڕاوچی و کەسانی خانەدان و دەوڵەمەندا باوبووە، خەڵکی ڕانیە ئارەزوویەکی زۆریان بۆی هەبووە لە ماڵان و لە شوێنی تایبەت باڵندە و پەلەوەری تایبەتییان ڕاگرتووە، وەک: کەو لە جۆرەکانی (قەرچووخی، سوور، ڕەش، سپاتی)، کەڵەشێرو مریشک لە جۆری (شامی) لە ئێران وتورکیاو سوریاوە هاتووە، کۆتری (جوڕە- عەردی- فڕین- نامەبەر- زاجل)، باڵندەی (بولبول، کەناری، حوب، منس، قەلەباچکەی قسەکەر، مینا، قومری، خندور)، ئەم پەلەوەرانە لە ڕووی خۆراک و خزمەتکردنەوە ڕاگرتنیان ماندووبوون و تێچوویەکی زۆری ویستووە، کەو و کەڵەشێریش بۆ شەڕکردن بەکارهاتووە شەڕە کەڵەشێریش لەماڵان کراوە و لەسەر پارە ئەنجام دراوە، شەڕەکەویش یەکێک بوو لە نەریتەکانی ڕانیە، لەکاتی شەڕەکەودا کەو کە براوەبوایە نرخی زۆر گران و خەیاڵی کردووە، کە کەوێکیش لە شەڕ دۆڕابوایە بۆی نەبووە جارێکی تر لەم شارە شەڕی پێبکرێتەوە،[٣] لە ڕانیە چەندین کەوبازی بەناوبانگی هەبووە، وەک (محەمەد حەمە عەزیز، غەریب مام حەسەن، محەمەد دەرباز، ئەنوەری خاڵە حەمە، عەلی زێڕنگەر، کەریم چەخماخچی).[٤]

**٤- شایی و گورانی میللی و پەند وئیدۆم**

لەگۆرانی فۆلکلوری کوردیدا،[٥] مرۆڤی کورد گوزارشت لە خولیاو ئارەزووەکانی دەکات، لەگەڵ ئارەزوی خەڵکانی تر، لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە، کەپەیوەندی بەژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەوە هەیە، گۆرانی لەلایەن گەنج و بەتەمەنەوە دەوترێت، میللەتی کورد کەلتورێکی دەوڵەمەندی هەیە لەم بوارەدا.[١]

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ حوسێن عەلی فەیسەڵ: ٢٠١٦/٤/٣٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٤ ڕانیەیە، بنەماڵەکەی لەکۆنەوە نیشتەجێی ڕانیەن و تا قۆناغی ناوەندی خوێندووە و ئێستا فەرمانبەرە لە پەروەردەی ڕانیە.

[٢] کامەران عەبدە سالح: شەوانی ڕانیە، ل١٢.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عبدلله ڕەزاق فەتاح مەحمود: ٢٠١٦/٣/١١، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٣ ڕانیەیە و لە منداڵیەوە خولیای بەخێوکردنی باڵندەی کەوە و شارەزایەکی زۆری هەیە لە سەر کەو و بەخێوکردنی و جۆرەکانی.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سامی کاکەمین عەزیز: ٢٠١٦/٣/٣١، ڕانیە، لە ١٩٥٦ لە ڕانیە لەدایک بووە، شارەزای بواری بەخێوکردنی باڵندە پەلەوەرەو لە منداڵیەوە بەم کارەوە خەریکە.

[٤] کامەران عەبدە: کەوبازی لە دیدی کەوبازێکی بەئەزمونی ڕانیەوە، گۆڤاری ڕانیە، ژ(٨) حوزەیرانی ٢٠٠٤، ل٤٦.

[٥] بۆ جۆرەکان و شێوەکانی گورانی فۆلکلوری کوردی بڕوانە عەباس چنارانی: کەلەپوری کوردەواری، هەولێر، ٢٠١٥، ل١١٦-١١٧.

ڕانیه و سروشتی ناوچەکه هەمیشه هاندەر بووه بۆ ڕووکردنه گۆرانی بێژ و هونەرمەندان و دەرکەوتنی گۆرانی بێژی میللی له ناوچەکه، له ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) کۆمەڵێک هونەرمەند سەردانی ڕانیەیان کردووه وتیایدا ماونەتەوه و ئاهەنگیان تێدا گێڕاوه، وەک: (حەسەن زیرەک، ڕەسوی نادری، کەریم کابان، سەید عەلی سەردەشتی، بەکری لەگزی، ناسری ڕەزازی، تاهیری خەلیلی)، زۆریان گۆرانیان بەسەر ڕانیەدا وتووه.[٢]

له ساڵانی (١٩٥٢-١٩٦٣-١٩٦٩) حەسەن زیرەک سەردانی ڕانیەی کردووه، لەیەکێک له گۆرانیەکانیدا دەڵێ:"ڕەبی ڕانیه ئاوابێت، ئاوەکەی ساردو سووکه، ئەشقی مریەم چاوجوانم، هەردەڵێی تازه بووکه"، لەگۆرانیەکی تردا دەڵی:"ڕاوەستاوه له هەیوانێ، فەیمه لەگەڵ ئایشەخانێ، کاک ئەکرەم بۆ پێم ناڵێی، تخوا مام جەرجیس کوانێ"، حەسەن زیرەک له وتنی هەردوو گۆرانیەکه تووشی کێشەی کۆمەڵایەتی بووه، به هۆی داخراوی عەقڵییەتی ئەوکاتی کۆمەڵگاوه.[٣] له ڕانیه کۆمەڵێک جۆری شایی هەبوو کەکردویانه، گرنگترین جۆرەکانیش بریتیبوون له: (سێ پێیی، چەپەیی، سوسکەیی، شێخانی، مڵانێ)، خەڵکی ڕانیه بۆ شایی و هەڵپەڕکێ و بۆنەکان ڕویان کردۆته (سەرچاوەی ڕەشەمێرگ، گردە دێمە، گردی ڕەشید ئاغا، سەیرانگای قەڵات)، کۆمەڵێک شایەر و دەهۆڵ و زوڕنا ژەن جۆش و خرۆشی زیاتریان به شایی و ئاهەنگەکانداوه، ناسراوترینیان ئەمانه بوون: (مەحمود چاوڕەش، کە خۆی گۆرانی وتووه و محەمەدی کوڕیشی دەهۆڵی لێداوه، زولیخا پشدەری، که به زوله چاوەش ناسراوه، قاسم، ڕەحیم چاوڕەش)، یەکێک له گۆرانیەکان که شایەرەکانی ئەوکاتی ڕانیه وتوویانه گورانی: "یاری من هەروا مەنده بن دۆخینی سفر بەنده، لێی گەڕێن ئیشی گەنده، یاری من کچه دیانه، کەمەری له نێوکانه، بۆم ببه به مسوڵمانه"،[٤] زولیخای شایەر لەم سەردەمه بەجۆرێک ناوی دەرکردووه، ئەوەتا نوسەرێکی وەک محەمەد ڕەسوڵ هاوار ئاماژه بەوه دەکات له ناوچەی پشدەر و ڕانیه زولیخا و تاقمەکەی ببوون به جێگری پۆست و ئیداره.[٥] جگه لەم گۆرانی و بەند بێژانه کۆمەڵێک کەسی تریش هەبوون کاریان لەم بوارەکردووه، وەک: (فەتاح سەوزەواری، ئاواتی مەلا عومەر، بەکری پیرۆت دەڵاڵ، خدر تەقەڵ).[٦]

له ڕووی پەند و ئیدیۆم و قسەی نەستەق و نوکتەو مەتەڵ و گاڵتەوگەپەوه، هەر دەڤەرێک له کوردستان، فۆلکلوری تایبەت به خۆی هەیه، ڕانیەش وەک هەر ناوچەیەکی تر ئەدەبیاتی فۆلکلۆری

---

[١] د. نوری یاسین هرزانی: مقدمة فی الفولکلور الکردی دراسة انثروبولوجیة اجتماعیة، مطبعة الشهید ازاد هورامی، کرکوک، ٢٠٠٦، ص١٩.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر ئەحمەد ئیسماعیل: ٢٠١٦/٣/٢٣.

[٣] هاوینی ١٩٦٢ لەسەر بەندێک گۆرانی خاوەن ماڵ بەشەو حەسەن زیرەکی لەماڵ دەرکرد: گۆڤاری شمشاره، ژماره(٥٥)، تەموزی ٢٠١٥، ل١١.

[٤] هەڵوێست: جۆرەکانی شایی له ڕانیه و دەوروبەری دا، گۆڤاری ڕانیه، ژ(١٠) کانونی یەکەمی ٢٠٠٤، ل٣٣-٣٤.

[٥] محەمەد ڕەسول هاوار: بیرەوەری: ئامادەکردنی، سدیق سالح، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٧٧.

[٦] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر ئەحمەد ئیسماعیل: ٢٠١٦/٣/٢٣.

خۆی هەیە، سنوری بیتوێن ناوچەیەکی کشتوکاڵییە، کە باران زۆر نەبارێت ناوەند ببارێت، گەنم و جۆ زۆر پڕ بەرهەمدەبێت ئەو پەند و ئیدیۆمە دەڵێن: "ساڵی ئیشک بیتوێن سەرپشک، ساڵی تەڕ بیتوێن لەڕ"، بەهۆی چڕی بێشە و قامیشەڵان و زۆنگی خاکەکەیەوە، لە ڕابردوودا نەخۆشی مەلا ریا و گرانەتا زۆر بووە بۆ ئەم کێشەیە ئەو گۆرانیە فۆلکلۆریەیان وتووە: "چەندەم پێگوتی کچێ خەجێ مەچۆ بیتوێنێ، ئاوی ناسازە، کچێ خەجێ هەر دەتفەوتێنێ، کەپرێکت بۆ بکەم کچێ خەجێ لە قولەی دەربەندی، دێمە لای بابت کچێ خەجێ بە زاوا بەندی"،[١] ناوچەی ڕانیە بەهۆی سیستەمی هۆزایەتی و سادەیی خەڵکەکە و نوکتەو بەسەرهاتی خۆشی و نەزیلەی زۆری هەیە و تێیدا ڕوویداوە.[٢]

**٥- جل وبەرگ و جوانکاری**

جل وبەرگ یەکێکە لە پێداویستیە گرنگەکانی مرۆڤ، جگە لە پێداوستی هۆکارێکیشە بۆ ڕازاندنەوە و جوان بەخشی و پێدانی رووکەشیەکی تایبەت بە مرۆڤەکان، لە ڕانیە لە دوای ساڵی (١٩٥٨) تەنوورە و جلی مۆدە هەبووە، بەڵام ئەوەی کەزۆر باوبووە لە ناوچەکە جلی کوردی بووە.[٣] جلی کوردی ژنانە بریتیبووە لە (کراس و کەواو سوخمە وسەڵتەو جفتەی گوڵنکەداری سەرو شان، ئاوەڵکراس، دەسماڵ و سرکەیی و شەدە شێڵەو کێشەی زەرد، ئەم کاڵایانەش بەکار هاتوون، وشک سوورمە، مانتۆر، کرێشە شاڵ، شتاڵی کودەری، قەیفەقەستۆر، جۆرجێت قەیفە، کەتان، گوڵ لیرە، چیت، حەریر، ...هتد)،[٤] خەڵکی ڕانیە لەو ماوەیەدا بەگشتی هەژار بوون و کەمتر گرنگیان بە مۆدێل داوە، عەبا هەبووە و بۆ دەرەوە بەکارهاتووە، تا ساڵی (١٩٨٠) ماکسی لە ڕانیە نەبووە، بە نەنگی سەیر کراوە، جل وبەرگی ژنان زیاتر لە ماڵان درواوە، هەندێک جار بردراوەتە لای بەرگدرووی پیاو.[٥] جل وبەرگی پیاوانیش بریتی بووە لەقاتی کوردی و بەکارهێنانی کڵا و جەمەدانەی ڕەش و سپی، جۆری قاتەکانیش (مراد خانی و کراسی و چۆغە) بووە لە لایەن بەرگدردوو درواوە، زیاتریش لە بۆنەکان جل و بەرگ کراوە.[٦]

لە بواری جوانکاریدا ئارایشتگای ئافرەتان لەم قۆناغەدا نەبووە، تەنها ساڵی (١٩٨٦) نەبێت ئافرەتێک لە سلێمانیەوە هاتووە بۆ ڕانیە و ئارایشتگایەکی کردۆتەوە، بەڵام دواتر بەماوەیەکی کەم دایخستووە، بواری جوانکاری زۆر کەم بووە، تەنانەت بووکیش لە ماڵ ڕازێنراوەتەوە و تارای سپی

---

[١] ئارارات ئەحمەد: قوتوی عەتار، قوتووی سێیەم، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٢، ل٣٣، ٤٧.

[٢] بۆ ئاشنابوونی زیاتر لەسەر بەشێک لە نوکتەو نەزیلە و بەسەرهات و قسە خۆشەکانی ئەم ناوچەیە بڕوانە ئارارات ئەحمەد: قوتوی عەتار، قوتووی یەکەم، مەڵبەندی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریم حمد شێخە: ٢٠١٦/٣/١٢.

[٤] زەکیە ڕەشید محەمەد ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریم حمد شێخە: ٢٠١٦/٣/١٢.

[٦] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد محەمەدئەمین ڕەسول: ٢٠١٦/٣/٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٥، ڕانیەیە، ٥٠ ساڵە پیشەی بەرگدورویی دەکات لەڕانیە.

ئەو شێوازە جل وبەرگی ڕازاندنەوە نەبووە، لە ساڵی (١٩٧٠) بەدواوە سوراو سپیاو خەنە و وسمە لەلایەن ئافرەتانەوە بەکارهاتووە.[١]

لە ساڵانی (١٩٨٠-١٩٩١) دا بە هۆی نەبوونی ئارایشتگای ژنان لە ڕانیە پیاو کاری ڕازاندنەوەی ئافرەتانی کردووە، چۆتە ماڵان، شیوازی قژ چاکردنیش بریتیبووە لە (کلۆشی-ئەسەدی-کاری-سویدی).[٢] مێژووی سەرچاکردنی پیاوان لە ڕانیە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، (مام هۆمەر) ناوێک لە سەرئاوی کوێرەکانی ئەم کارەی کردووە، یەکەم دووکانی سەرچاکردنیش لە ڕانیە لەلایەن (مام نورەدین و مستەفا) ناویکدابووە، لە (١٩٦٠) بەدواوە چەند کەسێک ئەم کارەیان کردووە (وەستا تۆفیق، سلێمان باپیر ئەمین، وەستا سەلاح، وەستا سەردار، بەکری حەلاق)، ئامێری قژچاکردنیش بە پێی کات گۆڕاوە چەند ئامێرێک هەبووە (چەقۆ، هەسان، قایش، مەکینەی دەست، مەقەست و گوێزان)، نرخی سەرچاکردن لە (١٠-٢٥) فلس بووە، بەپێی گۆڕانی کات و دۆخی ئابووری گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، سەرچاکردنی ماڵانیش، کە تایبەت بووە بە دەوڵەمەندەکان نرخی زیاتر بووە، جگە لە شێوازی قژ و سمێل ڕەشکردنەوە لە دوای ساڵی (١٩٧٠) وە شێوازی زوڵف پۆستاڵ و قەنافیز پۆستاڵ و قژ درێژکردنەوە هەبووە، وەسمە و کرێم و غازی نیوتن بۆ جوانکای بەکارهاتووە.[٣]

### ٦ -خواردن و خواردنەوە

خواردن لە ڕانیە، هاوشێوەی هەر ناوچەیەکی تر بووە لەم قۆناغەدا ئەو جۆرە خواردنە ئاسایی و فۆلکلۆرییانە زۆر بەکارهاتوون (ساوەر، گەنمەکوتاو، کنگر، کولەک، کارگ، برنج، دۆڕۆن، پلاوگامێش، حەلوای خورما، کەلانە، ترخێنە، قاورمە) ،[٤] وەک نەریتی خواردنەوەش، جگە لە خواردنەوەی ئاو و چا، کە زور باو بووە. جۆرێکی تر لە خواردنەوەکان، خواردنەوە کحولیەکان بووە، مێژووی خواردنەوە کحولیەکان لە ڕانیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٣٤)، لە سەرقولە دوو هۆدەی گڵ هەبووە، کە لێی خوراوەتەوە و مامەڵەی مەی تێداکراوە، بەشێوەیەکی بەرەوام لە دانیشتن و بۆنەکان، لە سەرقولە و ناوبازاڕ مەی خوراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٦٥-١٩٦٧) یانەی خواردنەوە لە ناو بازاڕ هەبووە و لە ساڵی (١٩٧٢) یانەی فەرمانبەرانی ڕانیە بەفەرمی کراوەتەوە، خواردنەوەی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مریم حمد شێخە: ٢٠١٦/٣/١٢.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەبوبەکر حەمەدەمین حەسەن(حەلاق): ٢٠١٦/٣/١٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٥ ڕانیەیە و دەرچووی ئامادەییە و لە ١٩٧٧ دوکانی سەرتاشی هەیە لە ڕانیە.

[٣] کامەران: سەرتاشی لە ڕانیە، گۆڤاری ڕانیە، ژ(١٧) ئەیلولی ٢٠٠٦، ل٣٢؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەبوبەکر حەمەدەمین (حەلاق):٢٠١٦/٣/١٠.

[٤] کامەران: خواردنە خۆماڵیەکانی دەڤەری بیتوێن، گۆڤاری ڕانیە، ژ(١٠) کانونی یەکەمی ٢٠٠٤، ل٢٦؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ حەبیبە عەلی ڕەشید: لە ٢٠١٦/٣/١٠.

مەی لە ناو زۆربەی چینەکاندا هەبووە، چینی فەرمانبەر و کاسبکار، هتد، جگە لەو خواردنەوانەی باسکرا خواردنەوەی خواردنەوە غازیەکانیش، جۆرێکی تر بووە لە نەریتی خواردنەوە لە ناوچەکە.[1]

### ٧- پرسەو مردوو ناشتن

لەسەر پەیڕەوی ئاینی ئیسلام بووە و گەر ڕەگەزی نێر بوبێت بردراوە بۆ مزگەوت و لەوێ شوردراوەو کفنکراوە ئەگەر ڕەگەزی مێ بوایە، لەماڵەوە شوردراوە و کفنکراوە کاتێک کەسێک کۆچی دوایی کردووە کۆمەڵێک کەس بەشداری تەواوی ڕێوڕەسمەکەیان کردووە لە شۆردن، گواستنەوە، ناشتن، لەوانە: (عەلیە درێژ، سەید حسامەدین، مام فەتاح، حاجی برایمە سور، لە هەشتاکانیش سەید دلێر)، کەسی کۆچکردوو دوای شۆردن بە دارەمەیت گواستراوەتەوە، زۆرێک لە دوکانەکانی ناوبازاڕ داخراون و هەندێک جار دەف بەکار هاتووە، گۆڕهەڵکەندن و ناشتنی مردووش بێبەرامبەر بووە، لەکاتی ناشتنی مردوودا مەلا تەلقینی داوە، دواتریش کەسێکی نزیکی بۆ ماوەی (٣ تا ٤) کاتژمێر لای ماوەتەوە، دواتر پرسەی بۆ دانراوە، پرسە دوو تا سێ ڕۆژ بووە. تا ساڵی (١٩٧٠) زیاتر لەماڵان بوو، بەڵام دوای ئەم مێژووە چۆتە مزگەوت، چونکە ڕێژەی دانیشتوان زیادی کردووە، لە پرسەکانیشدا قورئان خوێنراوە، هەندێک جار بەهۆی ئامێرەوە بوو زۆرجاریش قورئان خوێن بانگکراوە، لە ڕێوڕەسمی پرسە کەسوکاری مردوو هیچ بڕەپارەیەکیان سەرف نەکردووە، ئەو کەسانەی کە نێوڕۆ و ئێوارە ماونەوە، لەگەڵ خۆیان خواردنیان بردووە، پەیوەندیی کۆمەلا یەتی زۆر بەهێز بووە، خەڵک وەک ئەرکێکی مرۆڤانە بێگوێدانە خزمایەتی ئەم کارانەیان کردووە، کەسانی نزیکی کۆچ کردوو لە ڕەگەزی نێر تا ماوەیەک ریشیان هێشتۆتەوە ئافرەتانیش جل وبەرگی ڕەشیان پۆشیوە، تاماوەیەک لەماڵەوە تەلەفزیونیان هەڵنەکردووە، دیاردەی لەخۆدان و شین گێڕانیش لە ناو ژناندا باوبووە.[2]

---

[1] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ هەژار سالح حەمە حوسێن (مامە): لە ٢٠١٦/٣/٢، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٣ ڕانیەیە و ماوەیەکی زۆرە بەکاری فرۆشتنی مەیەوە خەریکە، ئێستا فەرمانبەری حکومیە.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ قادر حەمەشین بایز: لە ٢٠١٦/٣/٥، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٣٧ لە ڕانیە لە دایک بووە، پێشتر شوفێربووە، ئێستا بەهۆی تەمەنیەوە کارناکات.؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ دڵشاد بەکر سالح: لە ٢٠١٦/٣/٢، ڕانیە، ناوبراو لە ١٩٦١ لە ڕانیە لەدایک بووە، ئەندازیارە و بەڕێوەبەری بەشی موڵکایەتیە لە ئیدارەی ڕاپەڕین.؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ سەید دلێر عەبدوڵڵا ڕەشید: لە ٢٠١٦/٣/٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٧ ڕانیەیە و دەرچووی ئامادەیی پیشەسازیە، ئێستا فەرمانبەرە لە شارەوانی ڕانیە، تا ئێستاش بەردەوامە لە کاری مردووشتن و ناشتن وەک کارێکی خێرخوازی.

### ٨- زمان و شێوەزار

لەڕووی زمانەوانیەوە کوردی زمانی ڕەسەنی دانیشتوانی ڕانیەیە، لەڕوی شێوەزاریش سەر بەکرمانجی ناوەڕاستە، وەک لقیش سەر بە سلێمانیە،[١] جگە لە سلێمانی، موکریانی و هەولێریش کەمێک کاریگەرییان لەسەر شێوەزاری ڕانیە هەیە.[٢] بەڵام زیاتر کاریگەریی سلێمانی بەسەرەوەیە، ئەمەش بۆ مێژووی ئەو کاریگەرییە سیاسی و فەرهەنگیە دەگەڕێتەوە، کە ئەم شار بەسەر ڕانیەوە هەیەتی، بۆیە لە ڕووی شێوەزارەوە زیاتر سلێمانی بەسەریدا زاڵە، کەمتر هەست بە موکریانی دەکرێت، ئەگەر سەرنجی ئاستی دەنگ و فەرهەنگ و یاسا ڕێزمانییەکان بکەین ئەم جیاوازیەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە و موکریانی زیاتر کاریگەری فارسی لەسەرە، هەولێر و دهۆکیش کاریگەری عەرەبییان لەسەرە، بەڵام ئەم کاریگەریە کەمتر بە سلێمانی و لە ناویشیدا بە ڕانیەوە دەبینرێت، جگە لەمەش هەڵکەوتەی جوگرافی ڕانیە ڕۆڵی زۆری بینیوە لە زمان پاراوی کوردی لەم ناوچەیەدا.[٣]

جگە لەو داب و نەریتانەی باسکران، کۆمەڵێک داب ونەریتی تریش لەناوچەکەدا هەبووە، وەک دیاردەی فاڵگرتنەوە و دەست خوێندنەوە و چوونە سەر گۆڕی پیاوچاک و نوشتەکردن لە لای شێخ و مەلا و سەیدەکان، کە لەلایەن خوێندکار و گەنجان و ئافرەتان و پیاوان ئەنجامدراوە، بە مەستی گەیشتن بەو ئامانجەی کە هەیان بووە، لەگەڵ چارەسەری گرفتەکانیان.[٤]

---

[١] د. فواد حمه خورشید: اللغة و اللهجات الكردية، دراسة جغرافية، ط٢، دار الثقافة والنشر الكردية، بغداد، ٢٠١١، ص١٧، ٢٤.؛ ژیلوان عبدلله هەڵەدنی: کوردۆلۆجی، چ٣، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٤، ل١٧٨.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدوڵلا عومەر فەرخە: ٢٠١٦/٣/١٢، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٤ پشدەرە و دەرچووی بەشی کوردی زانکۆی بەغدایە، لە ئێستادا مامۆستای زمانی کوردییە لە ڕانیە.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەل د. شێروان حسێن حەمەد: لە ٢٠١٦/٣/٢٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٨٣ ڕانیەیە و هەڵگری بڕوانامە دکتۆرایە لە بواری زمان و بەراوردکاری، پیشەی مامۆستایە.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئازاد فەقێ ڕەسول:٢٠١٦/٣/٢٠.

# باسی چوارەم: بارودۆخی خوێندن و تەندروستی

## یەکەم/ بارودۆخی خوێندن

### أ-خوێندنی حکومی (فەرمی)

قوتابخانە سیستەمێکی تایبەتە لە سیستەمەکانی کارلێکردنی کۆمەڵایەتی و دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە، قۆناغی دووەمە لە دوای خێزان بۆ پێشخستنی منداڵ لە ڕوانگەی هزری و کۆمەڵایەتیەوە، هاوکارە بۆ بەرەو پێشخستنی کۆمەڵگا بۆ قۆناغێکی گەشەسەندوو، هێڵی پەیوەندیکردنە لە نێوان ماڵ و کۆمەڵگە، لە هەمان کاتدا بنەمای سەرەکی دروست بوونی کۆمەڵگایەکی پێگەیشتوو دروستە.[1] لە ساڵی (١٩١٩) ئینگلیزەکان بۆ یەکەم جار خوێندنی کوردیان هێناوەتە باشوری کوردستان،[2] لەماوەی ساڵانی (١٩٣٢-١٩٥٨)و بە هۆی ناجێگیری سیاسی و لاوازی ئیداری و وەزارەتی مەعارف، خوێندن و پەیوەست بوونی خوێندن بە بواری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەوە، نەیتوانیووە بگات بە ئاستێکی پێشکەوتوو.[3]

مێژووی خوێندنی فەرمی لە ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٢٢) دەگەڕێتەوە، کە خوێندنگەیەک لەگەڕەکی قەڵات بەناوی خوێندنگەی ڕانیەی سەرەتایی کراوەتەوە،[4] لەم خوێندنگەیەدا چەند مامۆستایەک وانەیان وتۆتەوە، لەوانە: (عەبدولقادر، زەکی هەناری، سەید حەسەن کەرکوکی، عومەری حاجی مەحمود)، لەو ماوەیەدا، کە خوێندن کراوەتەوە لە شارەکە کۆمەڵێک کەس بوون بە خوێندکار، لەوانە (توفیقی مەلا سدیق، حەمەی مەلا توفیق، یونس ڕەوف-دڵداری شاعیر)، لەم سەردەمەدا خەڵک ئارەزوی بۆ خوێندن زۆرکەم بووە،[5] لە ساڵی (١٩٣١) بەپێی فەرمانێکی حکومەتی عیراق دەربارەی خوێندنی کوردی لە ناوچە کوردنشینەکان، ناوی ڕانیەی لەناو ناوی ئەو ناوچە کوردیانە هێناوە، کە بڕیارەکەی دەبێت تێدا جێبەجێبکرێت،[6] بەڵام بە پێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) یەک قوتابخانە لە ڕانیەدا هەبووە و ڕێژەی خوێندەواریش بە هەردوو جۆری نووسین و خوێندنەوە(١٥٨) کەس بووە،

---

[1] چنار سەعد عەبدوڵڵا: پەروەردە و نەتەوایەتی، دەزگای چاپ و بلاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٥٧.

[2] غازی حەسەن: خوێندەواری، دەزگای چاپ و بلاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥٨.

[3] صالح محمدحاتم عبدلله: تطور التعليم فى العراق (١٩٤٥-١٩٥٨)، اطروحة دكتوراه(غيره منشورة)، كليه الاداب، جامعة بغداد، ١٩٩٤، ص ٨؛ غازى دحام فهد المرسومي: التعليم في العراق (١٩٣٢-١٩٤٥)، رسالة ماجستير (غيره منشوره)، كليه الاداب، جامعة بغداد،١٩٨٦، ص١٠.

[4] حسين محمد عيدان: الخدمات التعليميه في(مدينة رانية) محافظة السلمانيه-العراق(دراسة جغرافية)، رسالة ماجستير(غير منشورة)، كلية الاداب، جامعة المنصورة، ، مصر، ٢٠١٥، ص٦١.

[5] برایم بەگ: گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(٦)، کانونی یەکەمی٢٠٠٣، ل ٣١؛ خالید قادر: ڕەشید حەوێز، سەرچاوەی پێشوو، ل٨.

[6] محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسور: گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە لیواکانی کوردستانی عیراق، نامەی دکتورا (بلاونەکراوە)، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٣، ل٩٢.

لەو ڕێژەیەش تەنها (٤) کەسیان لە ڕەگەزی مێ بووە.[1] بەڵام لە سەرژمێری (١٩٥٧) ئەم ئامارە گۆڕانکاری بەسەردا داهاتووە، بە بەراورد لەگەڵ ئاماری ساڵی (١٩٤٧) ڕێژەی خوێندەواری تا ڕادەیەکی باش بەرەو پێشچوونی بەخۆیەوە بینیوە، گەر سەرنجی خشتەی (١٠) بدەین بە ئاشکرا هەست بەم جیاوازییە دەکەین.

**خشتەی (١٠) بارودۆخی خوێندەواری دانیشتوانی شارۆچکەی ڕانیە بەپێی ڕەگەز لەساڵی (١٩٥٧)**

| ز | | ڕەگەز | | | | کۆی گشتی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | | مێ | | | |
| | | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % |
| ١ | ٦ساڵ | ٤٠٠٩ | ٢١.٨٩ | ٣٦٦٠ | ٢٠.٨٠ | ٧٦٦٩ | ٢١.٣٥ |
| ٢ | نەخوێندەوار | ١٣٢٩٤ | ٧٢.٥٩ | ١٣٨٠٤ | ٧٨.٤٦ | ٢٧٠٩٨ | ٧٥.٤٧ |
| ٣ | خوێندەوار | ٢٠ | ٠.١٠ | ٧ | ٠.٠٣ | ٢٧ | ٠.٠٧ |
| ٤ | خوێندنەوەو نووسین | ٩٩٠ | ٥.٤٠ | ١٢١ | ٠.٦٨ | ١١١١ | ٣.٠٩ |
| کۆی گشتی | | ١٨٣١٣ | ١٠٠ | ١٧٥٩٢ | ١٠٠ | ٣٥٩٠٥ | ١٠٠ |

المصدر: الجمهورية العراقية وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، هيئة التعداد العام للدراسات السكانية، نتائج ترقيم المباني و حصرالسكان لسنه١٩٥٧، ص١٤.

تا ساڵی (١٩٥٠) یەک خوێندنگەی سەرەتایی لە ڕانیەدا هەبووە کە لە گەڕەکی قەڵات بووەو چوار ژور بووە بە خشتی سوور لە قوڕ دروستکراو، خاوەنەکەشی کەسێک بووە بەناوی حەمە ئاغا، کۆمەڵێک مامۆستا لەماوەی ئەم ساڵانە خزمەتیان کردووە، وەک: (سەید فەتاح، عبدالرحمان حاجی، کەمال جەمیل، مەلا حامید، قادر فەقێ، شەفیق تاهیر، سلێوە(مەسیحی)، کەمال ڕەشید، ئیسماعیل سەرهەنگ، ئیبراهیم ڕەمەزان، کاوە میرزا، سادق مەعروف)، لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم لە شارەکە کچان ڕوودەکەنە خوێندن، یەکەم کچیش کە دەچێتە خوێندنگە ناوی (فەخریە ئیسماعیل) بووە، لە هەمان ساڵدا چەند کچێکی تریش ڕویانکردۆتە خوێندن، لەوانە (پەرژین سەعید، نەسرین حەوێز، گەلاوێژ خورشید)، ئەم کچانە هی کۆمەڵێک بنەماڵەی کۆیی و سلێمانی نیشتەجێی ڕانیە بوون، لەم قۆناغەدا بۆکچ نەنگی بووە کە بچێتە خوێندنگە، هەر لەم ماوەیەدا بە هۆی نەبوونی خوێندنگەی ناوەندی لە ڕانیە خەڵک ڕووی لە کۆیە و سلێمانی کردووە، لەم سەردەمەدا لە قۆناغی سەرەتایی

[1] غازی حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٠.

کۆمەڵێک وانە خوێندراوە، وەک (عەرەبی، ئایین، مێژوو، بیرکاری، ئینگلیزی، جوگرافیا، تەندروستی، وەرزش)، مامەڵەی مامۆستا زۆر توند بووە هەندێک جار کار گەیشتۆتە سەرشکاندنی خوێندکار،[1]

بەرپابوونی شۆڕشی (١٤) تەموزی (١٩٥٨)، قۆناغێکی گرنگی لە بواری پەروەردە و فێرکردن لە عیراق هێناوەتە ئاراوە، بەتایبەت لە باشوری کوردستاندا.[2] لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) کۆمەڵێک گۆڕانکاری گەورە لەڕووی خوێندندا لە ڕانیە ڕوویداوە لە لایەک لە ڕووی ژمارەی خوێندکار و مامۆستاوە.[3] لە لایەکی تر لە ڕووی ژمارەی کردنەوەی خوێندنگەوە، وەک بەرچاوڕونیەک بۆ ئەم بابەتە لە خشتەی (٢)، دا ناوی خوێندنگە و ئاست و مێژووی دروست بوونی خوێندنگاکانی ڕانیە دەخەینە ڕوو بەپێی دابەش بوونیان بەسەر گەڕەک و ناوچەکانی شاردا لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا.

**خشتەی (١١) ناوی خوێندنگە و ئاست و شوێن و مێژووی دامەزراندنیان**

| ژ | ناوی خوێندنگە | ئاست | ساڵی دامەزراندن | شوێن و تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕانیەی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٢٢ | لە قەڵات بووە لە ١٩٥٤ گوازراوەتەوە ناوبازاڕ |
| ٢ | ئاکۆی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٥٨ | ناوبازاڕ-ڕێگای گشتی |
| ٣ | ڕانیەی تێکەڵاو | ناوەندیی | ١٩٥٩ | لەقولە-دواتر نەماوە |
| ٤ | بیتوێنی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٦٥ | کێوەڕەش |
| ٥ | ڕانیەی کچان | ناوەندیی | ١٩٧٤ | سەرا |
| ٦ | ڕانیەی کوڕان | دواناوەندی | ١٩٧٠-١٩٧١ | قولە-کچیش تێدا خوێندووە بەڵام بەناوی کورەوە بووە |
| ٧ | ڕانیە | باخچەی ساوایان | ١٩٧٥ | قولە |
| ٨ | شارانی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٧٦ | ئازادی-دواتر ناوەکەی گۆڕاوە بۆ ماکۆک |

[1] حەبیبە بابان: سەرەتایەکانی خوێندنی کچان لە ڕانیە، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (١٦) حوزەیرانی ٢٠٠٦، ل٤٥؛ سەرکەوت بورهان: ئەومامۆستایانەی سەردەمانێکە دادەگیرسێن بۆ ڕوناکی شار، گۆڤاری ڕانیە، ژ (٨)، حوزەیرانی ٢٠٠٤، ل٦-٧؛ جەمال ڕەشید حەوێزی: شاری ڕانیە و بیرەوەریەکانم، گۆڤاری ڕانیە، ژ(١٤)، کانونی یەکەمی ٢٠٠٥، ل٨.

[2] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: چنار سەعد عەبدوڵڵا: سەرچاوەی پێشوو، ل١٤١-١٤٤.

[3] بۆ زانیاری لەسەر ژمارەی مامۆستا و خوێندکاری شارۆچکەی ڕانیە، لەسەر ئاستی قوناغی سەرەتای و دواناوەندی لەماوەی لێکۆلینەوەکەدا بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٥)، (٦).

| ژ | ناوی خوێندنگە | ئاست | ساڵی دامەزراندن | شوێن و تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ٩ | ڕانیەی ئیواران | ناوەندی | ١٩٧٨ | ناوبازاڕ- ڕێگای گشتی |
| ١٠ | بۆتێ تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٧٩ | ئۆردوگای ڕانیە |
| ١١ | ماکۆکی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٧٩ | سەرا |
| ١٢ | ڕانیەی تێکەڵاو | ئامادەیی | ١٩٨٠-١٩٨١ | سەرا- دواتر گواستراوەتەوە بو ناوبازاڕ دواتر بۆ قەڵات و دواتریش بو ئازادی |
| ١٣ | ڕانیەی تێکەڵاو | ئامادەیی پیشەسازی | ١٩٨٤ | مامۆستایان |
| ١٤ | ڕانیەی کچان | دواناوەندی | ١٩٨٤ | سەرا |
| ١٥ | کێوەڕەشی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٨٤ | ڕەشەمێرگ |
| ١٦ | کێوەڕەشی تێکەڵاو | ناوەندی | ١٩٨٦ | ئۆردوگای ڕانیە- دواتر گواستراوەتەوە قەڵات |
| ١٧ | ڕانیەی تێکەڵاو | ئامادەیی بازرگانی | ١٩٨٧-١٩٨٨ | مامۆستایان- دواتر نەماوە و بۆتە بەشێک لە ئامادەیی پیشەسازی |
| ١٨ | یەکێتی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٨٨ | شەهیدان |
| ١٩ | حەلیمەسەعدیەی تێکەڵاو | سەرەتایی | ١٩٩٠ | کێوەڕەش |
| ٢٠ | سەیداوای تێکەڵاو | سەرەتای | ١٩٩٠ | قولە- نێوان سەیداوا و گەڕەکی قولە |

سەرچاوە/ بەدوادا چوونی مەیدانیی توێژەر بۆ خوێندنگاکانی ڕانیە: لە ڕۆژانی ٢-٣-٢٠١٦/٣/٤.

لە ساڵی (١٩٥٩) بۆیەکەمجار دوو هاوڵاتی شاری ڕانیە بەناوەکانی (حەمەدەمین مەلا پیرۆت، سلێمان مەلا پیرۆت) خوێندن لە خانەی مامۆستایانی بەعقوبە تەواو دەکەن و دەبن بە مامۆستا لە ڕانیە.[1] لە ساڵی (١٩٦٠) بەسوود وەرگرتن لە بڕیارەکانی شۆڕشی (١٩٥٨) کۆمەڵێک مەلای ئایینی و خوێندەواری ناوچەکە دوای ئەنجامدانی تاقیکردنەوە دەکرێن بە مامۆستای خوێندنگە فەرمیەکان، ئەم کارە لەم قۆناغەدا هەنگاو و ڕۆڵی باشی بینیوە لە پەرەپێدانی خوێندن لە شارەکەدا، چونکە دوای ئەنجامدانی تاقیکردنەوە، لە ناوچەکەدا دەستیان بەوانە وتنەوە کردووە، مامۆستا ئایینیەکانیش بریتیی

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئیبراهیم سید فەیزوڵلا ڕەشید: ٢٠١٦/٥/٨، ڕانیە، ناوبراو ئەم زانیاریانەی لە باوکیەوە وەرگرتووە.

بوون لە: (سالح مەلا محەمەد، مەلا خدر هەرتەلی، مەلا حوسێن سکتانی، مەلا عیسا محەمەد، مەلا ئەحمەد محەمەد، حەمە تاهیر مستەفا، تاهیر مەلا قادر، ئەحمەد ئیلەلآیی).[١]

ئەوەی پەیوەست بووە بە خوێندنگەی ناوەندی لە ساڵی (١٩٥٩) یەکەمین خوێندنگە لە ڕانیە کراوەتەوە کە قۆناغێکی باش بووە لە پرۆسەی خوێندن لە ناوچەکە، چونکە پێشتر بە هۆی نەبوونی قۆناغی ناوەندی بەشێک لە خوێندکاران، بەهۆی خراپی دۆخی ئابوری و تێچووی خوێندنەوە وازیان هێناوە، خەڵک لەم سەردەمەدا بەگشتی هەژار بووە لە ماوەی سالانی (١٩٦٠-١٩٧٠) کۆمەڵێک مامۆستا دەرکەوتن و ڕۆڵی گرنگیان بینیوە لە پەرەپێدانی پەروەردە و خوێندن لە ڕانیە زیاد بوونی ڕێژەی مامۆستاو خوێندکار، وای لە حکومەت کردووە ڕێژەی خوێندنگاکان زیاد بکات، بەم هۆیەشەوە کۆمەڵێک خوێندنگەی سەرەتایی لەم ماوەیە لە شارەکەدا کراونەتەوە، لە ساڵی (١٩٦٨) کۆمەڵێک فێرخوازی خەڵکی ناوچەکە زانکۆی بەغداد یان تەواو کردووە و هاتونەتەوە ناوچەکە و وەک مامۆستا وانەیان وتۆتەوە، کە بواری پەروەردەو خوێندن بەرەو پێشچوونی زۆری بەخۆیەوە بینیوە، ئەم پێشکەوتنانە هاوتەریب بوون لەگەڵ هۆشیاری خەڵک و وەڵامدانەوەی هاولآتیانی شارەکە بۆ ئەم بوارە، باوک و دایکانی ڕانیە ئیرادەیەکی زۆر پتەویان هەبوو بۆ هاندانی منداڵەکانیان بۆ خوێندن و ئامادەبوون هەموو سەروەت سامانیان خەرجبکەن لە پێناو پێگەیاندنی منداڵەکانیان، خوێندن لەو ماوەیەدا تا قۆناغی سەرەتایی بەزمانی کوردی بووە، بەلآم لە ناوەندی بۆتە زمانی عەرەبی تا ساڵی (١٩٧٠) دەرکردنی بەیاننامەی ١١/ئازار.[٢] کە هەموو قۆناغەکانی خوێندن کراوە بەزمانی کوردی، خوێندنی ئامادەیی تا ساڵی (١٩٦٧) تا پۆلی پێنج بووە، بەلآم لەم ساڵەدا پۆلی شەش پەیدابووە، لە پۆلی سێی ناوەندی خوێندکار بۆ زانستی یان وێژەیی جیا کراوەتەوە، لە ڕووی خزمەتگوزارییەوە لە هۆڵەکان کورسی و تەختە هەبووە، سۆپای دار وەک ئامێری گەرمکردنەوە بەکارهاتووە و بەشێوەی پچڕ پچڕ خواردن و شیر و گۆشتی قوتوو دابەشکراوە، قوتابخانەی دوو دەوامی نەبووە قوتابخانەی پاشنیوڕۆ و بەیانیان ناویان جیاوازبووە، گەر لە یەک بیناشدا بونایە، وەک خوێندنگەی ئاکۆ و بیتوێن.[٣]

---

[١] نظام معاهد اعداد المعلمين للمدارس الابتدائية: جريدة الوقائع العراقية، رقم (٤٩)، ١٩٦٠/١٢/٢٦؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر حوسێن خدر(هەرتەلی): ٢٠١٦/٥/٣١.

[٢] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بەیاننامەی ١١/ئازار و کاریگەری لەسەر خوێندن بەزمانی کوردی بڕوانە: چنار سەعد عەبدوڵڵا: سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨-١٤٩.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەلال حەمەد ئیبراهیم: ٢٠١٦/٣/٢٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٢ میرزا ڕۆستەمە و لە ساڵ ١٩٦٥ زانکۆی بەغدا بەشی کوردی تەواو کردووە لە ساڵی ١٩٦٧ لە ڕانیە مامۆستایە و خەڵکی ناوچەکەیە و شارەزای بواری پەروەردە وخوێندنە؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئیبراهیم حەویز کەریم: ٢٠١٦/٣/١٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٤ کۆیەیە و دەرچووی زانکۆی سلێمانی بەشی بیرکاریە لە ساڵی ١٩٧٦، لە تەمەنی منداڵیەوە کەوتونەتە ڕانیە، ئێستا بەڕێوەبەری پەروەردەی قەلادزێیە.

بە هەمان شێوە لەماوەی سالانی (١٩٧٠-١٩٩١) کۆمەڵێک گۆڕانکاری گەورەتر لە بواری پەروەردە لە ڕانیە ڕوویداوە و کاتێک کۆمەڵێک کەسی ئەکادیمی خەڵکی شارەکە زانکۆیان تەواو کردووە، گەڕاونەتەوە ناوچەکە و بوون بە مامۆستا، هەروەها لە ساڵی (١٩٧٠-١٩٧١) دواناوەندی ڕانیە کراوەتەوە یەکەم بەڕێوەبەریش (کەریم) ناوێک بووە، لە ساڵی (١٩٧٤) بە هۆی زۆربوونی ڕێژەی خوێندکاری کچ لە ناوچەکە، ناوەندی ڕانیەی کچان کراوەتەوە ژمارەی خوێندکارەکانی (١٠٠-١٢٠) خوێندکاربووە، (ئیلهام سەعید محەمەد) کراوەتە بەڕێوەبەری خوێندنگاکە، لە ساڵی (١٩٧٥) دا بە هۆی زۆربوونی ڕێژەی فەرمانبەری حکومی و پێداویستی شارەکە، لە لایەن حکومەتەوە بۆ یەکەم جار باخچەی ساوایان لە ڕانیە کراوەتەوە و (سولاڤ فاروق) وەک یەکەم بەڕێوەبەر تیایدا دەستبەکاربووە، بە سێ مامۆستا و نۆ فەرمانبەر کارەکانیان ڕاپەڕاندووە و لە ڕێگەی ئۆتۆمبێلی پاسەوە هاتوچۆیان بە منداڵەکان کردووە.[1]

لە ساڵی (١٩٧٨) حکومەتی عیراق بە بڕیاری ژمارە (٩٢) یاسای نەهێشتنی نەخوێندەواری (محو الامیة)ی دەرکردووە، بەپێی ئەم یاسایە دەبوایە دیاردەی نەخوێندەواری بەشێوەیەکی زۆرەملێ لەسەرجەم ناوچەکانی عیراق بنەبڕبکرێت،[2] ئەم بڕیارە لە ڕانیەش کەوتۆتە بواری جێبەجێ کردنەوە، هەر کەسێک تەمەنی لە نێوان (١٥) بۆ (٤٥) ساڵی بوبێت، بڕیارەکە گرتویەتیەوە، لە ڕێگەی ئاماری مەیدانی کارەکە ئەنجامدراوە، گەر کەسێک پابەند نەبوبێت کە فەرمانبەر بوایە سزای دارایی و کارگێڕی دراوە، گەر هاوڵاتی ئاسایش بوایە ڕووبەڕووی زیندان و لێپرسینەوە بۆتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە ناو ڕانیە سێ بنکە بۆ پیاوان و بنکەیەک بۆ ئافرەتان کراوەتەوە، کە لە لایەن مامۆستایان (ڕەشید جەلیل، ئەنوەر یوسف، وەهاب محەمەد، نەعیمە فەرەجوڵلا) سەرپەرشتی کراوە، ڕۆژانەش لە کاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ دەوام دەستی پێکردووە، (٣) وانەی تێدا خوێندراوە کە برتیبووە لە (کوردی، بیرکاری، کۆمەڵایەتی)، ئەم پرۆسەیە هەرچەندە بەهۆی تێکچوونی دۆخی سیاسی و شەڕی عێراق و ئێران، لە هەشتاکاندا بەرەو لاوازی چووە، بەڵام تا (١٩٨٥)بەردەوام بووە، ڕۆڵێکی باشی بینیوە لە نەهێشتنی نەخوێندەواری لە ناوچەکەدا، چەندین کەس بەم هۆیەوە توانیان درێژە بەخوێندن بدەن و قۆناغی پەیمانگا و زانکۆ و بڕوانامەی جۆربەجۆر بەدەست بهێنن.[3]

هەر چەندە قۆناغی چوار بۆ شەش لە ساڵی (١٩٧٥) لە ڕانیە هەبووە، بەڵام ناوەکەی هەر دواناوەندی بووەو نەکراوەتە ئامادەیی، لە ساڵی (١٩٨٠-١٩٨١) بۆ یەکەم جار ئامادەیی ڕانیەی کوڕان

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەرلەگەڵ ئیلهام سەعید عەبدوڵلا: ٢٠١٦/٣/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لەدایک بووی ١٩٥٣ کەرکوکە و لە ١٩٦٨ کەوتۆتە ڕانیە، دەرچووی بەشی فەلسەفەیەی زانکۆی بەغدایە، ئێستا سەرپەرشتیاری پەروەردەییە؛ نیازی حەمە عەزیز: لە باخچەی ساوایانی ڕانیەدا خونچەکان دەگەشێنەوە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ(٨٩١)، ١٩٨٧/٥/١٤، ل٤.

[2] قانون الحملة الوطنية الشاملة لمحو الامية الالزامي: رقم: (٩٢) جريدة الوقائع العراقية، رقم العدد(٢٦٥٦)، تاريخ، ١٩٧٨/٥/٢٩.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەرلەگەڵ محەمەد سالح عەزیز: ٢٠١٦/٥/٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٩ ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانی هەولێرە لە ١٩٧٣دا، ئێستا مامۆستای خانەنشینە.

لە ڕانیە کراوەتەوە،(عەبدوڵڵا عەلی ئەمین) کراوەتە بەڕێوەبەری خوێندنگاکە، جگە لە کوڕ کچانیش تیایدا خوێندوویانە، تەنها ناوەکەی بەم ناوەوە بووە، دواتر بە هۆی زۆری ڕێژەی کچ لە ساڵی (١٩٨٤) دواناوەندی کچان کراوەتەوە، خۆیندن تیایدا لە پۆلی یەکەوە تا چوار بووە و ژمارەی خوێندکارەکانی(٣١٠) خوێندکار بووە.[١] لە ساڵی (١٩٨٤) بە هۆی خواستی زۆری خوێندکاران و نزمی نمرەی ناوەندی بە شێک لە خوێندکارەکان، کەمافی خوێندنیان نەبووە لە ئامادەیی، بۆ ئەوەی بۆ خوێندن ڕوونەکەنە دەرەوەی شارو واز لە خوێندن نەهێنن، ئامادەیی پیشەیی کراوەتەوە، (شۆڕش مەحمود) وەک بەڕێوەبەر تیایدا دەستبەکار بووە، ئامادەییەکە (١٠%) خوێندکاری لە ناوەندییەوە وەرگرتووە، بریتی بووە لە دوو بەش، کارەبا و کانزاکان، دواتریش لە ساڵی (١٩٨٧) ئامادەیی بازرگانی کراوەتەوە و (ئیبراهیم حەویز) بەوەکالەت کراوەتە بەڕێوەبەر، بەڵام (١٩٨٨) ئامادەیی بازرگانی بچووکراوەتەوە و کراوەتەوە بەش و تێکەل بە ئامادەیی پیشەیی کراوە، لە ساڵی (١٩٨٨) ڕێژەی خوێندکارانی بۆ (٥٠٠) خوێندکاری کوڕو کچ بەرزبۆتەوە، کردنەوەی خوێندنگە بەردەوامی هەبووە بە کردنەوەی چەندین خوێندنگەی سەرەتایی و ناوەندی لە گەڕەکە جیاوازەکانی شاردا، لە ساڵی (١٩٨٦) بۆ منداڵی ئەو گوندانەی کە لە ئۆردوگای ڕانیە نیشتەجێ کراون ناوەندیی کێوەڕەش لە ئۆردوگاکەدا کراوەتەوە، بەڕێوەبەرەکەشی (محەمەد فەلاح ڕەزا) بووە.[٢]

لە ڕووی پەرەپێدانی پەروەردە و پەیوەندیی نێوان مامۆستا و خوێندکار، بە پێی بڕیاری پەروەردەی سلێمانی دەبوایە ساڵانە چوار جار کۆبوونەوە بە باوک و دایکی خوێندکاران بکرێت، بەڵام لە بەشێک لە خوێندنگەکانی ڕانیە هەموو مانگێک کۆبوونەوە ئەنجامدراوە و ساڵانەش چالاکی هونەری و وەرزشی و پێشبڕکی لە نێوان خوێندنگەکانی ڕانیە ئەنجامدراوە، لەگەڵ سازدانی ئاهەنگی ساڵانەی ناو خوێندنگەکان.[٣] لە ساڵی (١٩٨٨) بۆ یەکەم جار لە ڕانیە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئامادەکردن و ڕاهێنانی مامۆستایانی سلێمانی، بە بەشداری مامۆستایانی ناوچەکە یەکەم خولی ڕاهێنان و ئامادەکردن بۆ مامۆستایان کراوەتەوە، کە تایبەت بوو بە پەروەردەکردن و شێوازی وانە وتنەوە، کردنەوەی ئەم خولە ساڵانە دووبارە کراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٨٩)دا بۆ جاری دووەم لە ڕانیە کراوەتەوە، مامۆستایان لە کۆتایی خولەکە تاقیکردنەوەیان پێکراوە و بڕوانامە و دیاری تایبەتیان پێبەخشراوە.[٤]

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدوڵڵا عەلی ئەمین: ٢٠١٦/٥/٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٠ میرزا ڕۆستەمە و لەساڵی ١٩٦٥ زانکۆی بەغدا بەشی کوردی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٦٧ وە لە ڕانیە مامۆستایە وشارەزای بواری پەروەردەی ناوچەکەیە؛ گەشتی هاوکاری بە ڕانیەدا: ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ(٧٦٩)، ١٩٨٤/١٢/٢٧، ل٦.

[٢] محەمەد مەلا ئەسعەد: سەردانی ئامادەیی پیشەسازی لە ڕانیە، ڕۆژنامەی پاشکوی عیراق، ژ (٦٦)، ١٩٨٨/١٢/٢١، ل٣.؛ چاوپێکەوتنی توێژەرلەگەڵ ئیبراهیم حەویز کەریم، ٢٠١٦/٣/١٩.

[٣] محەمەدی مەلا ئەسعەد: چوینە قوتابخانەی کێوەڕەش، ڕۆژنامەی پاشکۆی عێراق، ژ (٦٠)، ١٩٨٨/١١/٩، ل٤.؛ بێژەن: قوتابخانەی بۆتێی سەرەتایی لە ڕانیە، ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق، ژ (٨٤)، ١٩٨٩/٤/٢٦، ل٤.

[٤] یەکەم خولی ڕاهێنان و ئامادەکردن بۆ مامۆستایان لە ڕانیە:ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق، ژ (١٠٥)، ١٩٨٩/١٠/٤، ل٤.

بە شێوەیەکی گشتی لەماوەی ساڵانی حەفتا و هەشتاکانی سەدەی بیستەم، ڕەوشی خوێندن لە هەندێک لایەنەوە باش بووە و لە هەندیک بواری تردا خراپ، لە لایەک هەژاری و خراپی دۆخی سیاسی ئەوکات وای لە باوک و دایکان کردووە بە مەبەستی زوو تەواوکردنی خوێندن منداڵەکانیان بنێرنە ئامادەیە کشتوکاڵی و پیشەییەکان، کە ئەوە بۆتە هۆی لە ناوبردنی ئەو تواناو زیرەکییەی، کە خوێندکار هەیبووە بۆ گەیشتن بە ئاستی بەرز و باڵا، لە لایەکی تر دەستێوەردانی حزبی بەعسی عێراق، کە هەموو مامۆستایەکی ناچارکردووە ئەندامی بیت لە یەکێتی مامۆستایان، کە دەزگایەک حزبی بووە و بەعس تیایدا زاڵبووە، زورجار لەسەر یەک لێدوان مامۆستا تووشی سزاو گواستنەوە کراوە، جگە لەوەی دەبوایە هەموو ڕۆژانی پێنج شەممە ئاڵای عیراق هەڵکرێ و سروود بۆ عیراق و حزب و سەدام بوترێ، هەمیشە ترس و تۆقاندن زاڵبیت بەسەر دەروونی مامۆستادا.[1]

لەگەڵ ئەوەشدا ویست و ئارەزوو بۆ خوێندن زۆر بووە، زۆر گرنگی بە خوێندکار دراوە و کۆبوونەوە بە دایک و باوکان کراوە، لێکۆلینەوە لە لاوازی خوێندکار کراوە و گرنگی زۆر بە پەیوەندی نێوان خوێندنگە و ماڵ دراوە، گرنگی زۆر بەوەدراوە. کە خوێندکار لە کام وانە لاوازە، خوێندکاری ناوچەکە بەگشتی لە وانە زانستییەکان و زمانی ئینگلیزی ئاستیان باش نەبووە کەوتن[2] هەبووە، خوێندکاری زیرەک و هەڵکەوتەش هەبووە،[3] هەر خوێندکارێک کە زیرەک بوایە زۆر هاندراوە، ئاگاداری ماڵەوەی کراوەتەوە و خەڵاتکراوە و لە کۆبونەوەی ڕۆژانی پێنج شەممە ناویان خوێندراوەتەوە، جگە لەمە لە بواری پەروەردەشدا زۆر گرنگی بە بواری پاک و خاوێنی دراوە و پێویست بووە خوێندکار جل و بەرگی ڕەش و سپی بپۆشی و نینۆکی درێژ نەبێت، قژی خاوێن بێت، کچەکان قردێلەی سپی لە قژیان بدەن، وەک جیاکاری لە منداڵی دەرەوە، ساڵانەش ڤیستڤاڵی وەرزشی بۆ خوێندکاران سازکراوە، جگە لە چالاکی وێنەکێشان و کردنەوەی پێشانگا و سازدانی گەشت و گەڕانی ساڵانە، وەک لایەنی ڕێکخستنیش کاتێک خوێندکارێک کارێکی نەشیاو یان گێرەشێوێنی کردبێ، لێپرسینەوەی لەگەڵدا کراوە، هەندێک جاریش لە خوێندن دوورخراوەتەوە، مامۆستا هەر دوو بواری جەستەیی و دەرونی بۆ سزای خوێندکار بەکارهێناوە، لە هەندێک کاتدا مامەڵەی مامۆستا لەگەڵ خوێندکار مامەڵەیەکی سەربازی بووە، دار و شەق و زلە و پێداکێشانی بەکارهێناوە، لەم سەردەمەدا کۆمەڵێک گرفت هەبوو کاردانەوەی لەسەر مامۆستا و خوێندکار و پرۆسەی خوێندن و فێرکاری هەبووە، نەبوونی خولی شیاندنی مامۆستا و نەشارەزایی مامۆستا لە ڕێگەی وانەوتنەوە و دەرونناسیدا یەکێک بووە لە کێشەکان، دیاردەی هەژاری و زاڵبونی عەقڵیەتی خێڵەکی و نەبوونی تاقیگە و کورسی دانیشتن و تەختەی نووسین و خراپی ئاست و جۆریان، نەبونی باڵەخانەی دروست

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدوڵڵا عەلی ئەمین، ٢٠١٦/٥/٣.

[2] بۆ زانیاری لەسەر دیاردەی کەوتن و ئیکمال بوونی خوێندکار لە عیراق بڕوانە: حكمت عبدلله البزاز: ابراهيم مهدي الشبلي و أخرون، الرسوب فى تعليم الابتدائي، جمهورية العراق - وزاره التربية، مطبعة الشعب، بغداد، ١٩٧٣.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدوڵڵا عەلی ئەمین، ٢٠١٦/٥/٣.

و گونجاو له ڕووی زانستیدا گرفتی گەورەبوون لەبەردەم پێشخستنی بواری پەروەردە وخوێندندا، ئەمە جگە لە کەمی مامۆستای تایبەتمەند و کەمی ستاف لە بواری کارگێڕیدا.[١]

**ب- خوێندنی ئاینی (نافەرمی)**

ئیسلام وەک ئایینێکی ئاسمانیی گرنگی بە خوێندن داوە و لەبەرئەوەی کەسی خوێندەوار دەتوانێ زیاتر شارەزای بنەما ئایینیەکان بێت و سوودی لێ ببینێ و خەڵکی تریش شارەزای بنەما ئایینییەکان بکات،[٢] مزگەوت لە کوردەواریدا گرنگی زۆری هەبووە و جگە لەوەی شوێنی خواپەرستی بووە، بۆ ماوەیەکی زۆر تاکە شوێنی فێربوونی خوێندەواری و زانست بووە، زۆرێک لە شاعیر و نووسەر و ئەدیبەکانی کورد لە مزگەوتەکاندا پێگەیشتوون.[٣] خوێندنی ئایینی لەڕێگەی مزگەوتەکانەوە ئەنجام دراوە، لە هەر گەڕەکێک کە مزگەوت هەبوبێت مەلا شوێنێکی تایبەتی بۆ خوێندن تەرخان کردووە و پێیان وتووە حوجرە، مەرجیش نەبووە ئەو کەسەی بچێتە خوێندنی ئایینی ببێتە فەقێ و مەلا ، ئەو کەسەی سەرەتا دەستی بەخوێندن کردووە بۆتە (سوختە) واتا ئەو کەسەی لە خوێندندا دەسووتێ، دوای خوێندنی زیاتر دەبوو بە ئامادە(موستەعید)، هەردووکیشیان هاوواتای فەقێ بوون، کە لە وشەی (فقیە) عەرەبیەوە وەرگیراوە کە بەمانای زانادێت.[٤]

خوێندنی ئایینی لە ڕانیە مێژوویێکی دوورو درێژی هەیە پەیوەستە بە دروستبوونی شارەکەوە، لە پێش ساڵی (١٩٥٨) چەندان مامۆستای ئایینی ناوداری وەک مەلا محەمەد چروستانی شاعیرو مەلا پیرۆت فەقێ ڕەسول، چەندین مەلای دیکە ئەم کارەیان لەم شارەدا کردووە، لەماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) لە ناو ڕانیە لە چەند مزگەوتێک خوێندنی حوجرە هاوتەریب لەگەڵ خوێندنی فەرمی خوێندراوە، لەوانە مزگەوتی گەورەی ڕانیە لەلایەن ئەم مامۆستایانە وانە وتراوەتەوە (مەلا پیرۆت فەقێ ڕەسول ماخۆمەزنی، مەلا ئەبوبەکر بۆسکێنی، مامۆستا ئەحمەد قازی، مامۆستا شێخ کەمال نوری)، مزگەوتی ڕەشەمێرگ لەلایەن (مەلا عەبدوڵلای کونەفلوسە)، مزگەوتی سەیدقادر لەلایەن (مامۆستا مەلا ئەبوبەکر، مەلا قادر هەڵۆنەیی، مەلا محەمەد نورەدینی، مەلا سەید سلێمان، مەلا ئەحمەد قازی)، مزگەوتی ناجیەخان لەلایەن (مەلا مەغدید)، مزگەوتی شێخ مستەفای باقلان لە لایەن

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ پەری مام ڕەسول کاکەمین: ٣٢٠١٦/١٨، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٦ ڕانیەیە و دەرچوی بەشی ئینگلیزی زانکۆی موستەنسیریەی بەغدایە،١٩٨١ ،یەکەم مامۆستای ئافرەتی خەڵکی ڕانیە کە هەڵگری ئەم بڕوانامە بووە لە ئێستادا سەرپەرشتیاری پەروەردەییە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ژیان سابیر مستەفا: ٢٠١٦/٤/٢، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٥ کۆیەیە، دەرچووی بەشی کۆمەڵناسیە و لە هەشتاکانەوە لە ڕانیە مامۆستایە و ئێستا سەرپەرشتیاری پەروەردەییە.

[٢] محەمەد عەبدوڵلا کاکەسور: سەررچاوەی پێشوو، ل٤.

[٣] نەوشیروان مستەفا ئەمین: حکومەتی کوردستان (ڕێبەندانی ١٣٢٤- سەرماوەرزی١٣٢٥)، چ٣، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٥٣.

[٤] محەمەد عەبدوڵلا کاکەسور: سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

(مامۆستا شێخ مستەفا، مەلا ئەحمەد باڵەکی، مامۆستا مەلا فەتاح)، مزگەوتی خەدیجە خاتون لەلایەن (مەلا عەبدولباقی هەرتەلی، مەلا غەفور)، مزگەوتی نەورەسی لەلایەن (مەلا عەلی بەردەکۆزی، مەلا شێخ ڕەزا)، مزگەوتی ئازادی لەلایەن (مەلا عەبدول باقی ئیبراهیم هەرتەلی)، مزگەوتی کێوەڕەش (مەلا عەلی ڕەسوڵ ئاکۆیی)، لە ئۆردوگای ڕانیە کۆمەڵێک قوتابخانەی ئایینی هەبووە وەک مزگەوتی گەورەی ئۆردوگا، کە لەلایەن (مامۆستا شێخ ڕەزا باقلانی)، مزگەوتی مەلا مەحەمەد ڕەسول کە هەر خۆشی سەرپەرشتی کردووە.(١)

ئەو منداڵانەی کە دەبوون بە خوێندکاری مزگەوت زیاتر تەمەنیان لە نێوان (٧) تا (١٠) ساڵی بووە و دوو جۆریان هەبووە بەشێکیان خوێندکاری خوێندنگەی فەرمی بوون، لەگەڵ خوێندنەکەیان چوون بۆ مزگەوت و وانەی ئایینیان خوێندووە خوێندنیان پچڕپچڕ بووە و پابەندن بوونی تەواویان نەبووە پێیەوە ڕۆژانە گەڕاونەتەوە ماڵەوە، جۆرەکەی تر تەنها پابەندی خوێندنی مزگەوت بوون، ئەم جۆرەیان ژیانی تایبەتییان هەبووە لە مزگەوتدا ماونەوەو خواردن و جل و بەرگ و ژیانیان لە ناو مزگەوتدا بووە، بەپێی کات مۆڵەتیان وەرگرتووە و گەڕاونەتەوە بۆ ماڵەوە، تا بڕینی هەموو قۆناغەکانی خوێندن و وەرگرتنی مۆڵەتی مەلایەتی دەستیان لە خوێندن هەڵنەگرتووە، خوێندکار پێویست بووە پابەندی ڕێنماییەکانی مامۆستا بێت، وانەخوێندنیش بەیانی و پاشنیوەڕۆ و شەوانە بووە، بە پێی کات و ڕۆژ گۆڕاوە، لە ناو مزگەوت ژووری تایبەت بۆ خەوتن و سەعیکردن هەبووە، خواردن وجل وبەرگ هەندێک کات لە ماڵەوە بۆیان نێردراوە هەندێک جاریش خەڵک بە کاری خێرخوازی بۆی ئامادەکردوون، تا ساڵی (١٩٨٠) لە ناو ڕانیە فەقێکان بۆ خواردن بە ماڵانەوە گەڕاون، ئەوانیش چیان هەبوایە پێیان بەخشیون، بەڵام دواتر ئەم شێوازە گۆڕاوە فەقێ خۆیان خواردنیان ئامادە کردووە فەقێیەکانی ڕانیە هەر خەڵکی ناوشار نەبوون، هی شارەکانی هەولێر و سلێمانی و قەڵادزێ و ناوچەکانی دەوروبەری ڕانیە و ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشیان تیادا بووە، خوێندکار لە ژێرچاودێری مامۆستادا بووە و نەدەبوایە کاری نەشیاو بکات، گەر کاری هەڵەیان کردبێ تووشی لێپرسینەوە بوون، لێدان و سزا و پاداشت هەبووە.(٢)

---

(١) چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەلی ڕەسوڵ حەمەد ئەحمەد: لە ٢٠١٦/٣/٢٢ ڕانیە، ناوبراى لەدایک بووی١٩٥٠، ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگای ئیسلامیە و چەندین ساڵە لە ڕانیە خوێندنگەی ئاینی هەیە و ئێستا ئیمام خەتیبی مزگەوتی حاجی مینەیە لە ڕانیە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ قادر حەمەد عەبدوڵلا هەڵۆنەیی: ٢٠١٦/٣/٣٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٠ بنگردە و دەرچووی زانکۆی موسلە بەشی شەریعە و لە حەفتاکانەوە خوێندنگەی ئاینی لە ڕانیە بەڕێوەدەبات و ئێستا ئیمام و خەتیبی مزگەوتی ڕوناکیە لە ڕانیە.

(٢) چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ غەفور فەقێ تەها ئەحمەد: ٢٠١٦/٣/٢٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٥ کۆیەیە و لە ١٩٤٥ لە ڕانیە دەژی، خوێندی حوجرەی خوێندووە، بۆتە مەلا، ئێستا خانەنشینی حکومیە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ تەها خدر ئەحمەد: ٢٠١٦/٣/٢٢، ڕانیە، خوێندی حوجرەی خوێندووە، ئێستا پێش نوێژی مزگەوتی ئازادییە لە ڕانیە.

له خوێندنی حوجره کۆمەڵێک وانه خوێنراوه، بەپێی سـەردەم و ڕۆژگار گۆڕانکارییان بەسـەردا هاتووە، گرنگترین وانه و کتێبەکانیش بریتی بوون له (عەواملي جرجاني، تەسریفي زنجاني، علم علوم القران، تفسیر و علوم الحدیث، النحو و الصرف، البلاغه، المنطق، رساله الحاب، شرح العقائد، علم الفلكیات، گوڵ نەبـەوی ئاداب، سیوطی، متـەوەل، مختصر، جمع الجوامع، جامي، سـەمەدیه، ئیزهار، ئینموزەج، تەسریف مـەلا عـەلی).[1] کاتێک خوێندکار وانـەکانی بەتـەواوەتی خوێندووە، مەراسیمێکی گەورە ئامادەکراوە و بە ئامادەبوونی کۆمـەڵێک مامۆستای ڕانیە و دەرەوەی ڕانیە کەسی فێرخواز بانگ کراوە، پێویست بووە خوێندکار وتارێک ئامادە بکات و وەڵامی شـەرعی مامۆستایان بداتـەوە، گەر لە هەڵسـەنگاندن دەرچووبێت، وەرەقەیـەکی بۆ ئامادە کراوە، وێنە و ئیمزای لەسـەر کراوە و مۆڵەتی مەلا یەتی پێدراوە، پێیان ووتووە مـەلا ی دوانزە زانست (علم)، دواتر لە شوێنێک بووە بە مەلا.[2]

بواری خوێندن دابڕاو نییـه لـه لایەنـەکانی ژیـان و پەیوەندییـەکی تونـد و گرێدراوی هەیـە بـە لایەنـەکانی سیاسـی و ئـابووری و کۆمـەڵایـەتی و کارلێک و ڕەنگدانـەوەی زۆر لـە نێوانیانـدا هەیـە، نـاجێگیری دۆخـی سیاسـی و خراپـی دۆخـی ئـابووری ئـەو سـەردەمەی ناوچەکـە کاریگـەری زۆری لەسـەر پێشـکەوتن و خوێنـدن هـەبووە و نـەی هێشـتووە بگـات بـە ئاسـتێکی دروسـت و چـاک، بـە شـێوەیەکی گشـتی دۆخـی خوێنـدن لـە ڕانیـە لـەماوەی سـاڵانی (١٩٥٨-١٩٩١)، شـێوەیەکی ناوەنـدیی وەرگرتـووە و لـە هەنـدێک کاتـدا خـراپ بـووە و لـە هەنـدیک کـاتیش تـا ڕادەیـەک باشـبووە، لایەنـە باشـەکەی خـۆی لـەوەدا بینیوەتـەوە ژمارەیـەکی زۆر لـە خـەڵکی ناوچەکـە بۆتـە خوێنـدەوار و خـاوەن بڕوانامە جۆربـەجۆرەکان، کـە هـەنگاوێکی باش بـووە بۆ ئـەو کـات بۆ ناوچەکە، لایەنـە خراپەکەشـی بریتـی بـووە لـە کـەمی مامۆسـتای پسـپۆڕ و نـەبوونی باڵەخانـەی گونجـاو و دواکـەوتوویی شـێوازی وانەکان و جۆرێک لە چەقبەستوویی، کە نەتوانێت هەنگاوی گـەورە و کاریگـەر بنێت بـەپێی سـەردەمە جۆربەجۆرەکان کە گونجاوبێت، لەگەڵ پێشکەوتنەکانی ڕۆژگار، ئەمە جگە لە دەستوەردانی سیاسـی و زاڵکردنی کەلتووری نەتەوەیەکی زاڵ بەسەر نەتەوەیەکی ژێردەستی وەک کوردا.

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەلی ڕەسوڵ حەمەد ئەحمەد: لە ٢٠١٦/٣/٢٢.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ قادر حەمەد عەبدوڵڵا هەڵونەیی: ٢٠١٦/٣/٣٠.

## دووەم/ بارودۆخی تەندروستی

مێژووی هاتنی نەخۆشخانە لە ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٢٢) دەگەڕێتەوە کە نەخۆشخانەیەکی بچووک (مستەوسەف)ی لێکراوەتەوە، هەروەها لە ساڵی(١٩٤١-١٩٤٢) بنکەی تەندروستی کراوەتەوە، تا لە ساڵی (١٩٥٤) نەخۆشخانەی ڕانیە لە نزیک سەرچاوەی ئاوی قولە کراوەتەوە، چەند پزیشکێک کاریان تێدا کردوە وەک (د.ئەربێل) کە جولەکە بووە، دوای ئەویش (د. ڤیکتۆر و د.قادر شاڵی) کاری پزیشکییان کردووە، لە ساڵی (١٩٥٦-١٩٥٧) دوو برین پێچ (سیستەر) بەناوی (وارێنا) و (ماری) هاتوون بۆ ڕانیە، خزمەتێکی زۆری ناوچەکەیان کردووە،[1] بەپێی ڕێکخستنی کارگێڕی وەزارەتی تەندروستی عیراق، لەماوەی ساڵانی (١٩٥٢-١٩٥٨) دەبوایە لە هەر لیوایەک بەڕێوەبەرایەتیەکی تەندروستی هەبێت، لە شارۆچکەکانیش پزیشکی گشتی هەبێت، لە شارەدێش فەرمانبەری تەندروستی یان یاریدەدەری پزیشکی هەبێت.[2] لە ساڵانی (١٩٦٠-١٩٧٠) دا دۆخی تەندروستی بەشێوەیەکی گشتی خراپ بووە، لەڕانیە یەک نەخۆشخانە هەبووە و ئەویش وەک پێویست نەبووە، لە شارەدێکانی سەر بە شارۆچکەکە بنکەی تەندروستی هەبووە بەڵام بەتەواوی پشتگوێ خراوون، دەرد و نەخۆشی زۆر بڵاو بووە، ڕێژەی پزیشک زۆر کەم بووە ئاوهەوای ناوچەکەش هۆکاربووە بۆ بڵاو بوونەوەی چەندان نەخۆشی وەک: (سک چوون و مەلا ریا و زەردوویی، سیل، ڕشانەوە، قەسەبات، گرانەتا، ئاوسانی سک، نەخۆشی جگەر و سپڵ) بەتایبەت لە گوندەکان، دەرمانی چارەسەری پێشکەوتوو نەبووە، بەزۆری حەبی ( پاراستۆل، ئەسیتامینۆفین، ئەمپسلین، تتراسایکلین، بیلادۆنا، پریماکوین، کامکولیت، لیسیەم کاربۆنەیت، کلۆرۆکوین)هەبووە، دەرزی لێدانیش لە تەشتێکدا گەرم کراوە و دوای ساردکردنەوەی بەکارهاتووە، بە هۆی نەبوونی پزیشک و نەشتەرگەری لە ناوچەکە ڕێژەی مردن لە ناو منداڵ و ژناندا زۆر بووە لەو ماوەیەدا تەنها (د.خالید ئەحمەد یونس) و (د.عەلی ددان) و ژمارەیەکی زۆرکەم سستەر و موزەمید هەبووە، نەخۆشێک کە پێویستی بە نەشتەرگەری بوبێت بەڕێکراوە بۆ سلێمانی، یەکێک لە نەخۆشیە بڵاوەکانی ئەم ساڵانە نەخۆشی مەلاریا بووە، هەر بەو هۆیەوە لە ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠) تیمی مەلاریا لە نەخۆشخانەی ڕانیە دروست بووە، لە ناو ڕانیە و گوندەکان گەڕاون و ناوچەکەیان ڕشاندووە، تا ساڵی (١٩٧٠ )بە سواری ئاژەڵ کارەکانیان

[1] نەخوشخانەی گشتی ڕانیە، هۆبەی خۆیەتی، ٢٠١٥/١١/١٨؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ علی سابیر علی: ٢٠١٥/١٢/١٩؛ محمد ئەمین عارف: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦.

[2] حيدر حميد رشيد: الاوضاع الصحية في العراق (١٩٤٥-١٩٥٨)، اطروحة الدكتوراه (غير منشوره)، كلية التربية، جامعة بغداد، ٢٠٠٧، ص٦٣.

ئەنجامداوە.[١] بەهۆی زۆری ڕێژەی مەلاریا لە ناوچەکە تا نەوەدەکانی سەدەی بیستەم تیمی قەڵاچۆکردنی مەلا ریا لە ناوچەکە زۆر چالاک بووە.[٢]

لە دوای ساڵی (١٩٧٠) کۆمەڵێک پزیشک هاتوون بۆ ناوچەکە، سەرەتای حەفتاکان پزیشێکی هیندی لە ڕەگەزی نێر بەناوی (لاکی داس کوبتا) هاتووە بۆ ڕانیە لەو کاتەدا بەگشتی کۆمەڵێک یاریدەدەری پزیشک و برینپێچ (موزەمید) کارەکانیان ڕاپەراندووە، لەوانە: (فاوق حەمە سەعید، ئەلبێرت مەسیحی، عەلی سابیر عەلی، ست فاتمە عەلی)، دواتر حکومەت کۆمەڵێک پزیشکی تری ناردووە بۆ ڕانیە، وەک (د.موەفەق محەمەد پسپۆڕی منداڵان، د.نەسرین محەمەد سالح پسپۆڕی ئافرەتان، د.بەکر عوسمان، د. فازڵ، پسپۆڕی منداڵان، کە بەڕێوەبەر بووە، د. خالید ئەحمەد یونس، پسپۆڕی گشتی، د. سەمیر، هەناوی، ماوەیەک بەڕێوەبەر بووە، د. عیماد پسپۆڕی ددان، د.قادر عەبدولرەحمان قادر، ماوەیەک بەڕێوەبەر بووە و پسپۆڕی منداڵان و گشتی بووە) ئەم پزیشکانە جێگیر نەبوون، دانەیەک یان دوان بەجێگیری ماونەتەوە، کە دانەیەک هاتووە ئەوی تر ڕۆیشتووە، بە هاتنی ئەم ڕێژە لە پزیشک بۆ ناوچەکە بە بەراورد بە ساڵانی شەستەکان، دۆخی تەندروستی باشتر کردووە، چونکە چارەسەری نەخۆش پەیوەستە بە پزیشک و پسپۆڕ بۆ دیاریکردنی جۆری نەخۆشیەکە و پێدانی دەرمانی دروست، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ڕەوشی تەندروستی لە ناوچەکە خراپ بووە، چونکە نەشتەرگەری نەبووە، نەخۆشیەکانی منداڵان و ژنانیش زۆربووە، ڕێژەی مردن بەنەخۆشی لەناو هەردوو ڕەگەزدا بەرزبووە.[٣]

لە ساڵی (١٩٧٨-١٩٧٩) ژمارەی کارمەندانی نەخۆشخانەی ڕانیە بەبەراورد بەڕابردوو زۆر زیادیکردووە، پزیشکەکان بریتیبوون لە (د. محەمەد بەڕێوەبەر، د. مەحمود فەقێ ڕەسوڵ، د.مەحمود پسپۆڕی ددان، د.ئەڵماس مەسیحی)، لەگەڵ چەندین برینپێچ و سیستەر لەوانە (عەلی ئیبراهیم عەلی، ئیبراهیم مستەفا، فاتمە عەلی، گورجی فەتحولا، سعاد عەلی، نەسرین یەڵدا)، جگە لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیان لە نەخۆشخانە کاری مامانیشیان کردووە تا ساڵی (١٩٩١) خزمەتێکی زۆریان بەم کارەکردووە، تیمەکانی مەلاریاش لەم ماوەدا بریتی بوون لە (سابیر شێخە، حەمەدەمین سەلکە، ئەحمەد پورەدلە) ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە قەڵاچۆکردنی نەخۆشیە وەرزییەکان.[٤]

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فاتمە عەلی ئەحمەد: ٢٠١٦/٤/٢؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد مستەفا حەمەد زرار: ٢٠١٦/٣/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٥ ڕانیەیە و تا قۆناغی ناوەندی خوێندووە، یەکێک بووە لە سەرپەرشتیارانی تیمی مەلاریا، (٤٦) ساڵ لە نەخۆشخانەی ڕانیە، خزمەتی کردووە، ئێستا خانەنشینە

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سابیر شێخە وەیس:٢٠١٦/٣/١٤، ڕانیە، تاقۆناغی ناوەندی خوێندووە، لە ١٩٧٣ لە نەخۆشخانەی ڕانیە دامەزراوە لە تیمی مەلاریا کاری کردووە، ئێستا خانەنشینە.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فاتمە عەلی ئەحمەد: ٢٠١٦/٤/٢.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد مستەفا حەمەد زرار: ٢٠١٦/٣/٢٤.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ گورجی فەتحوڵلا عەبدوڵلا: ٢٠١٦/٤/٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٢ میرزاڕۆستەمەو لە ١٩٧٨ کارمەندی تەندروستیە لە نەخۆشخانەی ڕانیە ئێستا فەرمانبەری خانەنشینە.

لە ساڵی (١٩٨٠) نەخۆشخانەی ڕانیە لەگەڕەکی قولە گواستراوەتەوە بۆ گەڕەکی کێوەڕەش، دواتریش لە کۆتایی (١٩٨٣) بەهۆی تەواوبونی باڵەخانەی نەخۆشخانەی گشتی ڕانیە، نەخۆشخانەکە گوازراوەتەوە بۆ گەڕەکی گڵنجان بۆ ناوەندی شارۆچکەکە و بەتەواوەتی لەوێ جێگیرکراوە هەر لەو ماوەیەدا بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی عیراق و ئێران، نەخۆشخانەی سەربازی لە ڕانیە کراوەتەوە، ئەم نەخۆشخانەیە هەرچەندە سەربازی بووە، بەڵام سوودی زۆری بۆ هاوڵاتی مەدەنیش هەبووە، چونکە حکومەتی عیراق زۆر گرنگی بەم نەخۆشخانەیە داوە لە ڕووی دەرمان و پزیشکی پسپۆرەوە، بۆیە زۆرجار کەسێکی مەدەنی کە پێویستی بە نەشتەرگەری بووە لەبری ئەوەی بنێردرێت بۆ سلێمانی ناردوویانە بۆ ئەم نەخۆشخانەیە، یان زۆرجار تیمی پزیشکیان چووە بۆ نەخۆشخانەی ڕانیەو نەشتەرگەریان بۆ ئەو هاوڵاتیانە کردووە، کە پێویستیان بە نەشتەرگەری هەبووە لەگەڵ چەندین هاوکاری تر.[1]

لەگەڵ کردنەوەی نەخۆشخانەی گشتی ڕانیە لە ساڵی (١٩٨٣)، چەند بەشێکی تازە بۆ نەخۆشخانەکە زیادکراوە، جگە لە کارگێڕی، بەشێوەی گشتی بەشەکان ئەمانە بوون (دەرمانخانە، کۆگای دەرمان، فریاکەوتن، تیشک، چاودێری دایکایەتی، بنکەی تەندروستی مەلاریا، خەواندنی نەخۆش، نەشتەرگەری، کوتان، شیکاری نەخۆش)، دەوامیش کراوە بە دوو شیفت، کاتژمێر(٨-٢) و (٢-٤) بووە، ئێشکگری شەوانەش هەبووە، بەڵام پزیشک ئێشکگری نەگرتووە تەنها یاریدەدەری پزیشک و برینپێچ و سیستەرەکان، ئەم کارەیان کردووە،[2] تا ساڵی (١٩٩١) ئەم پزیشکانە لە نەخۆشخانەکە دەوامیان کردووە، بە پێی هاتن و گواستنەوەیان کە بریتیی بوون لەمانە(د.قادر عەبدولرەحمان، د.عەبدولا شەریف، د.شێرکۆ عەبدوڵا، د.دانا عومەر، د.نەجمەدین حەسەن، د.ڕازاو فاتح، د.تاهیر عارف، د.نزار، د.ئاواز، د.ڕوناک)، لەگەڵ چەندین کارمەندی تەندروستی و یاریدەدەری پزیشک وەک: (خدر محەمەدئەمین، کامیل ئەحمەد، شوکریە ئەحمەد، وشیار ڕەشید، مەحمود بابەکر، هێرش خدر، هتد). بە شێوەیەکی گشتی دۆخی تەندروستی ڕانیە لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم تا ڕادەیەک ناوەند بووە، لە ڕووی دەرمان و خزمەتگوزاری و کەلوپەلی تەندروستیەوە، ڕێژەی توشبوون بە نەخۆشی و چارەسەرکردنی لە ڕابردوو باشتر بووە لە ڕووی جۆر و دڵنیاییەوە چارەسەرە پزیشکیەکان باشتر بوون و نەخۆشیش کەمتر بووە، هۆشیاری لای هاوڵاتی زیاتر بووە، گرفتی گەورە نەشتەرگەری و نەبوونی ژمارەی تەواو بووە لە پزیشکی پسپۆر لە ناوچەکە، زۆرێک

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ پیرۆت ئەحمەد عەبدوڵڵا: ٢٠١٦/٤/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٧ ڕانیەیە و دەرچووی ناوەندیە و لە ١٩٧١ لە نەخۆشخانەی ڕانیە وەک فەرمانبەر کاری کردووە و ئێستا خانەنشینە.

[2] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی تەندروستی، نەخوشخانەی گشتی ڕانیە، هۆبەی خۆیەتی،٢٠١٦/٤/٢.

لە نەشتەرگەرییەکان بەڕێکراون بۆ سلێمانی و بەشێکیشیان بەهاوکاری نەخۆشخانەی سەربازی ئەنجام دراون.[١]

لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا لە ڕانیە جگە لە چارەسەری تەندروستی گشتی و فەرمی، چارەسەری میللی یان نۆژداری میللی (الطب الشعبی)، لەناوچەکەدا بوونی هەبووە، کە ئەم دیاردەیە نەریت و کارێکی کۆنی کوردەوارییە و مێژوویێکی درێژی هەیە، ڕۆژگارێک لەبەر کەمی و نەبوونی کەسانی ئەکادیمی و پیشەیی، تاکە سەرچاوەی چارەسەر بووە، لە کاتی نەخۆشی و گرفتە تەندروستیەکان، دەرمان و چارەسەری کوردەوارییان بەکارهێناوە، چەندان پیاو و ئافرەتی خەمخۆری تێدا هەڵکەوتووە، لەکاتی نەخۆش کەوتن و سووتان و بریندار‌بوون و زیان گەیشتن بە مرۆڤەکان، وەک کارێکی مرۆڤدۆستانە هەستاون بە تیمارکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشەکان، بە گوێرە و لێکدانەوەی خۆیان، لەهەندێک کاردا سەرکەوتوو بوون لە هەندێک کاتیشدا زیانیان گەیاندووە بە نەخۆشەکە بۆ نمونە گەر کەسێک توشی سەر ئێشە هاتبێ سەریان بەستووە یان نێوچەوانیان کوتاوە، یان منداڵیک تووشی چاو ئێشە هاتبێ دەرمانە سوورەیان لە چاوی داوە یان شیر و چایان لە چاوی کردووە، یاخود کەسێک توشی گوێ ئێشان هاتبێ ، دوکەڵی جگەرەیان لە گوێی کردووە و بەکردارەکەیان وتووە گوێ قانگدان، کاتێکیش مرۆڤ توشی لەرزوتا یان سکچوون هاتووە لەشیان بەڕۆن چەورکردووە، لەگەڵ بەکارهێنانی چەندین جۆر و شێواز و چارەسەری تردا.[٢]

کۆمەڵێک ئافرەتیش هەبوون کە کاری دەرمانسازی و چارەسەری نەخۆشیان کردووە و لە ڕێگەی دروستکردنی دەرمان بەگژووگیا و هەندێک کرداری سروشتی، چارەسەری زۆرێک لە نەخۆشیەکانی وەک بەبۆن کەوتنی منداڵ و زەردویی و سوتان و سەر ئێشە و ژەهراوی بوون، دروستکردنی مەلهەمی منداڵ لەدایک بوون، لەگەڵ چەندین گیراوەی بەسود بۆ نەخۆشیە جۆربەجۆرەکان، چ ڕۆژانە وەک نورێنگەی پزیشک هاولاتی سەردانی کردوون و چارەسەری نەخۆشییان کردووە، هەندێکیان لەگەڵ ئێشەکەیان کاری مامانیشیان کردووە، لەوانە، حەلیمە خدر ناسراو بە نەحەلەی دەرمانساز، کۆتر دەرباز خاڵند بەگ ناسراو بەنەنەکۆتر (١٨٩٠-١٩٦٧)، فاتمە خدر ئەحمەد ناسراو بە کوێخا ژنی قامیشە(٨٩٣-١٩٩١)[٣] حاجی فاتم کوێخا کەریم لە (١٩٧٠) کۆچی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ کامیل ئەحمەد حەمە: ٢٠١٦/٤/٢٥، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ سلێمانیەو دەرچووی پەیمانگای پزیشکی هونەریە، لە ساڵی ١٩٧٧ دامەزراوە و ئێستا فەرمانبەرە لە بەڕێوەبەرایەتی خۆپاراستن و هونەری تەندروستی ڕاپەڕین؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر محەمەدئەمین: ٢٠١٦/٣/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٥ قەلادزێیەو دەرچوی پەیمانگای پزیشکی هونەری بەغدایە و لە ساڵی ١٩٨٣ فەرمانبەری نەخۆشخانەی ڕانیە و تا ئێستا بەردەوامە لەکارەکەی.

[٢] کامەران: ڕانیە و نوژداری میلی، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (١٢) حوزەیرانی ٢٠٠٥، ل١٢-١٣.

[٣] شناو ڕەسوڵ: نەنە حەلەی دەرمانساز تەمەنی ١٠٥ ساڵەو هێشتا گەشبینە بە ژیان، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (١٨) کانونی یەکەمی ٢٠٠٦، ل ٤٨؛ خالید عەلی وەلی: نەنەکۆتر فریشتەی میهرەبانی، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (١١) ئازاری

دوای کردووە، عائیشە ئیسماعیل ڕەحمان ناسراو بە عائیشە ڕانک (١٩٠١-١٩٦٩)، کە یەکێک بووە لە مامانە لێهاتووەکانی ئەو سەردەمە، لەماوەی (٢٨) ساڵ کارکردنی لە بواری مامانی، نەیهێشتوە هیچ ئافرەتێک ڕووبەڕووی گیان لەدەستدان بێت بەهۆی منداڵ بوونەوە. لە بواری چاکردنەوەی شکان و هێنانەوەی لە جێچوونی ئەندامەکانی جەستە، ناوک کەوتن و هتد، کۆمەڵێک کەس لە ڕانیە ئەم کارەیان کردووە و شارەزایی باشیان تیدا هەبووە، لەوانە مام ڕەسول شاوری و مەحمود عەبدوڵا خەج، حاجی سەلیم، کەسایەتیە شارەزاو دیارەکانی ئەم بوارە بوون لە ناوچەکەدا.[1]

بە چاوخشاندن بە ڕەوشی تەندروستی ڕانیە لە ماوەی سالانی (١٩٥٨-١٩٩١)، بۆمان دەردەکەوێت، کە دۆخی تەندروستی ناوچەکە لەڕووی چاسەرەوە لە شێوەی خزمەتگوزاری تەندروستی سەرەتایدا بووە و وەک پیویست نەبووە و تا ڕادەیەک خراپ بووە، لە کەمی نەخۆشخانە و پزیشک و کارمەندی تەندروستیەوە بگرە تا دەگات بە کەمی دەرمان و خزمەتگوزارییە تەندروستیەکانی تر، نەبوونی نەشتەرگەری و کەمی پزیشک و نەبوونی پزیشک پسپۆر یەکێک بووە لە گرفتە گەورەکانی ئەم سەردەمەی ناوچەکە، بەربلاوی نەخۆشیەکانی ئافرەتان و منداڵان و نەخۆشیە جۆربەجۆرەکانی تر، هێندەی تر ئەرکی سەر ژیانی هاوڵاتیانی قورستر کردووە، لە پاڵ خراپی دۆخی ئابووری و بوارەکانی تردا، هانا بردنیش بۆ چارەسەری میللی لە بۆشایی نەبوونی خزمەتگوزاریە تەندروستیەکاندا بووە و لەگەڵ سودەکانی زۆرجار بە هۆی نەزانین و خراپی بەکارهێنانیەوە زیانی زۆری بە تەندروستی مرۆڤەکان گەیاندووە و بۆتە چارەسەرێکی هەڵخەڵەتێنراو بۆ نەخۆشەکان.

---

٢٠٠٥، ل ٢١؛ حەبیبە بابان: کوێخا ژنی قامیشە ئەوژنەی سنورە دەستکردەکانی دەبەزاند، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (١٥) ئازاری٢٠٠٦، ل٢٢.

[1] حەبیبە: عائیشە ڕانک ژنێک لە بوێری، گۆڤاری ڕانیە، ژ(١٠) کانونی یەکەمی ٢٠٠٤، ل٣٥؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەلیم حاجی محەمەد دەرباز: ٢٠١٦/٣/٣١، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ ڕانیەیە و تاقۆناغی ناوەندی خوێندووە و ئارەزوومەندی و شارەزایی لە بواری دەرمانی کوردەواریدا هەیە و پیشەی کەبابچیە.

## باسی پێنجەم/ بارودۆخی ڕۆشنبیری ڕانیە

سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەم بە دەستپێکی سەرهەڵدان و پەیدابوونی بزوتنەوەو گروپی ڕۆشنبیری و ئەدەبی دادەنرێت لە باشوری کوردستان، هەرچەندە جولانەوەکان بچووک و زیاتر لۆکاڵی بوون، بەڵام کاریگەر بوون و هێمابوون بۆدەرکەوتنی گەشە و جولانەوەی گەورە.[١] هەلومەرجی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی لە ڕانیە دەگەڕێتەوە بۆ دەرکەوتنی چینی خوێندەوار لە شارەکە، لە ساڵی (١٩٤٤) بڵاوکراوەیەک بەناوی (بڵێسە) دەرچووە کە لە شێوەی دەستنووسدابووە، پێنج ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە و دواتر وەستاوە، لەگەڵ خوێندەوار بوونی خەڵک و پەرەسەندنی خوێندن و بەدەستهێنانی بڕوانامە جۆربەجۆرەکان، جولانەوەی ڕۆشنبیری لە سەرەتای حەفتاکاندا بەشێوەیەک لە شێوەکان لە یاد و بۆنەکاندا هەستی پێکراوە، لەگەڵ بوونی تەنها یەک کتێبخانەی ئەهلی کە (سەردار محەمەد) خاوەنی بووە، لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە ژمارەیەکی کەم تەلەفزیۆن و ڕادیۆ هەبووە تا ئەوکاتە تاکە سەرچاوە بوون بۆ ئاگاداربوون لە دەوربەر و گەیشتن بەزانین.[٢]

لە ساڵی (١٩٧١) (میرزا محەمەدئەمین مەنگوڕی)،[٣] کە کەسێکی ئەدیب و نووسەر بووە لە شارەکە، کتێبێکی بەناوی (گەشتی ئەستێرەی مەریخ) بڵاودەکاتەوە،[٤] بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە بۆتە هۆی توڕەبوونی مامۆستا ئایینیەکانی ڕانیە، بەهۆی ئەوەی ناوەڕۆکی کتێبەکەیان بە هێرشکردن بۆ سەر پیرۆزیەکانی ئیسلام زانیوە، ئەم پەرچەکردارە مەلاکانی سلێمانیشی گرتۆتەوە، لە ڕۆژی هەینیدا، نویژخوێنانی ڕانیە هێرشیان کردۆتە سەر ماڵی مەنگوڕی، بەڵام دواتر بە هاوکاری جێنشینی ڕانیە و

---

[١] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر سەرهەڵدانی بزوتنەوە ڕۆشنبیری و ئەدەبیەکان لە باشووری کوردستان. بڕوانە: ئەحمەد میرە: کاریگەری بزوتنەوە ڕۆشنبیری و ئەدەبییە کوردیەکان لەسەر کۆمەڵگای کوردی باشوری کوردستان، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠١٢، ل٨٨.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، جەلال قادر مینە: ٢٠١٦/٣/٢٨، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٩ ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگایە و شارەزای بواری ئامارە، ئێستا فەرمانبەرە لە فەرمانگەی ئاماری ڕانیە؛ جوتیار تۆفیق هەورامی: وتووێژێک لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ڕەمەزان، گۆڤاری زنار، ژ(١٣)، کانونی یەکەمی ٢٠٠٧، ل٢٣-٢٣.

[٣] ناوی تەواوی محەمەدئەمین ئەحمەد فەقێ برایمە، لە ساڵی ١٩١٠ لە قەلادزێ لەدایک بووە، ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی گەورک لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، مەنگوڕ تەنها نازناوی بووە ئەگینا خۆی مەنگوڕنیە، خوێندنی حوجرەی تەواوکردووە، لە سیەکانی سەدەی بیستەمەوە کەوتۆتە ڕانیە و لە ساڵی ١٩٨٨ کۆچی دوای کردووە. بۆزانیاری زیاتر لە سەر ژیان و کۆی بەرهەمەکانی بڕوانە: میرزامەنگوڕی قەڵەمێکی ئازا: گۆڤاری ڕۆڤار، ژمارە (٤١)، ٢٠٠٦/٨/١٥.

[٤] هەژار موکریانی، لە زاری محەمەدئەمین مەنگوڕی خۆیەوە ئاماژە بەوە دەکات کتێبی کەشتی هەسارەی مەریخ، لە بنچینەدا بەناوی (چۆن چومە مەریخ)، عەبدوڵڵا بەگی ناهیدەیە، مەنگوڕی تەنها کاری وەرگێڕانی بۆ کردووە و کردویەتی بەکوردی، نەک بەرهەم و نووسینی مەنگوڕی خۆی بێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هەژار: چێشتی مجێور، چ٣، پەخشانگای ئازادی، ٢٠٠٩، ل٤٦٥.

هەندێک کەسایەتی ئایینی ناوچەکە، مەنگوڕی ڕزگارکراوە و ڕەوانەی سلێمانی کراوە لەوێشەوە بۆ تەوێڵە.[1]

لە ساڵی (١٩٧٧) کتێبخانەی گشتی ڕانیە لە شارەکە کراوەتەوە، کردنەوەی ئەم کتێبخانەیە هەنگاوێکی باش بووە بۆ جوڵانەوەی ڕۆشنبیری لە ناوچەکە و ئاشناکردنی خوێنەران بە زمانە جیاجیاکان و دروست بوونی کۆڕو کۆبونەوەی ڕۆشنبیری لە ناوچەکەدا.[2] دواتریش مەڵبەندی لاوانی ڕانیە کراوەتەوە، کردنەوەی ئەم مەڵبەندە ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە پەرەپێدانی چالاکی هونەری و زانستی و وەرزشی لە ناوچەکەدا،[3] دواتر لە سەرەتای هەشتاکاندا لە لایەن کۆمەڵێک چالاکوان و ئارەزوومەندانی بوارە جۆربەجۆرەکان لیژنەیەکی ڕۆشنبیری پێکدەهێنریت، کە هەڵسوڕێنەرەکانی بریتیبون لە (محەمەد جەواد مستەفا، عەلی باپیر وەتمان، نیازی حەمە عەزیز، نەجات غەمبار، عومەر محەمەدئەمین مەرگەیی، سەربەست جیهاد)، لەسەرەتای کارەکانیاندا هەوڵیانداوە گۆڤارێک دەربکەن بەناوی (دەنگی لاوان)، بەڵام دەزگای ئاسایشی بەعس ڕێگری کردوە و نەهێشتووە ئەم کارە بگاتە ئەنجام، یەکێک لە کارەکانی ئەم لیژنەیە گرنگیدان بووە بە بواری ئەرشیفکردنی بەڵگەنامە مێژووییەکان، بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەکیان بە سەرپەرشتی (عەبدولڕەقیب یوسف) پێکهێناوە بە مەبەستی کۆکردنەوەی ئەو بەڵگەنامە مێژووییانەی کە هەبوون لەسەر ڕانیە، ئەرکێکی تری ئەم لیژنەیە گرنگیدان بوو بە ڕێکخستنی کۆڕ و سیمینار و سەرپەرشتی کردنی چالاکییە ئەدەبی و ڕۆشنبیریی و وەرزشیەکان، ئەو کەسانەی سەرپەرشتی کۆڕ و سیمینار و چالاکیە ڕۆشنبیریەکانیان بە پێی کات و بوارەکان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و کارەکان بە تەنها پەیوەست نەبووە بە کەسێک یان بە گروپێکەوە.[4]

بەدرێژایی ساڵانی هەشتاکان چەندین کۆڕو سیمینار و چالاکی جۆربەجۆر لە هۆڵی مەڵبەندی لاوانی ڕانیە سازکراوە، خەڵکیش ئامادەبوونی زۆری بۆ هەبووە، هەرچەندە نەبوونی هۆڵێکی گونجاو یەکێک بووە لە گرفتەکان، جگە لە دەستوەردانی سیاسی و سانسۆری دەزگا ئەمنیەکانی ڕانیە لەسەر

---

[1] کاکەمەم بۆتانی: ژانەرێیە خۆڵەمێشیەکان، بیرەوەری و بەسەرهاتی ساڵانی(١٩٦٤-١٩٧٥)، ب٢، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٨٩-٩٠.

[2] نیازی: لە دیدەنی کتێبخانەی گشتی ڕانیەدا، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ (٨٤٥) لە ١٩٨٦/٦/٢٦، ل ٥.

[3] نازم دڵبەند: لە مەڵبەندی لاوانی ڕانیەدا، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٧٤٤) لە ١٩٨٤/٦/٢٨، ل ٧-٨.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد جەواد مستەفا بایز: ٢٠١٦/٤/١، ڕانیە، ناوبراو لە دایکبووی ١٩٦٢ی ڕانیەیە و دەرچووی ئامادەییە، یەکێک بووە لە کەسە چالاکەکانی بواری ڕۆشنبیری ئەوکات، ئێستا خەریکی کاری ڕێکخراوەییە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ نیاز حەمە عەزیز: ٢٠١٦/٣/٢٨، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ ڕانییەیە و دەرچووی ئامادەی پیشەییە، زیاتر لە٤٠ ساڵە خەریکی بواری نووسینە لە زۆربەی بوارەکاندا و خاوەنی چەندین کتێبە، ئێستا ئەندامی دەزگای هەڵبژاردنی(پ.د.ک).؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ عومەر محەمەد ئەمین عەبدوڵلا مەرگەیی: ٢٠١٦/٣/٢٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦١ مەرگەیە و دەرچووی زانکۆیە، ئێستادا خانەنشینە.

بابەتەکان،[1] سازدانی کۆڕەکانش هەمەجۆر بووە، هەموو بوارەکانی ڕۆشنبیری گشتی گرتۆتەوە.[2] لەو سەردەمەدا چەند کۆڕێکی ڕۆشنبیری سازکراوە لەوانە کۆڕی (دکتۆر شێرکۆ عەبدوڵلا) بەناونیشانی (فرۆید و تۆبۆگرافیای دەروون)، کۆڕی رۆشنبیری (عومەر مەرگەیی) بەناونیشانی (پەروەردەی منداڵ)، کۆڕی روشنبیری (یاسین قادر بەرزنجی) لە ساڵی (١٩٨٧) دەربارەی شانۆگەرییە چاپکراوە کوردییەکان، کە لە لایەن مامۆستا ئەحمەد محەمەد ئابڵاخی کۆڕەکە سەرپەرشتی کراوە، ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانە لە لایەن کۆڕگێڕەوە پێشکەشکراون و گفتوگۆی زۆر لە نێوان ئامادەبووان و کەسی پێشکەشکار ئەنجام دراوە.[3] بەشێوەیەکی گشتی بارودۆخی رۆشنبیری ڕانیە، دابەش دەبێت بەسەر دوو بواردا، چالاکی (هونەری و وەرزشی)، کە لە خوارەوە باسیان دەکرێت:

**یەکەم/ چالاکیە هونەریەکان**

چالاکیە هونەریەکان لە ڕانیە دابەش دەبیت بەسەر چەند لایەنێکدا، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

**١- هونەری شیعر**

شیعر لە ڕانیە، مێژوویەکی دورودرێژی هەیە و لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم چروستانی شاعیر(١٨٩٠-١٩٦٣) کە لە ڕانیە مامۆستای ئایینی دەبێت، کار لەم بوارەدا دەکات،[4] لە ساڵانی سی و چلەکانیشدا مەلا حەمید عەسکەری (١٨٨٥-١٩٦١) وەک شاعیر و مەلا و مامۆستای بواری پەروەردە لە ناوچەکە دەردەکەوێت،[5] لە دوای ساڵی (١٩٥٠) وە محەمەدئەمین مەنگوڕی لە ڕانیە دەردەکەوێت بە هەردوو شێوازی ڕۆمانسی و نیشتمانی شیعر دەنوسێت، لە شەستەکانیش حەمەدئەمین حوسێن حاجی ناسراو بە بیتوێنی و مەحمودی قادر فەرەج دەست بە شیعر نووسین

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەمزە حەسەن عەبدوڵلا (گولانی): ٢٠١٦/٣/١٨ ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٤ ڕانیەیە لە حوجرەی خوێندوویەتی، یەکێک بووە لە کەسە چالاکەکانی ئەوکات و خاوەنی دوو دیوانی شیعریە، تا ئێستاش بەردەوامە لە بواری نوسین و کاری ئەدەبی.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد جەواد مستەفا بایز، ٢٠١٦/٤/١.

[3] لە چالاکی لیژنەی ڕۆشنبیری مەڵبەندی لاوانی ڕانیە: ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٨٠٨)، ١٩٨٥/١٠/٣، ل١٢.؛ نیازی حەمە عەزیز، کۆڕێکی ڕۆشنبیری لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ (٨٣٤)، ١٩٨٦/٤/٣، ل٨؛ نیازی، لەڕانیە کۆڕێکی ڕۆشنبیری، ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق، ژمارە(١٣)، ١٩٨٧، لا... ئەم بابەتەم لە خودی ڕۆژنامەنوسی ئامادەکارەوە وەرگرت، بەداخەوە کە پێیدام ژمارەی لاپەڕەی لەسەر نەبوو، هەردوو کتێبخانە گشتی هەولێر و سلێمانی گەڕام بەلام ئەم ژمارەیەم بەردەست نەبوو، بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٧).

[4] عەبدولرەحیم عەبدوڵلا چروستانی، سالح عەبدوڵلا چروستانی: دیوانی چروستانی، بێ شوین و ناوی چاپ، ١٩٨٥، ل٧-٨.

[5] فائیزی مەلا بەکر: شاعیری نەناسراو مەلا حەمیدی عەسکەری (حامید)، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٤٨٣) ساڵی ١٩٨٢، ل٢٤-٢٦.

دەکەن، دواتریش ئەحمەد شێوای شاعیر،[1] بە شێوازی شیعری بەرگری و نیشتمان پەروەری پەرەی بەم بزاوتە داوە.[2] لە سەرەتای هەشتاکانیشدا بواری شیعر گەشەی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوە، چەند شاعیرێک بەشداربوون لەم بزاوتە دیارترینیان ئەمانە بوون: (ئەحمەد شێواو، مەحمود قادر فەرەج، شوانە گەلاڵی، غەریب پشدەری، مامۆستا زیاد، هەمزە گولانی، خدر گولانی، نیازی حەمە عەزیز، عومەر مەرگەیی، عومەر نوورەدینی، مەریوان فەتحی، حەمە ئەحمەد جاف، خدر ئەحمەد مەحمود، سارا فەقێ خدر، شنە ڕانیەیی- جوانە ئەسوەد، کەژاڵ عەلی، ئازاد بابان، ئەمیر حوسێن، ئەمیر مەحمود، ئیسماعیل ڕاجی)، لە ڕووی ناوەرۆک و ڕوخسارەوە هەندێک لە شاعیرانی ئەو سەردەمە، لەسەر ڕێبازی( کلاسیک،ئازاد) شعریان نووسیوە، بەهۆی بوونی سانسۆری سیاسی هانایان بۆ بەکارهێنانی هێما (ڕەمز- Symbol) بردووە لە دەربڕیندا زۆربەی جەماوەری شیعریش ئاشنا بوون بەم ڕەمزانە، زۆرێک لە شاعیرەکانیش لە ڕێگەی کۆڕی شیعر خوێندنەوەدا شیعرەکانیان بە جەماوەر گەیاندووە، سازدانی ئەم کۆڕانە تەنها بۆ شاعیرانی ڕانیە نەبووە بەڵکو سەکۆیەک بووە بۆ شاعیرانی شارەکانی تر کوردستانیش کە تا ساڵی (١٩٩١) بەردەوام بووە.[3]

لە (١٩٨٣/٢/١٠) بۆ یەکەمجار لە لایەن کۆمەڵێک نووسەر و ڕۆشنبیری ڕانیە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ ئەحمەد شێوای شاعیر ڕێکدەخرێت بە ئامادە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە هاولاتیان و نوسەر و شاعیرانی ناوچەکە، لە کۆڕەکەدا مەحمودی قادر فەرەج و ئەحمەد قادر سەعید شیعریان تێدا خوێندۆتەوە، دواتر بە هۆی جولانی هەستی نەتەوەیی و خرۆشانی هەست و سۆزی خەڵک کۆڕەکە دەشلەژێت و ڕێکخەرانی کۆڕەکە بۆ ماوەیەک لە ترسی گرتن لە لایەن دەزگاکانی ئەمنەوە خۆیان دەشارنەوە،[4] کەسە چالاکەکانی ئەو کات زۆربەیان سەر بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان(ینک) و کەمێکیشیان سەر بە ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی و لایەنەکانی دیکە بوون. لە ڕۆژی (١٩٨٣/٣/١٩) کۆڕێکی شعری لە هۆڵی مەڵبەندی لاوان ڕانیە بەستراوە، جەواد شێخ مستەفا وەک کۆڕگێڕ و نیاز حەمەعەزیز، خدرگولانی و هەمزە گولانی و ئەحمەد شێواو و مەحمود

---

[1] ناوی تەواوی ئەحمەد ڕەشید محەمەدە، لە ساڵی ١٩٢٧ لە قەلادزی لە دایک بووە، بە شاعیری میللی ناسراوە و لە ساڵی ١٩٩٩ لە ڕانیە کۆچی دوای کردوو بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. ئیدریس عەبدوڵڵا: ئەدەبی میللی و فۆلکلوری، ب٣، هەولێر، ٢٠١٤، ل٤٧٤-٤٩٨.

[2] گێوی موکریانی: کەشکۆڵی گێو، پێداچونەوە و ئامادەکردنی، د.کوردستان گێوی موکریانی، بەرگی دووەم، بێ ناوی چاپ و شوێنی چاپ، ١٩٨٨، ل٥١-٥٢؛ ئازاد: شاعیرێک لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ (٨٧٠)، ١٩٨٦/١٢/١٨، ل١٢، نیاز حەمە عەزیز، ٢٠١٦/٣/٢٨.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئیسماعیل عبدالرحمن ئیبراهیم (ڕاجی): ٢٠١٦/٣/٣٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٧٧ کۆیەیە و دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆیە لە ١٩٧٧ شیعر دەنوسێ ئێستا فەرمانبەرە لە خانەی ڕۆشنبیری مندالانی ڕانیە.

[4] ئەحمەد شێواو: خەونی شادی، کۆکردنەوەو نوسینی پێشەکی، نیازی حەمە عەزیز، چ٢، چاپخانەی ئاکام، سلێمانی، ٢٠١٢، ل٧،٨.

قادرفـەرەج و ئیسـماعیل ڕاجی، لـەو کـۆڕەدا بەشـیعر بەشـداریان تێدا کـردووە، پێش خوێندنـەوەیان شیعری هـەموو شـاعیرانی بەشـداربوو، لـە لایەن لیژنـەی دەزگای ئەمنییـەوە سـەیرکراوە و زەڕبێکی سـوور لـە شـیعرێکی ئیسـماعیل ڕاجی دراوە بـە نـاوی (ناونیشـان)، کـە نابێت بیخوێندرێتـەوە، بـەڵام شاعیرگوێ بەم کارە نادات و شیعرەکەی دەخوێنێتەوە، کە بریتی بووە لە:

وڵاتەکەم تاکو ئێستا، بیابانێکی چۆڵ و هۆڵە،

بیری دڵە هەژارەکەم، پەیامبەری خۆشەویستی خاک و خۆڵە،

بەڵام گیانە، گەر دەتەوێ ناونیشانم بزانی ناسنامەم بۆ بنێری،

لەسەر نامەکەت بنووسە: وڵاتی: ژان، شاری: غەمگین، گەڕەکی: ڕق،

ژمارەی دەرگا: کوردستان دابەشی چوار بگات بەدەست خاڵەی ڕێبوار.

کاتێ کە شاعیر تەواو دەبێت و لـە تەختـەی شـانۆ دادەبـەزێ، کەسـێکی دەزگـای ئـەمن بـەناوی ڕەفیق نەجات، کە لـەوێ ئامـادە دەبێت هـەڕەشـەی لێپرسینەوە لـە شـاعیر دەکات، بـەم هۆیـەوە جـەماوەری بەشدار بوو وەک بەرگریکردنێک هۆڵەکە چۆڵناکـەن، بۆ ئـەوەی پیـاوانی ئـەمن دەسـتگیریان نەکـەن.[1] چالاکییـە ڕۆشـنبیرییەکان بـەردەوام درێژەیـان هـەبووە و لـە سـاڵی (١٩٨٥) دا دەزگـای ڕۆشـنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی سلێمانی کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە لە هۆڵی مەڵبەندی لاوانی ڕانیـە ڕێکدەخات بۆ شاعیر غەریب پشدەری بە ئامادەبوونی قادر سـەعید و دڵشـاد مـەریوانی، لـە چالاکیەکدا کۆمـەڵێک شیعر و کاری ڕەخنەیی پێشکەش دەکرێت.[2]

لە دوای ساڵی (١٩٨٦) کارەکان زۆر زیادیان کردووە، هەموو هەفتەیەک کۆڕێک بۆ دوو کۆڕی شیعری سازکراوە، شاعیرەکانی ئەوکاتی باشووری کوردستان وەک (ئازاد مەحمود مستەفا، هیدایـەت عەبدوڵا حەیران، دڵشاد مەریوانی، دڵشاد عومەرکاکی، شـەهاب عوسـمان، سـەلاح محەمـەد، فەرەیدون عەبـدول بـەرزنجی، عـەباس محەمـەد)، بـەردەوام بەشـداربوون لـە کـۆڕە شـیعرییەکان، فراوانـی چالاکییـەکان دەنگدانەوەیـەکی زۆری بۆ خـۆی دروسـتکردووە، کـەژاڵ ئەحمـەدی شـاعیر ئامـاژە بـەوە دەکات کە لە ساڵی (١٩٨٧) بۆ یەکەمین جار لە دەرەوەی سلێمانی کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەی لەڕانیە ئەنجامـداوە، کـە ئەمـەش هێمایـە بۆ گرنگیـدانی ئـەو ناوچەیـە بۆ ئـەو بـوارە.[3] لـە سـاڵی (١٩٨٧) لـە دەرەوەی ئەو چوارچێوە ڕۆشنبیریە شیعرەی کە لە ڕانیە هەبووە، خدر کۆسـاری (١٩٦٧-١٩٩٣) وەک لاوێکی باکگراوند بـە فکرەی ئیسـلامی جیاواز لـەوانی تر، یەکـەمین شـیعری خـۆی بـە نـاوی (نیگـاری

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئیسماعیل عبدالرحمن ئیبراهیم:٢٠١٦/٣/٣٠.

[2] ئازاد: کۆڕێکی ئەدەبی لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ(٨١١)، ١٩٨٥/١٠/٢٤، ل١٢.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر کاک مەلا هەمزە(گولانی): ٢٠١٦/٣/١٨، ڕانیە، نـاوبراو لـە دایک بـووی ١٩٥٥ ڕانیەیـە و نووسـەر و شاعیرە، لە ماوەی هەشتاکاندا کەسێکی چالاک بـواری ڕۆشـنبیری بـووە لـە ڕانیـە، ئێسـتا ئەفسـەرە لـە وەزارەتی پێشمەرگە؛ کەژاڵ ئەحمەد هەمیشـە خـۆم بەیەکێک لـە ئەندامانی خێزانـە خـاکی و دڵ پڕ ئەڤینـەکانی ڕانیـە دەزانم: گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(٥)، ئابی ٢٠٠٣، ل٢٤.

خودان) بڵاودەکاتەوە، بە شێوەیەکی چڕ دەستی کردووە بەبواری شیعر نووسین.[1] ساڵی (١٩٨٨) وردە وردە شاعیرانی ناوچەکە لەڕوی کارکردنەوە لەو شێوازە لۆکاڵیەی جاران دەردەچن، بۆ ئەم مەبەستەش لە کۆڕێکی شیعری فراوانی ناوچەکانی سلێمانی، دەستەیەک لە شاعیرانی ڕانیە کە پێکهاتبوون لە (هەمزە گوڵانی، خدرگوڵانی، نیازحەمە عەزین، کەژاڵ عەلی، کاوەفیدا) بەشیعر بەشداری کۆڕەکە دەکەن، کە ئەمە بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت لە ڕووی تێکەڵاوی بەرەوپێشچوون و توانایی ئاست و تەکنیکی شاعیرانی دەڤەرەکە.[2] لە ساڵی (١٩٨٩) لە سازدانی کۆڕێکی شیعری فراوان لە سەندیکای کرێکارانی شاری هەولێر، هەریەک لە (هەمزە گوڵانی، نیازحەمە، خدرگوڵانی، کەژاڵ عەلی) بە شیعر بەشداری کۆڕەکە دەکەن، کە مەحمود زامدار کۆڕەکە بەڕێوەدەبات، هەرچەندە ڕێگری دەکات لە خوێندنەوەی شیعرێکی هەمزە گوڵانی بەناوی (شاری بیرە دزراوەکان)،[3] کە هێمایە بۆ شاری کەرکوک، بەڵام ناوبراو سور دەبێت لەسەر خوێندنەوەی شیعرەکەو شیعرەکەی پێشکەش دەکات.[4]

جگە لەو شێوازە شیعریانەی ئاماژەی پێکرا، شێوازی شیعری تایبەتیش هەبوو، کە شێوازی شیعری هەجوو بووە، پێشەنگی ئەم جۆرە شیعرەش لەڕانیە لە ماوەی هەشتاکاندا (شێخ سدیق محەمەدئەمین) بووە، لەڕێگەی نووسین و دانانی شیعری هەجوو بۆ هاوڕێ و هاوپیشەکانی، وای کردووە وەڵامدانەوە دروست ببێت و پەرە بەم جۆرە لە شیعر نووسین بدرێت لە ناوچەکە.[5] بەشێوەیەکی گشتی کۆڕو کۆبونەوە شیعرییەکان تا ساڵی (١٩٩١) بەردەوام بووە، بەتایبەت لە هۆڵی مەڵبەندی لاوان. محەمەد جەواد مستەفا وەک کۆڕگێڕ و ڕێکخستنی بەشێک لە کۆڕەکان ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لەو بوارەدا، بەشێکی ئەم کارو چالاکیانە لە ڕۆژنامەی هاوکاری و پاشکۆی عیراق بڵاوکراونەتەوە، جگە لە نووسینی تایبەت لە گۆڤارە جۆر بەجۆرەکان، ئەمە نمونەی یەکێک لە شیعرەکانی شنە ڕانیەیی (جوانە ئەسوەد)، کە لە پاشکۆی عیراقی (١٩٨٩) بڵاوکراوەتەوە بەناوی (نەمن، نەتۆ):

کاممان ژوانی شەوانەی

خستە بەر سەیلانی قین؟

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ژیان و شێوازی شیعری و بەرهەمەکانی. بڕوانە: شەریف وەرزێر(ئامادەکار): دیداری کۆساری، لێکۆڵینەوەی سەنتەری پەرەپێدانی لاوان- ئۆفیسی ڕانیە، چاپخانەی کوردستان، بێ شوێنی چاپ، ٢٠١٦.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر کاک مەلا هەمزە: ناسراو بە خدر گوڵانی، ٢٠١٦/٣/١٨.

[3] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر تەواوی شیعرەکە. بڕوانە :هەمزە گوڵانی: باخدێرو ئاهەنگی باران، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٣٥٩-٣٦٣.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەمزە حەسەن عەبدوڵڵا، ناسراو بە هەمزە گوڵانی، ٢٠١٦/٣/١٨.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سدیق محەمەدئەمین ئەحمەد: ٢٠١٦/٣/٢٨، ڕانیە، ناوبراو تاقوناغی ناوەندی خوێندووە، لە ساڵی ١٩٨٠ شیعری هەجوو دەنووسێت و جگە لە شیعر نووسین لەبواری شانودا کاری کردووە، پیشەی فەرمانبەرە لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و هونەر.

کێ دەستی خستە گەردەنی
شەپۆلی گەورەی ئەوین؟
کێ هەنگاوەکانی شل بوون
تانەگەینە تیشکی خۆر؟.......

لەگەڵ بوارە شیعرەکەدا، بەشێک لەو کەسانە کاری چیروک نووسینیشیان کردووە، لەوانە (نیاز حەمە عەزیز، خدر گوڵانی، ئەمیر حوسێن، سەردار ڕاوچی، عومەر سەلام، عومەر نورەدینی، عومەر میراودەلی)، بەڵام چیرۆک نووسین لەبەر ئەوەی کەمتر ڕەمزکاری و کاری شاراوەی تیدا دەکرێت، نووسەران بەهۆی دۆخە سیاسیەکەوە کەمتر خۆیان لەم بوارە داوە.[١]

**٢- هونەری شانۆ**

مێژووی شانۆ لە ڕانیە بۆ کۆتایی چلەکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، کە کۆمەڵێک کەس نەخشیان هەبووە لە ڕاپەڕاندنی ئەم کارەدا لەوانە (ڕەشید حەوێز، شێخ تەها ئەحمەد، حەمەی مەجید هاوار، ئەحمەد حاجی پیرۆت، حەمەی قەساب)، حوسنی خانیش وەک یەکەم ئافرەت کاری کردووە لەم بواردا، لەو سەردەمەدا چەند شانۆیەک نمایشکراوە وەک شانۆگەری (بووکی کوردستان، نیشتمان) کە غازی یوسف کاری دەرهێنانی بۆ کردووە.[٢] لە ساڵی (١٩٥٦) شانۆگەریەک دەربارەی ژیانی لادێ و کێشەی نێوان جووتیار و دەرەبەگ لە نوسین و دەرهێنانی مامۆستا سادق مەعروف لە ماڵی برایم ئاغا، نمایش کراوە، کە ئەکتەرەکانی برتیبوون لە: (جەمال ڕەشید، حەمەی مەجید هاوار، برایمی حاجی سورە، عومەر سۆفی عەلی، مامۆستا غازی و مامۆستا وەهاب، سەلاح شەفیق و عەبدوڵا شەفیق)، لە ساڵی (١٩٥٨) هەر لەلایەن ئەو ستافەوە شانۆگەری (قۆنتەراتچی و کوڕە هەژار) لە ڕانیە نمایشکراوە.[٣] دواتر لە ساڵی (١٩٥٩) دا بە بۆنەی یادی نەورۆزەوە لە گۆرەپانی خوێندنگەی ڕانیەی سەرەتایی شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر) نمایشکراوە کە تێیدا میرزا مەنگوڕی ڕۆڵی کاوەی ئاسنگەر و تۆفیقی مەلا سدیق ڕۆڵی زوحاک و فاروقی مەلا فاتیح وەک مێرد منداڵێک ڕۆڵی ئەو لاوەی گێڕاوە کە بۆ زوحاک کراوە بە قوربانی.[٤]

لە ساڵی (١٩٥٩) تیپی نواندنی میللی ڕانیە بۆ بواری شانۆ لە لایەن کۆمەڵێک مامۆستا و کەسانی ئارەزومەند بەم بوارە ڕاگەیەنراوە، کەزیاتر چالاکیەکانیان لە ناو خوێندنگە سەرەتاییەکاندا

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەردار محەمەد عەزیز (ڕاوچی): ٢٠١٦/٣/٢٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٨ ڕانیەیە و تا قۆناغی پەیمانگای خوێندووە، خاوەنی پەرتوکێکە و لە بواری چیرۆک و شیعر کاردەکات.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ خدر کاک مەلا هەمزە (گوڵانی): ٢٠١٦/٣/١٨.؛ شنە ڕانیەیی: مـن و تـۆ، ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق، ژمارە (١١٠) ١٩٨٩/١١/٨، ل٦.

[٢] کاوە بچکۆل: تالێک لە تەزوی بەهێزی بزوتنەوەی شانۆی لە ڕانیە، بەشی یەکەم، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (٦) کانونی یەکەمی ٢٠٠٣، ل١٩.

[٣] دلێر عەبدولخالق: مامۆستا جەمال ڕەشید پیاوێک لە خزمەت، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(١٢) حوزەیرانی٢٠٠٥، ل ٥.

[٤] عەبدولواحید و هێرش: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

بووه، لەماوەی ساڵانی (١٩٦٠-١٩٧٠) کۆمەڵێک کەس ڕۆڵی بەرچاویان دەبێت لە پەرەپێدانی بواری شانۆ لە ڕانیە، کە بریتی بوون لە (م.وسوو حەمەد بەگ، م.جەمال ڕەشید، م.سادق مەعروف، م.وەهاب محەمەد، فاروق مەلا فاتیح، سەلام حەمە سور، نیهاد عەلی بەگ، شێخ تەها ئەحمەد، مەلا برایم لۆکس، حاجی قادر)، هەر لەم ماوەیەدا مامۆستا سادق مەعروف کۆمەڵێک دەقی شانۆیی نوسیوەو نمایشکراوە، لەوانە:(قەل و گوڵە زەرد، هەلاقی لاسار، داستانی سورمەخان، نەخوێندەواری)، نمایشی شانۆ هەر پەیوەست نەبووە بە خوێندنگاکانەوە، هەندێک جار شانۆکان لە دەرەوەی خوێندنگاکانیش ئەنجامدراون، بە تایبەت لە یاریگای تۆپی پێی ڕانیەی نزیک بەنزینخانە، یەکێک لەو شانۆ گرنگانەی کە لە ساڵی (١٩٧٦) لە خوێندنگەی ڕانیەی سەرەتایی نمایشکراوە شانۆگەری (پشە ساسارت قژنە، سبەینەو بەیان جەژنە، جەژن هەر لەتۆیە، سک وەک مەشکەی دۆیە)، کە کۆمەڵێک کەس بەم کارە هەڵساون و ڕۆڵیان تێدا بینیووە (م. وەهاب محەمەد، مەلا برایم، حاجی قادر، حەمەلاو پور ڕەحمە، سدیق محەمەدئەمین).[1] سەرەتای هەشتاکان بەوەچەرخانێکی گرنگ دادەنرێت لە بواری شانۆ لە ڕانیە، لەو ماوەیەدا ژمارەیەک تیپی شانۆیی دروستبوون و چەند کەسێکی بەتوانا لەو بوارە دەرکەوتن، کردنەوەی مەڵبەندی لاوانی ڕانیەو بوونی هۆڵی نمایشکردن لەو مەڵبەندەدا، تەکانێکی گەورەی بەو بوارەداوە، گرنگترین ئەو تیپە شانۆییانەی لەماوەی ساڵانی هەشتاکاندا دروستبوون ئەمانە بوون:

**أ- تیپی شانۆی نواندنی ڕانیە**

دروستبوونی ئەم گروپە بۆ ساڵی (١٩٨٢) دەگەڕێتەوە، کەلە لایەن سیامەند سالح ناسراو بە سیامەند مامە سەرپەرشتیکراوە، کە خوێندکاری بەشی شانۆ بووە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان، بەرگێکی ئەکادیمی بەکارەکانی ئەم گروپەداوە.[2] یەکەم کاری شانۆیان پێشکەشکردنی شانۆیی (دەرمان) بووە لە نوسینی (نیازی حەمە عەزیز) و دەرهێنانی سیامەند مامە، ئەم شانۆگەرییە لە ساڵی (١٩٨٢) بەشداری ڤیستڤاڵی ساڵانەی سەرجەم لاوانی کوردستانی پێکراوە کە لە شاری دهۆک ئەنجامدراوە، بەشداربووەکانی شانۆکە بریتیبون لە (یاسین مەلا عوسمان، ڕەسوڵ نەبی کاکل، خاڵە قوباد، زمناکۆ زرار مراد، حەمەدەمین سەعید تەماتە). لە ساڵی (١٩٨٤) شانۆگەری (زیندانی) وەک یەکەم بەرهەمی بیانی وەرگێڕدراو لەڕانیە نمایشکراوە و لەنووسینی (مولیام ماردۆ) وەرگێڕانی ڕەوف بێگەرد، سیامەند مامە وەک دەرهێنەری ئەم شانۆگەرییە لەگەڵ ئەوەی نووسینێکی ئەدەبی بووە لە هەمان کاتدا پەیامێکی سیاسیش بووە.[3]

---

[1] کاوە بچکۆل: سەرچاوەی پێشوو، ل١٩-٢٠؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سدیق محەمەدئەمین ئەحمەد: ٢٠١٦/٣/٢٨.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ محەمەد ئەحمەد حەمەساڵح: ٢٠١٦/٣/١٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٥ ڕانیەیە و بڕوانامەی دبلۆمی هەیە، یەکێک بووە لە ئەکتەرە چالاکەکانی ئەم تیپە، ئێستا پیشەی فەرمانبەرە.

[3] کاوە بچکۆل: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠.

تیپی نواندن بەردەوام بووە لە کارەکانی، لە (١٩٨٥/٣/١٢) شانۆگەری (چارەنوسی ئادەمیزاد)ی بۆ ماوەی چوار ڕۆژ نمایش کردووە، کە لە نووسینی (شۆلۆخۆف) و وەرگێڕانی د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف و دەرهێنانی سیامەند مامە، بەبەشداری ئەکتەران (نزار سالح، نەژاد دڵزار، کەژاڵ ئیبراهیم، عوسمان ئیبراهیم، محەمەد ئەحمەد حەمەسالح، ئەنوەر حوسێن، کەریم ئیسماعیل، ڕەسول مەولود)، نمایشی ئەم شانۆگەرییە دەنگدانەوەیەکی زۆری ڕۆشنبیری بەدوای خۆیدا هێناوە بەیەکێک لە شاکارەکانی ئەم تیپە دادەنرێت،[١] ئەم تیپە تا ساڵی (١٩٩١) چەندین شانۆی پێشکەش کردووە شانۆی (ڕاوچی) لە ساڵی (١٩٨٥) نووسینی حەیدەرعەبدولرەحمان و دەرهێنانی سیامەند مامە، شانۆگەری (سەمای مەرگ) لە ساڵی (١٩٩١)، نووسین و دەرهینانی سیامەند مامە بووە، لەگەڵ چەندین بەرهەمی تر.[٢]

**ب- تیپی شانۆی مەشخەڵ**

ئەم تیپە لە یەکگرتنی کۆمەڵێک تیپ پێک هاتووە، لەوانە تیپی نواندنی ئامادەیی پیشەسازی ڕانیە و تیپی نواندنی ئامادەیی ڕانیەی کوڕان، لە دوای ساڵی (١٩٨٥) یەکگرتنێک لە نێوان ئەم دوو تیپە ڕویداوە و تیپی نواندنی بیتوێن دروستبووە، تاساڵی (١٩٨٧) بەم شێوە ماوەتەوە و لەهەمان ساڵدا ناوەکەی گۆڕا بۆ تیپی شانۆی مەشخەڵ، کە لەلایەن عومەر حوسێنەوە سەرپەرشتیکراوە.[٣] ئەم تیپە شانۆیانە لەو ماوەیەدا تا ساڵی (١٩٩١) کۆمەڵێک چالاکی گرنگیان ئەنجامداوە، لە ساڵی (١٩٨٥) لە هۆڵی مەڵبەندی لاوان تیپی نواندنی ئامادەیی پیشەسازی ڕانیە شانۆگەری (ئەوکچە مارەیی نەهاتووە) لە نوسینی محەمەد توفیق وەردی و دەرهێنانی بابەکر مستەفا عەزیز و بەشداری ئەکتەران (کەژاڵ عەبدولا و سوعاد ئیسماعیل) بەسەرکەوتوویی نمایشکردووە، کە یەکێک بووە لە کارە جوانەکانی بواری شانۆی ڤیستڤاڵی ساڵانەی خوێندنگاکانی سلێمانی.[٤]

پێشتریش لە ساڵی (١٩٨٥) تیپی نواندنی ئامادەیی پیشەسازی ڕانیە شانۆگەری(تەرازوو)، لە نوسینی ئەمینی میرزا کەریم و دەرهێنانی محەمەدی مەلا ئەسعەد، بەبەشداری(عومەر حوسێن، کاوە ئەحمەد، کەژاڵ ئیبراهیم، دیاری حەمەدەمین) نمایشکردووە.[٥] لەگەڵ دامەزراندنی تیپی مەشخەڵ کۆمەڵێک گەنج چوونە ناو تیپەکە، لەوانە: (مەولود ڕەسوڵ، مستەفا ئەحمەد سەعید، شوان سەمەد،

---

[١] سەرکەوت: چالاکی شانۆی لە قەلادزێ و ڕانیە وچوارقورنە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ(٧٨٩) لە ١٩٨٥/٥/١٦، ل١٠-١١؛ لە ڕانیەوە چارەنوسی ئادەمیزاد: ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٧٧٤)، ١٩٨٥/١/٣١، ل١١-١٢.

[٢] کاوە بچکۆل: تاڵێک لە تەزوی بەهێزی بزوتنەوەی شانۆی لە ڕانیە، بەشی دووەم، ل٢٠.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر حوسێن حوسێن: ٢٠١٦/٣/١٩ ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٧ ڕانیەیەو دەرچووی پەیمانگایە و لەماوەی هەشتاکاندا یەکێک بووە لە کەسە چالاکەکانی بواری شانۆ لە ڕانیە، ئێستا پیشەی فەرمانبەرەو لە بەڕێوبەرایەتی ڕێگاوبانی ڕانیە دەوام دەکات.

[٤] عەلی خەزنەدار: ئافرەتە ناودارەکانی کورد هێزێکی بەتوانا لە بەرگری کردن لە نیشتمانەکەیان، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٢١٨.

[٥] نیازی: شانۆیی تەرازو لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٨٢٠)، ١٩٨٥/١٢/٢٦، ل١٢.

عەلی حەمە شەریف، عومەر ئەکرەم، خدر ئیبراهیم، سەلاح محەمەد)، هەر لەم ماوەیەدا چەند چالاکیەکیان ئەنجامداوە، لە ساڵی (١٩٨٧)دا شانۆگەری (موسیبەتی تالە وخولە)، نوسینی کەمال رەوف و دەرهێنانی عومەرحوسێن، لە ساڵی (١٩٨٨)دا شانۆگەری (دکتۆر یان فەڕاش)، نوسین و دەرهێنانی عومەر حوسێن، ، لە ساڵی (١٩٨٨)دا شانۆگەری (چۆلەکەکان) لە نووسین و دەرهێنانی ئەنوەر شێخانی، بە هاوکاری تیپی مەشخەل بە بەشداری (کاوە ئەحمەد، تەلال جەمال، هیران جەمال، خدر ئیبراهیم).(١) یەکێک لە ئەنجامدانی کارە باشەکانی ئەم تیپە شانۆنامەی (نەفرەت لێکراوەکان) بووە لە نوسینی تەڵعەت سامان و دەرهێنانی شانۆکار عومەر حوسێن، کە لە رۆژی (١٩٨٩/٤/٥) لە هوڵی مەڵبەندی لاوانی ڕانیە نمایشکردووە، بە بەشداری چەند هونەرمەندێک لەوانە (مستەفا ئەحمەد وەک نەفرەت لێکراو، مەجید قادر وەک یاریدەدەری نەفرەت لێکراو، مەولود ڕەسول خواوەندی هۆش، ڕزگار عەبدوڵا خواوەندی سۆز، وەستا خدر وەک پەیکەرتاش، قادر عەبدوڵا و تەها بەکر و ئیبراهیم سۆفی وەک کۆرس، نەرمین قادر، مەولود ڕەسول، عومەر ئەکرەم)، ئەنجامدانی ئەم شانۆگەریە بەکارێکی گرنگ و تازە دادەنرێت لە مێژووی شانۆ لە شاری ڕانیەدا.(٢)

**ج- تیپی شانۆی هیوا**

ئەم تیپە لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٤) دا لە ڕانیە دامەزراوە، لە ساڵی (١٩٨٥) دوو بەرهەمی شانۆیی پێشکەشکردووە، شانۆگەری (میوانداری کورد) لە نووسینی عەلی عەباس، (تاوانێک لە فەڵەستین) نوسینی لەتیف هەڵمەت، ئەم دوو بەرهەمە لە لایەن ئەحمەد حوسێن حەمەد کاری دەرهێنانی بۆ کراوە، کۆمەڵێک کەس وەک ئەکتەر ڕۆڵیان تێدا بینیوە لەوانە(ئەحمەد حوسێن حەمەد، سلێمان محەمەد سدیق، سالار کاکەمین، ئازاد فەقێ قادر، ئەحمەد حوسێن حوسێن، ڕزگارمەحمود، نێچیروان محەمەد، مستەفا ئیسماعیل عەزیز، سیروان غەریب، بەیان غەریب، عومەر محەمەد، خەدیجە حەوێز، کارزان جەمال، گیڤارا جەمال، سزا مەحمود قاد)، ئەم تیپە تەنها دوو چالاکی هەبووە، دواتر کارەکانیان وەستاوە.(٣)

**د- تیپی شانۆی ئاسۆس-ڕۆشنبیر**

ئەم تیپە لە (١٩٨٤/١٢/٢٨) دا لە ڕانیە دامەزراوە، سەرەتای کارەکانی لە خوێندنگەکانەوە دەستپێکردووە و دواتر چالاکیەکانی گواستۆتەوە بۆ هۆڵی مەڵبەندی لاوانی ڕانیە، سەرەتا لە لایەن خدرنەواو و نەوزاد مەجید سەرپەرشتیکراوە، دواتر ئەمیر حوسێن بۆتە سەرپەرشتیاری تیپەکە، ئەم

---

(١) چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر حوسێن حوسێن، ٢٠١٦/٣/١٩.

(٢) محەمەدی مەلا ئەسعەد: تیپی شانۆی مەشخەڵ و شانۆنامەی نەفرەت لێکراوەکان لە ڕانیە، ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق، ژمارە(٨٦)، ١٩٨٩/٥/٣، ل٥. بۆ زانیاری زیاتر لە سەر شێواز و تەکنیکی بەکارهاتوو و ناوی ئەکتەرەکان. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٨).

(٣) ئازاد: تیپی شانۆی هیوا لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٨٧٤، ١٩٨٥/٤/١١، ل١٢.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد حوسێن حەمەد، ناسراو بە ئەحمەد خەزاڵ، ٢٠١٦/٥/١٣، ڕانیە، ناوبراو خۆی سەرپەرشتی ئەم تیپە شانۆیەی کردووە.

تیپە لە یەکەم کاریاندا کاریکاتێریک بەناوی (دکتۆرە) پێشکەش بە جەماوەر دەکەن، دواتریش وەک یەکەم کاری شانۆیی، لە ساڵی (١٩٨٤)دا شانۆگەری (بووکی بەفر) لە نووسینی مەهدی ئومێد و دەرهێنانی بەکر مستەفا، نمایش دەکەن،[١] لە دووەم کاریاندا لە (١٩٨٥/١١/٢٨) دا شانۆگەری (بۆیاخچی) لە نووسینی ئەمینی میرزا کەریم و دەرهێنانی ئەحمەد خدر ئیبراهیم ئەنجامدەدەن، لە هەمان ساڵدا بە شانۆگەری (بۆیاخچی) بەشداری ڤیستڤاڵی شانۆیی پارێزگای سلێمانی دەکەن.[٢] لە درێژەی کارەکانیاندا لە ساڵی (١٩٨٩) دا شانۆگەری (سەرچاوەی ژیانێکی خامۆش) لە نووسینی ئەمینی میرزا کەریم و دەرهێنانی بەکر مەحمود لە هۆڵی مەڵبەندی لاوان نمایش دەکەن و بەسەرکەوتوویی کارەکەیان ئەنجام دەدەن.[٣] لە ساڵی (١٩٨٩) ناوی تیپەکە لە ئاسۆسەوە دەگۆڕن بۆ ڕۆشنبیر و لە (١٩٨٩/١١/٢٠) شانۆگەری (شێتەکانی ئەم ڕۆژگارە)، لە نووسینی دیمتری باساناس وەرگێڕانی ئازاد حەمە شەریف و دەرهێنانی هەژار محەمەد ڕەسوڵ لە هۆڵی مەڵبەند لاوان نمایش دەکەن، کە یەکێک بووە لە کارە گرنگ و سەرکەوتووەکانی ئەم تیپە، ئەم شانۆگەرییە جارێکی تر لەلایەن مامۆستا حەمەعەزیز بەکرەجۆییەوە دەرهێنانێکی تازەی بۆ دەکرێت و لە ساڵی (١٩٩٠) لەپێشبڕکی ڤیستڤاڵی سالانەی مەڵبەندەکانی لاوانی پارێزگای سلێمانیدا بەشداری پێدەکرێت، لە پێشبڕکێکەدا پلەی یەکەم بەدەست دەهێنێت و کاوە عەبدوڵا ئەحمەد و تەلار جەمال هیرانی، وەک باشترین ئەکتەری کوڕ و کچی ئەم ڤیستڤاڵە دیاری دەکرێن.[٤]

لەماوەی دامەزراندنی ئەم تیپە شانۆییە تا ساڵی (١٩٩١) کۆمەڵێک ئەکتەر ڕۆڵیان تێیدا بینیوە، لەوانە (ئەمیر حوسێن، تەلار جەمال هیرانی، فریاد ڕەحمان، کاوە عەبدوڵا، سەردار ڕاواچی، نەوزاد حەمە مەجید، ئەکرەم خدر حەمەلان، بەکر مەحمود، مهاباد قادر، شنۆ قادر، گوڵاڵە مەرگەیی، عومەرسەلام، هەژار مەرگەیی، نەوزاد حەمە مەجید). جگە لەو شانۆگەریەی ئاماژەی پێکرا ئەم تیپە لەم ماوەیەدا کۆمەڵێک کاری نمایشی شانۆیان کردووە لە ڕانیەدا، وەک: شانۆگەری (لە شێتخانەیەک دا)، نووسین و دەرهێنانی فریاد ڕەحمان لە ساڵی (١٩٨٤) دا شانۆگەری (ئەوپیاوەی بوو بەسەگ)، ئۆزڤاڵدۆ داراگۆن، وەرگێڕانی ئازاد حەمە شەریف و دەرهێنانی کەمال ئالانی. لە ساڵی (١٩٨٨) دا شانۆگەری (نالی و خەونێکی ئەرخەوانی)، نوسینی ئەحمەد سالار، دەرهێنانی ئەمیر حوسێن، ساڵی

---

[١] ئازاد: تیپی شانۆی ئاسۆس لە مەڵبەندی لاوانی ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە(٨٧٠)، ١٩٨٦/١٢/١٨، ل٢.؛ نیازی: تیپی شانۆی لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٧٨٠)، ١٩٨٥/٣/١٤، ل ١٦.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فریاد ڕەحمان مەولود: ٢٠١٦/٣/١٩، ڕانیە، لە دایک بووی ١٩٦٧ ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگایە و یەکیک بووە لە ئەکتەرەکانی تیپی ئاسۆس و ڕۆشنبیر، لە ساڵی ١٩٩١ ەوە تا ئێستا لێپرسراوی ناوەندی هونەری هەنگاوە لە ڕانیە.

[٢] نیازی: شانۆییەک لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە(٨١٩)، ١٩٨٥/١٢/١٩، ل١٢.

[٣] ئازاد: تیپی شانۆی ئاسۆس، ل٢.

[٤] کاوە بچکۆل: تاڵێک لە تەزوی بەهێزی بزوتنەوەی شانۆی لە ڕانیە، بەشی دووەم، ل١٩.

(١٩٨٩)دا، شانۆگەری (ڕاوچی)، لە نوسینی ئەمین میرزا کەریم، دەرهێنانی سیامەند مامە، بە هاوکاری تیپی نواندنی ڕانیە، لە ڕانیە نمایشکراوە لە ساڵی (١٩٩١) دا.[١]

**٣- هونەری میوزیک**

لە ساڵانی پەنجاو شەستەکانی سەدەی بیستەم جوڵانەوەیەکی لاواز هەبووە، ئامێری شمشاڵ و هەندێک ئامێری تری کلاسیک بە شێوەی تاکە کەسی بەکارهاتووە، بەڵام بە شێوەیەکی ڕێکخراو مێژووی میوزیک لە ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٧٠) دەگەڕێتەوە، کاتێک یەکەمین گرووپی میوزیک بە ناوی (تیپی میوزیکی قەندیل) لە لایەن (سەعدوڵڵا مەلا محەمەد، فاروق مەلا فاتح، چالاکی حاجی ڕەفیق، سەرهەنگ میرزا، چاپوکی حاجی ڕەفیق)، دادەمەزرێت، کەسایەتیەکی ناوچەکەش بەناوی جەلالی خورشیدە فەندی ئامێریکی کەمان وەک یەکەم ئامێری میوزیک دەهێنێت بۆ ناوچەکە، ئەم گروپە دواتر ناوەکەی دەگۆڕێت بو تیپی کێوەڕەش لە ساڵی (١٩٧٤) بە هۆی تێکچوونی دۆخی سیاسی ناوچەکە چالاکیەکانیان ڕادەوەستێت و لە ساڵی (١٩٧٦) دووبارە دەست بە چالاکی دەکەنەوە، مامۆستا سەعدولا محەمەد دەبێتە سەرپەرشتیار، پێکهاتەی تیپەکە بریتی دەبێت لە (فاروق فاتح- شمشاڵ ژەن، سەرهەنگ میرزا و چالاکی حاجی ڕەفیق- کەمان ژەن، قوبادی مام ڕەشید بەئامێری تەپڵ)، شەوانە لە یانەی فەرمانبەرانی ڕانیە کارەکانیان ئەنجام داوە.[٢]

لە ساڵی (١٩٧٧) لە کاتی ئاهەنگ گێڕانێکدا بە ئامادە بوونی تیپی میوزیکی کێوەڕەش، سرودی ئەی ڕەقیب پێشکەشدەکەن، کاتیک دەزگای ئەمن بەم کارە دەزانێت وەک سزا دانێک بۆ ئەم کارە چالاکیەکانی ئەم گروپە دەوەستێنن.[٣] لە ساڵی (١٩٧٨) بۆ یەکەم جار لە مێژووی شارەکە خولێکی فێربوونی میوزیک لە لایەن مامۆستا سەعدولا محەمەد دەکرێتەوە، کە چەندین خوێندکار لە بەشداریکردنی خولەکە سوودمەند دەبن.[٤] لە ساڵی (١٩٧٩) جارێکی تر تیپەکە بەدەستەیەکی تازەوە دادەمەزرێتەوە، کە پێکهاتبوو لە (محەمەد حەوێز- عود ژەن، چالاک ڕەفیق- کەمانچە ژەن، پشتیوان ڕەفیق- کەمانچە ژەن، چاپوک ڕەفیق- عود ژەن، فریاد ڕەشید- تەپڵ ژەن، قوباد ڕەشید- ئیقاع، سەلاح پشدەری-گۆرانی بێژ و تەپڵ ژەن)، ئەم گروپە لە ساڵی(١٩٨٠) بەهۆی تێکچوونی دۆخی سیاسی و جەنگی عیراق و ئێران کارەکانیان وەستا و چالاکییەکانیان نەما.[٥] دواتر بەکردنەوەی مەڵبەندی لاوانی ڕانیە و کردنەوەی چەند پەیمانگایەکی هونەرە جوانەکان، لە سەرەتای هەشتاکان، لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی عیراق، بزووتنەوەی هونەری میوزیک لە ڕانیە چەند کەسێکی لێهاتووی لە

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فریاد رەحمان مەولود: ٢٠١٦/٣/١٩.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ فاروق فاتح عەبدولحەمید عەسکەری: ٢٠١٦/٣/٢٦؛ عەبدولواحید و هێرش: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[٣] سەرکەوت بورهان: هونەری میوزیک لە لاپەڕەکانی مێژووی ڕانیەدا، قۆناغی دووەم، گۆڤاری ڕانیە، ژ (٦) کانونی یەکەمی٢٠٠٣، ل٢٧.

[٤] هیوا مستەفا: کورتە مێژوویەکی مۆسیقا لە ڕانیە، گۆڤاری مێرگ، ژمارە (٦٧) کانونی یەکەمی ٢٠١٠، ل٧٩.

[٥] سەرکەوت بورهان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

بواری میوزیک تێدا دەردەکەوێت، وەک (هیوا مستەفا، محەمەد ئەمین، سلێمان حەسەن، زمناکۆ زرار، ڕزگار حەمە عەلی، محەمەد ڕەشید، محەمەد حاجی ڕەفیق)،[1] لە ساڵی (١٩٨٣) جارێکی تر تیپی مۆسیقای کێوەڕەش لە لایەن هیوا مستەفا دادەمەزرێتەوە، سەرەتا ژمارەی ئەندامەکانی (١٥) کەس دەبێت، دواتر لەماوەیەکی کەمدا ژمارەی ئەندامەکانی دەگات بە (٣٠) کەس، لەساڵی (١٩٨٤) ئەندامانی تیپەکە بریتیبووە لە (هیوا مستەفا-سەرۆکی تیپ- کەمانچە، حەمەدەمین- کیبۆرد، سلێمان حەسەن- کیبۆردن زمناکۆ زرار- کلارنێت، عەبدوڵا کاڕەسوڵ- ترامپێت، بەکرخالید- چەلۆ، خالید حوسێن- ئۆکۆردیۆن، ئیدریس وەلی- کەمانچە، بەکر هۆمەر- کەمانچە، مستەفا حەمەعەلی- کەمانچە، کەمال ئالانی- کەمانچە، محەمەدسدیق- کەمانچە، قادر محەمەد-کەمانچە، محەمەد حەوێز، عود، محەمەد ڕەشید- ساز و درامس، قوباد ڕەشید- ریتم، بەکر حەمەدەمین-دەف، سەلام حدر- ڤینگۆز) لەگەڵ کۆمەڵێک گۆرانیبێژ (دڵشاد مەلا ئەحمەد، سەلاح پشدەری، کەریم عەزیز هەولێری، ئیبراهیم تاقانە، سۆلاف وەهاب، گوڵاڵە جەمال، تاراجەمال هیرانی، خدر پشدەری).[2]

لەماوەی ساڵانی (١٩٨٢-١٩٨٥) لەلایەن هیوا مستەفا کە خوێندکاری میوزیکی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی موسڵ دەبێت، هاوینان چەندین خولی فێربوونی میوزیک لە ڕانیە دەکاتەوە، کردنەوەی ئەم خولانە کاریگەری زۆری لەسەر گەشەپێدانی بواری میوزیک دەبێت و چەندین فێرخواز ئاشنا دەبن بە بواری میوزیک لە ناوچەکەدا، هەر لەم ماوەیەدا هەموو ساڵێک لە یادی ڕۆژی میوزیک لە جیهاندا ئاهەنگ و پێشکەشکردنی بەرهەم و چالاکی جۆربەجۆر ئەنجامدەدرێت، ئامادەبووان ئاشنا دەکرێن بە بەرهەماکانی لاکومپارسیتای مێجەری گەورە و کازاچۆک و سەمفونیای موزات، جگە لەم کارانە تیپی میوزیکی کێوەڕەش بەشداری چەندین ئاهەنگ و فیستیڤالی میوزیکی دەکات لە شارەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک، لە ساڵی (١٩٨٤) لە شاری دهۆک لە پێنج پلەی هەڵسەنگاندن خەڵات وەردەگرێت.[3]

لە ساڵی (١٩٨٤) تیپی میوزیکی کێوەڕەش لەکارێکی هونەریدا چوار بەرهەم بۆ بەرنامەی کۆلکەزێڕینەی تەلەفزیونی کەرکوک تۆماردەکەن و دواتر لە هەمان تەلەفزیون بڵاودەکرێتەوە،[4] هەر لەم ماوەیەدا گروپێکی تری میوزیک لە ڕانیە بە سەرپەرشتی چالاک ڕەفیق دادەمەزرێت بە ناوی تیپی میوزیکی قەندیل، کە ژمارەی ئەندامەکانی (١٠) ژەنیار دەبێت و کۆمەڵێک کارو چالاکی لە ڕانیە ئەنجامدەدەن، لە ساڵی (١٩٨٦) تیپی میوزیکی کێوەڕەش ناوەکەی دەگۆڕێت بو تیپی میوزیکی ڕانیە و لە هەمان ساڵدا هاوشێوەی شارەکانی سلێمانی و دهۆک و هەولێر بەشداری ڤیستڤاڵی شارەکان

---

[1] شۆڕش قەرەداغی: ڕانیە لە دوێنێوە بۆ ئەمڕۆ، ڕۆژنامەی ئالای ئازادی، ژ (٤٤٥)، ٢٠٠١/١٢/٢٤، ل٧.

[2] هیوا مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩.

[3] ئاهەنگێک لە ڕانیە: ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٧٥٦)، ١٩٨٤/١٠/٤، ل ٨؛ نیازی حەمە عەزیز: چالاکی مۆسیقا لەڕانیە، ڕۆژنانەی هاوکاری، ژ ٨٠٨، ١٩٨٥/١٠/٣/ ل١٢.؛ بەختیار مامە: ڕۆژی مۆسیقای جیهانی لە ڕانیە و قەلادزێ، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ (٨٦٧)، ١٩٨٦/١١/٢٧، ل٩.

[4] سەرکەوت بورهان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨.

دەکات و چەند بەرهەمێکی میوزیکی پێشکەشدەکات، لە ساڵی (١٩٨٧) تیپی میوزیکی ڕانیە دوو بەرهەمی میوزیک و گۆرانی بۆ تەلەفزیونی موسڵ تۆمار دەکات گۆرانی (یاری دوورکەوتوو) ئاوازی فولکلۆر، دابەشکردنی هیوا مستەفا، وتنی محەمەد ڕەشید. گورانی (خۆشەویستەکەم) ئاوازی سەعدوڵلا محەمەد، دابەشکردنی هیوا مستەفا، وتنی عومەر ئەحمەد. لە سەرەتا دا سێ بەرهەم دەبێت، بەڵام دانەیەکیان ڕتدەکرێتەوە.[١] لە ساڵی (١٩٨٧- ١٩٨٨) لە مەڵبەندی لاوانی ڕانیە لەلایەن فازل مەجید بەرێوەبەری ئەو مەڵبەندە و بەهاوکاری حەسەن حەمەدەمین سەرسیانی و هەژار محەمەد ڕەسوڵ و کۆمەڵێک کەسی تر، ستودیۆیەک لە مەڵبەندەکە دروست دەکرێت، کە جگە لە خەڵکی ناوچەکە، کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش سوودیان لێ بینیوە.[٢]

لە ساڵی (١٩٨٨) لە ئەنجامی کردنەوەی خولێکی فیربوونی میوزیک بۆ منداڵان لە لایەن هیوا مستەفاوە، دوای تەواو بوونی خولەکە تیپی میوزیکی زۆزگ بەسەرپەرشتی هیوا مستەفا لە ڕانیە دادەمەزرێ، ڕێکخستنی گروپەکە بریتی دەبێت لە(ئاریان ئیسماعیل- کەمانچە، بەهزاد ڕەسوڵ- کەمانچە، خالید محەمەد- کەمانچە، نەهرۆ سەردار فلوت، کامەران ئەنوەر- کلارنێت، ئومێد حەمە- گیتار سۆل، بێستون محەمەد- سەنتور، ئاری حەمەدەمین-کیبۆرد، هۆگرخدر- ئۆکۆردیۆن، ئامانج سلێمان- ئیقاع، حاتەم محەمەد- درامس، نەوزاد عەلی- گورانیبێژ، ئیسماعیل ئەحمەد- گۆرانی بێژ)، دواتر ئەم تیپە لە (١٩٨٩/٣/٨) لە شاری دهۆک بەشداری ڤیستڤاڵی لاوان دەکات، لە کۆی یانزە تیپی بەشدار بووی ڤیستڤاڵەکە پلەی دووەم بەدەست دەهێنن.[٣] هونەری میوزیک لە ڕانیە وەک هەر بواریکی تری هونەری بەدەر نەبووە لەو کێشەو گرفتانەی کە لەو سەردەمەدا هەبوو، نەبوونی ئامێری میوزیکی و هۆڵی گونجاو و بوارەکانی ستودیۆ، لاوازی دۆخی ئابووری و نەبوونی هۆشیارییەکی دروست بەرامبەر میوزیک، ڕێگربوون لە بەردەم ئەم بوارەدا، ئەمە جگە لە دەستوەردانی سیاسی و ترس و دڵەڕاوکێ و دۆخی جەنگ لە ناوچەکە کە نەیتوانیوە کەشێکی ئارام فەراهەمبکات.

**٤- هونەری وێنەکێشان و بوارەکانی تر**

هونەری خۆشنووسی و وێنەکێشان لە ڕانیە، بە بەراورد بە هونەرەکانی تر کەمتر بووە، یەکەم کەس لە ڕانیە، کە گرنگی بەم بوارە دابێت کەسێک بووە بەناوی عەبدولکەریم میرزا محەمەد، کە لە قوتابخانەوە پەرەی بە توانای کەسی خۆی داوە و کاری لە بواری خۆشنووسیدا کردووە، لە ساڵی (١٩٦٨) دا یەکەم نووسینگەی خۆشنوسی لە ڕانیە کردۆتەوە، بەڵام کارەکانی ئەو تایبەتی بووە، زیاتر بۆ بواری سەرچاوەی بژێوی ژیانی بەکاری هێناوە و نەچۆتە ناو پێشبڕکێی هونەر و پەرەپێدانی ئەم

---

[١] هیوا مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٢-٨٣.

[٢] سەرکەوت بورهان: هونەری میوزیک لە لاپەڕەکانی مێژووی ڕانیەدا، قۆناغی سێیەم، گۆڤاری ڕانیە، ژ (٧) ئازاری ٢٠٠٤، ل١٦.

[٣] هیوا مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣.

کـاره.[1] لـە سـاڵی (١٩٧٠) دا کـاری وێنەکێشـان و خۆشنووسـی لـە ڕانیـە لـە ڕێگـەی پێشـانگای خوێندنگاکانەوە هێواش هێواش گەشەی کردووە، بە بەکارهێنانی قەڵـەم ڕەساس و بۆیـەی نەوتییـەوە وێنـە کێشـراوە و گرنگـی بـەو بـوارە دراوە، دواتـر لەگـەڵ کردنـەوەی مەڵبەنـدی لاوانـی ڕانیـە و لـە هەشـتاکانی سـەدەی بیسـتدا، چەنـد کەسـێک لـە بـواری وینەکیشانیشـدا دەرکـەوتوون، وەک (خـەبات عەبدوڵڵا، فەقێ ئیسماعیل، ڕۆژگـار مـەلا ڕەسـوڵ، بیتوێن سـەعید، ئەحمـەد فـەرەج، ئەحمـەد سەرسـام، حەمیـد مـەلا زادە، ئیسـماعیل سـەلام)، کـە بەشـێکی زۆریـان لـە مەڵبەنـدی لاوان کاریـان کردووە.[2]

هونەری وێنەکێشانیش وەک زۆرێک لە بوارە هونەریەکانی ئەوکات بەدوور نـەبووە لـە فشـار و کێشـەی سیاسی، لە ساڵی (١٩٨٤) دەزگای ئەمن لە ڕانیە دەچێتە سەر کتێبخانـەی گشـتی ڕانیـە و (١٦) تـابلۆی هونەرمەنـد (بیتـوێن عـەلی سـەعید) دەشـکێنێت، بـە بیـانوی ئـەوەی وێنـەی مامۆسـتا هێمنـی شاعیری ڕۆژهەلاتی کوردستانی لێهەڵواسراوە، گوایە کەسێکی ئێرانیە و دوژمنـی حکومـەتی عیراقـە.[3] لـە مـاوەی هەشـتاکاندا چـەنـدین پیشـانگاو کـارو چـالاکی جۆربـەجۆر لـە ڕانیـە سـازکراوە، لـە (١٩٨٦/١١/٣٠) لـە هـۆڵی مەڵبەنـدی لاوانـی ڕانیـە، لـە پێشـانگایەکی تایبەتـدا (٢٨) تـابلۆی هەڵکەنـدن و هێڵکاری هونەرمەنـد پیـرس ئەحمـەد، نمایشـکراوە بـۆ مـاوەی پێـنج ڕۆژ بـەردەوام بـووە، تابلۆکـان بـە شێوەی ئەکادیمی و لەسەر ڕێبازی ڕیالیستی بە دەربڕینێکی فۆلکلۆرییانە دروستکراون.[4]

لە (١٩٨٩/٢/٢٧) لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی ڕانیە، لە پێشانگایەکی فۆتۆگرافی تایبەتدا (٣٤) وێنـەی فۆتـۆگرافی هونەرمەنـد (ئەبوبـەکر ئیبـراهیم بێتواتـەیی) نمایشـکراوە، کـە وێنـەکان تایبـەت بـوون بـە دەرخستنی ژیان و کەلەپوری کوردەواری،[5] بۆجارێکی تـر لـە مـانگی پێنجـی هـەمان سـاڵدا، لـە هـۆڵی کتێبخانەی گشتی ڕانیە، بە ئامادە بوونی جەماوەری ئارەزوومەندانی ئەم بوارە، پێشانگایەکی شـیعر و وێنەی فۆتۆگرافی بۆ هونەرمەند (حەسیب مەحمود) سازکراوە، کە وێنەکانی هونەرمەنـد تایبـەت بـوون بـە دەرخسـتنی جوانی سروشـتی کوردسـتان.[6] لـە درێژەی کارو چالاکیـەکان و گرنگیدان بـە بـواری هونەری خۆشنووسی و وێنەکێشان و بوارەکانی تر، لە (١٩٩٠/٤/١٧) لە هـۆڵی مەڵبەنـدی لاوانـی ڕانیـە بە ئامادەبوونی جێنشینی ڕانیە و جەماوەرێکی زۆر لە هونەردۆستان، لە پێشـانگایەکی هاوبەشـدا (٣٨) تابڵوی جۆربەجۆری هونەرمەندان خەبات عەزیز و حەمید عەبدوڵا و ڕەحمـان خۆشـنوس و ئەحمـەد

[1] کەریمی خەتات: گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (٩) ئەیلولی ٢٠٠٤، ل٤٧.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، کاکەمین مام ڕەسوڵ کاکەمین: ٢٠١٦/٣/٢٩.

[3] بیتوێن عەلی سەعید: یادەوەریەک لە کتێبخانەی گشتی ڕانیە ساڵی ١٩٨٤، گۆڤاری ڕانیە، ژ (٧) ئازاری ٢٠٠٤، ل٤٣.

[4] دووەم پێشانگای تایبەتی هونەرمەند پیرس ئەحمەد لە ڕانیە: ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٨٦٩)، ١٩٨٦/١٢/١١، ل١٢.

[5] پێشانگایەکی فۆتۆگرافی لە ڕانیە: ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە(١٠٥٧)، ١٩٨٩/٣/٩، ل١٢.

[6] پێشانگایەک لە ڕانیە: ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق، ژمارە(٨٦)، ١٩٨٩/٥/١٧، ل٤.

حوسێن ناسراو بە ئەحمەد سەرسام نمایشکراوە، کە وێنەکان ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤ بوون، لەلایەن هونەرمەندانەوە لێکدانەوەی وێنەکان بۆ ئامادەبوان کراوە.[1]

### دووەم/ چالاکییە وەرزشیەکان

#### ١- تۆپی پێ

مێژووی تۆپی پێ لەڕانیە بۆ دوای ساڵی (١٩٥٠) دەگەڕێتەوە، لە ڕێگەی کۆمەڵێک کەسەوە کە سەردانی شارەکانی تریان کردووە ئەم یاریەیان بینیوە، دواتر تۆپیان هێناوە بۆ ڕانیە، سەرەتا بە شێوەی تاک گۆڵ یاریان کردووە، ژمارەیەکی کەم گرنگیان بەم وەرزشەداوە.[2] لە کۆتایی پەنجاکاندا مامۆستایەک بەناوی وەهاب حەویز کۆیی دێت بۆ ڕانیە و لە خوێندنگەی ڕانیەی سەرەتایی وانە دەڵێتەوە، ئەم مامۆستایە زۆر ئارەزووی لە وەرزشی تۆپی پێ دەبێت، بەردەوام خوێندکارەکان هاندەدات و ئاشنایان دەکات بەم وەرزشە، لەم ماوەیەدا دوو تیپی تۆپی پێ لە ڕانیە دروستدەبێت، لەوانە تیپی وەرزشی گەنجانی شیوعی کە بە کرێکاران بەناوبانگ بووە، ئەم تیپە لەچەند کەسێک پێکهاتووە لەوانە(ئەنوەری خاڵەحەمە، محەمەد سۆفی، عەبدولڕەزاق عەبدولرەحمان، مراد فەقێ محەمەد، کەریم میرزا، ئەسوەد میرزا، دڵشاد میرزا، هتد)، لەگەڵ تیپی لاوانی پارتی دیموکرات، کە یاریزانەکانی سەر بە پارتی بوون، ئەم تیپەش لە کۆمەڵێک کەس پێکهاتووە(عەزیز سدیق بەگ، ئازاد حوسێن تاهیر، عوسمان حوسێن تاهیر، فریاد حەمە سەعید، سالح سۆفی عەبدوڵا، وەستا ڕەمەزان، جەلال سدیق، هتد) ئەم دوو تیپە بەردەوام لە ڕکابەریدا بوون، زۆرجار لە ئەنجامی توندی ململانێی نێوانیان، توندوتیژی و شەڕوئاژەوە دروستبووە، لەگەڵ ئەوەی ئەوکاتە کەلوپەلی وەرزشی زۆر لاوازبووە، تۆپی یاریکردن چەرم بووە، پێڵا و لاستیک و کەتان بووە و تاکە یاریگایەکی ناڕێکخراو لە گەڕەکی قولە لە شارەکەدا هەبووە، بەلام چەندین یاری گرنگیان لەگەڵ تیپی تۆپی پێی شارەکانی وەک قەڵادزێ و هەڵەبجە و کۆیە بە ئەنجام گەیاندووە، ئەم دۆخە تا ساڵی (١٩٦١) بەردەوام بووە، بەلام دواتر بەهۆی تێکچوونی دۆخی سیاسی ئەم وەرزشە بۆ ماوەیەک وەستاوە.[3]

لە سالانی (١٩٦١-١٩٦٢) قۆناغێکی تر لە وەرزشی تۆپی پێ لە ڕانیە هاتۆتەئاراوە، مامۆستایەکی بەنەژاد عەرەب بەناوی محەمەد شاکر دەچێت بۆ ڕانیە، لە خوێندنگەی ڕانیەی سەرەتایی دەبێتە وانەبێژ، ئەم مامۆستایە لە یەکەم کاریدا تیپێکی تۆپی پێ لە کۆمەڵێک گەنج و خوێندکار لە ڕانیە دروستدەکات و دەبێت بە ڕاهێنەر، گرنگترین یاریزانەکانی ئەم تیپە بریتی دەبن لە (مەولود حەمەزلە، حەسەن حەمەزلە،م. تاریق عەرەب، فواد میرزا، فریاد سەعید، ئیبراهیم سالح بەگ،

---

[1] خدر گولانی: چوار هونەرمەند و پیشانگایەک لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (١١٧٧)، ١٩٩٠/٥/١٤، ل٩.

[2] هەمزە سەرحان: یانەی وەرزشی ڕانیە چۆن دروست بوو، گۆڤاری ئاراس، ژمارە (٣٦)، کانوونی دووەمی ٢٠٠٧، ل٢٤.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەژار سالح حەمە(مامە): ٢٠١٦/٥/١٧، لە ڕانیە، ١٩٦٠-١٩٧٢ وەرزشوانی تۆپی پێ و بالە بووە.

سەردار حاجی محەمەد، هەژار مامە، ئازاد ڕەشید، محەمەد حەمە عەزیز، سابیر مەمەند، فەرەج حوسێن)، لەم ماوەیەدا چەندین چالاکی جۆربەجۆر ئەنجامدەدرێت، ئەم بوژانەوە وەرزشییە درێژەی دەبێت لە ساڵی (١٩٦٤) بەهاتنی دوو مامۆستای وەرزش دۆست بە ناوی مستەفا هەورامی و مامۆستا کەمال، هێندەی تر وەرزش پەرەدەستێنێ.[١] لە ساڵی (١٩٦٥) بۆ یەکەم جار مامۆستایەکی وەرزشی بە ناوی قادر کەریم ئەحمەد ناسراو بە (قادرە ڕەش) دێت بۆ ڕانیە و دەبێت بە مامۆستای وەرزش لەشارەکە، ئەم مامۆستایە ئاماژە بەوەدەکات کە یەکەم جار هاتووە بۆ ڕانیە لە خوێندنگە بە خوێندکارەکانی ووتوە (شۆرتی یاری لە پێ بکەن وتوویانە مامۆستا لە پێ کردنی دەرپێ قوڵە عەیبە)، هۆشیاری وەرزشی ئەوەندە دواکەوتوو بووە،[٢] مامۆستا قادر بۆ تێکشکاندی ئەم جۆرە بیرکردنەوەو ئاشناکردنی خەڵک بە وەرزش هەندێک جار خوێندکارانی خوێندنگەکەی بە جل و بەرگی وەرزشیەوە بردووە بۆ ناو بازاڕی ڕانیە و بە ڕاکردنی یاسای وتنەوەی ووشەی وەرزش و پیتەکانی (و،ە،ر،ز،ش) سەرنجی جەماوەری بەلای وەرزش و گرنگی ئەم بوارە ڕاکێشاوە.[٣]

لە ساڵی (١٩٦٧) تیپی وەرزشی قەندیل لە ڕانیە دروستدەبێت و مامۆستا قادر ڕەش دەبێت بە ڕاهێنەری، یەکەم یاریشیان بەرامبەر سوپای عیراق ئەنجامداوە، کە لە ڕانیە سەربازگەیان هەبووە، ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٧٠) ناوەکەی دەگۆڕێت بۆ بیتوێن و لە (١٩٧٧) ناوەکەی دەگۆڕێت بۆ تیپی کێوەڕەش، جارێکیتر لە ژێر فشاری حزبی بەعس، بۆ ماوەیەکی کاتی تیپی کێوەڕەش ناوەکەی دەگۆڕێت بۆ (١٧ تەموز)، بەڵام دواتر ناوەکەی دەبێتەوە بە کێوەڕەش. ئەم تیپە لە یەک کاتدا، هەم تیپێکی شارەکە بووە هەم هەڵبژاردەی ڕانیە بووە لەم ماوەیەدا، جگەلە مامۆستا قادر ڕەش کەسێکی بەڕەگەز عەرەب بەناوی (ریسان) کە پیشەی پۆلیس بووە بە ناونیشانی یاریدەدەری ئەفسەر، وەک کەسێکی بە ئەزموون بۆتە ڕاهێنەری هەڵبژاردەی ڕانیە و خزمەتێکی زۆری ئەم هەڵبژاردەی کردووە، لە دوای ئەویش ئازاد میرزا و وشیار فەتاح وەک یاریزان و ڕاهێنەر بوونەتە سەرپەرشتیاری هەڵبژاردەی ڕانیە و ڕۆڵێکی بەرچاویان بینیوە لە پێشخستنی وەرزش لە ناوچەکە.[٤]

لە کۆتایی حەفتاکانەوە تا ساڵی (١٩٩١) کۆمەڵێک یاریزان لە هەڵبژاردەی ڕانیە یاریان کردووە و ڕوڵی بەرچاویان هەبووە، لەوانە (ئازاد میرزا، سەرهەنگ میرزا، نەوزاد میرزا، ڕزگار میرزا، فواد میرزا، محەمەد حەمەعەزیز، نیاز حەمەعەزیز، غازی حەمەعەزیز، عومەر حەمەعەزیز، وشیار فەتاح، سەردار فەتاح، سالار فەتاح، وریا فەتاح، بەکر عەبدوڵا، سابیر عەبدوڵا، بەختیار مامە، دڵدار مامە، موەفەق ئەحمەد، خەبات عەزیز، سیامەند عزەت، عەبدوڵا لێوڕەش، عوسمان سالح، جەلال حەمید،

---

[١]چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەژار سالح حەمە(مامە): ٢٠١٦/٥/١٧.

[٢] نیازی حەمە عەزیز: مامۆستا قادر و تەمەنێک لە یاریگادا، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ (٧٩٥)، ١٩٨٥/٦/٢٧، ل١١.

[٣] هەمزە سەرحان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤.

[٤] سەرهەنگ میرزا وەرزشکاری دێرین و خاوەن ئەزموون: گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (٧) ئازاری ٢٠٠٤، ل٤٤-٤٥؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سالح عەلی وەیس، ٢٠١٦/٣/١٦، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦١ ڕانیەیە و دەرچووی ئامادەیی پیشەسازیە لەتەمەنی لاویەوە یاریزانی هەڵبژاردەی ڕانیەیە، ئێستا سەرۆکی یانەی ڕانیەیە.

وشیار مستەفا، عەلی ڕەسوڵ، شاکر خانەقینی، جەنگی نەبی، سالح عـەلی، ئـەکرەم حمـەدەمین، جـەمال خدر، نەزمی عەلی، سەفین مەجید، سەردار خالید، هیوا کەمال، هیوا ڕەشید، عەبدولقادر مستەفا).[١]

هـەڵبژاردەی ڕانیـە لـەو ماوەیـەدا چەنـدین یـاری لەگـەڵ تیپـە میللیـەکانی کـەرکوک و هـەولێر و سلێمانی و قەڵادزێ و کۆیـە سـازداوە و لـە زۆرێـک لـە یارییـەکان بـراوە بـووە، تەنانـەت لـە یارییـەکی دۆسـتانەدا توانیویـەتی لــە هــەڵبژاردەی (قــوات المعتصــم) بباتــەوە، تــا ســاڵی (١٩٨٥) لــە کـۆی بەشداریکردنی لە چوار پاڵەوانیەتی خولی قەزاکانی پارێزگای سلێمانی لـە سـاڵانی(١٩٨٤،١٩٧٩،١٩٧٨) توانیویەتی سێ جار پلەی یەکەم بەدەست بهێنێ، ئەمەش بە هێزی ئەم هەڵبژاردەیە نیشان دەدات لـەم ماوەیەدا.[٢] لە ماوەی هەشتاکاندا چەند تیپێکی میللی بەهێز لە ڕانیە هـەبووە، وەک: (لاوان، کێوەڕەش، یەکگرتوو، شەهیدن، ئازادی گـەرمیان، بیتوێن، گـەرمیان) گرنگترین تیپـە بـەهێزەکان بریتـی بـوون لـە: کێوەڕەش کـە وشـیار فـەتاح ڕاهێنـەری بـووە، لاوان ئـازاد میـرزا ڕاهێنـەری بـووە، ئـازادی ئیسـماعیل گابەڵـەک ڕاهێنـەری بـووە، لـە دوای سـاڵی (١٩٨٥) دا سـاڵانە خـول بـۆ ئـەم تیپـە میللییانەکراوەتـەوە، یاریزانە باشـەکان هەڵبژێردراون بۆ هەڵبژادەی ڕانیە،[٣] لەبەر ئەوەی تیپی کێوەڕەش بەهێزتر بووە لـە تیپـەکانی تـر لـە خولەکانـدا یاریزانـەکانی دابەشـدکردووە بەسـەر تیپـەکانی تـردا، کێـوەڕەش بەشـدار نەدەبوو لە خولەکان، بۆیە لە زۆربەی کاتدا هەڵبژاردەی ڕانیە بە کێوەڕەش ناسراوە.[٤]

لەماوەی (١٩٥٨-١٩٩١) چەند یاریگایەکی توپی پێ لە ڕانیە هەبووە و یەکەم یاریگا لـە گـەڕەکی قولە بووە و لە شەستەکان  بۆ دەروازەی شار گواسـتراوەتەوە و دواتـر ئـەم یاریگایـە تێکدراوە و لـە حـەفتاکان بـۆ پشـت نەخۆشـخانەی سـەربازی گواسـتراوەتەوە، کۆتـا جـاریش بـۆ گـەڕەکـی قولـە گواستراوەتەوە.[٥] لەو ماوەیـەدا  لەگـەڵ ئـەوەی تۆپی پێ لـە ڕانیـە زۆر بـەرەو پێش چووە و ئاسـتی بـەرزی پێشکەشـکردووە، وەک هـەڵبژاردەی ڕانیـە چەنـدین نازنـاوی گرنگی بەدەسـت هێنـاوە، بـەڵام نـەیتوانیوە قۆنـاغی سـەرەتایی تێپـەڕێنێت، چونکە تاسـاڵی (١٩٩١) هـەڵبژاردەی ڕانیـە مامەڵـەی تیپێکی میللـی لەگـەڵ کـراوەو نەچۆتـە ئاسـتی هـەڵبژاردەی شـارە گـەورەکان و تیپـە نایابـەکانی کوردسـتان و عیراق، ئەمەش بەهۆی دەرهاویشتەی سیاسەتی چەوتی حکومەت و حزبی بەعسی فەرمانڕەواوە

---

[١] سالح عەلی وەیس: کورتەیەک لە مێژووی وەرزشی تۆپی پێی ڕانیە، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە (٤)ئایاری ٢٠٠٣، ل٤٤.

[٢] نیازی حەمە عەزیز: ئازادە ڕەش بیسـت سـاڵە هـاوڕێی تۆپە، ڕۆژنامـەی هاوکـاری، ژمـارە (٧٧٢)، ١٩٨٥/١/١٧، ل١١.؛ نیازی حەمە عەزیز: تیپی هەڵبژاردەی ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٧٨٠) ١٩٨٥/٣/١٤، ل١٥.

[٣] نیـازی: تیپـی ئـازادی و پاڵـەوانی تـۆپی پـێ لـە ڕانیـە، ڕۆژنامـەی هاوکـاری، ژمـارە(٨٠٢)، ١٩٨٥/٨/١٥، ل١١.؛ هـەمزە سەرحان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.

[٤] چاوپێکـەوتنی تـوێژەر لەگـەڵ وشـیار فـەتاح بابـەکر: ٢٠١٦/٣/١٧، ڕانیـە، نـاوبراو لـە دایـک بـووی ١٩٥٧ ڕانیەیـە و دەرچـووی کـۆلیژی وەرزشـی موسـڵە و یـاریزان و ڕاهێنـەری هـەڵبژاردەی ڕانیـە بـووە، ئێسـتا سەرپەرشـتیاری وەرزشیە لە پەروەردەی ڕانیە.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سالح عەلی وەیس: ٢٠١٦/٣/١٦.

بووە، کە هەمیشە بە چاوی گومان و خراپ سەیری ناوچە کوردیەکانی کردووە و جگە لە دەست وەردانی بەردەوامی ئەم حزبە لەناونانی تیپەکان و بەزۆر ڕاپێچکردنی وەرزشەوان و تیپەکان بۆ بۆنە تایبەتیەکانی خۆیان و حزبەکەیان، کە بەردەوام ڕۆڵی خراپیان بینیوە لەسەر گەشەی وەرزش لە ناوچەکە، خاڵیکی تر لاوازی ئابووری و سەرقاڵبوونی یاریزانەکان بە کشتوکاڵ و سەرچاوە بژێوییەکانی تری ژیان، کە ناچار بوون لە پاڵ وەرزش کاری تر بکەن، بەهۆی ئەوەی وەرزش هیچ سودێکی ئابوری نەبووە و تەنها وەک خولیاو ئارەزوو ئەنجام دراوە.[١]

**٢- باڵە**

یاری باڵە یەکێکی ترە، لەو یارییانەی کە لە ڕانیە ئەنجامدراوە، لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان، کۆمەڵێک کەس بە شێوەی ناڕێکخراو ئەم یاریەیان کردووە، لەوانە: (عەبدولڕەزاق گاخۆر، ئەنوەری خالە حەمە، ئیسماعیل محەمەد، تەحسین شێخ حەمید، سالار شێخ حەمید، عەبدولخالق میرزا، ئازاد ڕەشید، قاسم ڕەفیق، هەژار مامە، زەکی ڕەسوڵ مەزن، سەرهەنگ میرزا)، [٢] لە ساڵی (١٩٦٧) تیپی باڵەی هەڵبژاردەی ڕانیە. بەسەرپەرشتی مامۆستا سەلاح محەمەد، کە ئەوکات مامۆستای خوێندنگەی ناوەندی ڕانیە بووە دروستبووە کە لە کۆمەڵێک یاریزان پێکهاتووە لەوانە (عەبدولخالق میرزا، مامۆستا بەکرە سور، مامۆستا قادر کەریم، سەرهەنگ میرزا، زریان جەرجیس، ئەنوەر محەمەد، سەردار محەمەد، فاتح مەحمود، غەریب ئەحمەد، سالارحەمید)، ئەم تیپە بەشێوەیەک لە شێوەکان تا ساڵانی هەشتاکان درێژەی دەبێت، لە ناو خوێندنگەی ناوەندی ڕانیە مەشق و ڕاهێنانیان ئەنجامداوە و چەندین یاری گرنگیان لەگەڵ قەلادزێ و کۆیە و چەند شارێکی تر ئەنجام داوە، هاندەر و جەماوەری باڵە لە ڕانیە ڕۆڵی کاریگەریان لەسەر ئەم وەرزشە هەبووە، تەنانەت لە ڕاهێنانەکانیش ئامادەبوون، کە ئەمە بۆتە هۆی پەرەپێدان و فراوانبوونی ئەم وەرزشە و لە ساڵی (١٩٨٠) تا ساڵی (١٩٩٠) چەند یاریزانێکی لاو تازە پێگەیشتوو لە ڕانیە دەرکەوتوون، کە بریتیبوون لە (ڕزگار میرزا، جەلال حەمید، بەکر عەبدوڵلا، وشیار مستەفا، محەمەد مەرگەیی، سەعید مەرگەیی، ئالان جەمال، بەختیار مامە)، لەم قۆناغەدا ڕزگار میرزا وەک یاریزانێکی بەتوانا و ڕێکخەری ئەم تیپە ڕۆڵێکی باڵای هەبووە، بەڵام دۆخی سیاسی ساڵانی هەشتاکان زۆر ئاڵوز بووە، ڕێگری لە بەرەو پێشچوونی ئەم یاریە کردووە، لە ساڵی (١٩٩٠) ئەم تیپە بەتەواوی هەڵوەشاوەتەو.[٣]

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ وشیار فەتاح بابەکر: ٢٠١٦/٣/١٧.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەژار ساڵح حەمە(مامە): ٢٠١٦/٥/١٧.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەرهەنگ میرزا محەمەد: ٢٠١٦/٣/٣١، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٤ ڕانیەیە و تا قۆناغی ناوەندی خوێندووە و یەکێک بووە لە وەرزشەوانەکانی تۆپی پێ و باڵە لە ڕانیە، تا نەوەدەکان بەردەوام بووە لە یاریکردن و بە بنەماڵەوە وەرزشەوانن.

### ٣- بنیادنانی جەستەو لەشجوانی

یاری لەشجوانی یەکێکی تر بووە لە وەرزشە باوەکانی ڕانیە، لە دوای ساڵی (١٩٧٠) لە ڕێگەی هاوڵاتییەکی بەنەژاد عەرەب کە لە ڕانیە سەرباز بووە، کۆمەڵێک کەلوپەلی یاری لەشجوانی لە ئۆتۆمبێل دروستکراوی بەخشیوەتە وەرزشەوانێکی ڕانیە بەناوی ئەنوەرمحەمەد توفیق ناسراو بە (ئەنوەری خاڵە حەمە،) ئەویش لەماڵەکەی لە ڕێگەی ئەم کەلوپەلانەوە دەستی کردووە بە وەرزشکردن بەشێوەی تاکەکەسی.[١] لە ساڵی (١٩٧٥- ١٩٧٦) یەکەم هۆڵی وەرزشی لەشجوانی لە ڕانیە لە گەڕەکی ڕەشەمێرگ کراوەتەوە، کە ئامێرەکانی زۆر سادەبوون، لە چیمەنتۆ و ئاسنی سادە دروستکراوبوون، دواتر گواستراوەتەوە بۆ گەڕەکی قەڵات نزیک ناو بازاڕ، بۆ ئەوەی بۆ هاتوچۆ ئاسان بێت. گرنگترین یاریزانەکانی بریتیی بوون لە (سەڵاح کەرکوکی، عەلی ئیبراهیم قەساب، حەسەن غەریب، عەلی ئیبراهیم، عومەر حەسەن، عەلی خەزاڵ، سەڵاح محەمەد)، هەر لەم ماوەیەدا کۆمەڵێک کەس لە ماڵەوە ئەم وەرزشەیان کردووە، یەکێک لەو کەسانە وریا فەتاح بووە کە دواتر بە هۆکاری سیاسی ئاوارەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە، لەوێش درێژەی بەم وەرزشە داوە و بە هۆی جوانی جەستەیەوە بەشداری چەند نمایشێکی کردووەو خەڵاتی وەرگرتووە، تەنانەت لە ڕۆژنامەکانی ئێران وێنەی بڵاوکراوەتەوە. دواتریش لەگەڵ دروستبوونی مەڵبەندی لاوانی ڕانیە هۆڵێکی تایبەت لەو مەڵبەندە بۆ ئەم وەرزشە دەکرێتەوە، بە سەرپەرشتی سەردار محەمەد دەرباز، ژمارەیەکی زۆر لاو پەیوەندی بەم هۆڵەوە دەکەن، لەم سەردەمەدا بەهۆی نەبوونی وەرزشەوانی پێشکەوتوو لەم بوارەدا کۆرسەکانی وەرزشی لەشجوانی، لە شارەکانی هەولێر و سلێمانی و لە ڕێگەی کۆمەڵێک ڕۆژنامە و گۆڤاری وەرزش عەرەبی، بە یاریزانەکان گەیشتووە و کۆرسەکانیان جێبەجێ کردووە و کاریان لەسەرکردووە و دواتر بەهۆی خراپ بوونی دۆخی سیاسی، هۆڵەکەیان چۆلکردووە و لەماڵەوە درێژەیان بەم یاریەداوە.[٢]

لە ساڵی (١٩٨٧) جارێکی تر لەلایەن (ئەنوەر محەمەد توفیق) هۆڵی لەشجوانی لە مەڵبەندی لاوانی ڕانیە دادەمەزرێتەوە، کۆمەڵێک لاوی تازەپێگەیشتوو دووبارە پەرە بەم وەرزشە دەدرێتەوە، کە بریتی دەبن لە: (ئیسماعیل مەحمود، ڕزگار حەسەن، ڕزگار واحید، مستەفا حەمە حەسەن، عومەر حەسەن، ڕەحمان عەلی وەیس، عەبدوڵڵا یاخیانی)، لەگەڵ خراپی دۆخی سیاسی کوردستان و عیراق بەگشتی، بەڵام ئەم وەرزشە هەر درێژەی دەبێت، لە ساڵی (١٩٨٩) ئەم وەرزشە دەچێتە قۆناغێکی ترەوە، هۆڵی لەشجوانی ڕانیە بە فەرمی دەکرێتەوە. سەباح سالح سەعید وەک کەسێکی شارەزاو بە

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەباح سالح سەعید: ٢٠١٦/٣/١٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٥ کەرکووکە، تاقۆناغی ناوەندی خوێندووە، لە کۆتایی هەشتاکان بە هۆکاری سیاسی ڕووی کردۆتە ڕانیە و لە ١٩٨٢ دەستی کردووە بە وەرزشی لەشجوانی لەکێشی خۆی دووجار سێیەمی عیراق بووە، لە ساڵی ١٩٨٨ بۆتە ڕاهێنەر و لە ١٩٨٩ لە ڕانیە کاری ڕاهێنەری دەکات و تا ئێستا بەردەوامە.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەلی ئیبراهیم سابر: ٢٠١٦/٣/١٦، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٢ ڕانیەیە و لە سالانی حەفتاو هەشتاکاندا یاریزانی لەشجوانی بووە لە ڕانیە، ئێستا دوکانی گوشت فرۆشتنی هەیە لە ڕانیە.

ئەزموون دەبێت بە ڕاهێنەری ئەم هۆڵە، لەو ماوەیەدا بە هاوکاری یاریزانان ئیسماعیل مەحمود و مستەفا حەمە، بەشێوەیەکی زانستی و ڕاهێنراو مەشق بە یاریزانەکان دەکات و کۆرسی تایبەتیان پێدەدات، لە ساڵی (١٩٩٠) دا بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ڕانیە، یەکەمین نمایشی لەشجوانی لە هۆڵی مەڵبەندی لاوان ڕێکدەخرێت و (١٨) یاریزان بەشداری تیدا دەکەن، لە ساڵی (١٩٩١) دا، نمایشێکی کێبرکێ پاڵەوانیەتی بۆ یانەکانی برایەتی هەولێر و سیروان و یانەی سلێمانی لە ڕانیە ئەنجام دەدرێت و ڕانیە وەک هۆڵ بە شدار دەبێت، لەلایەن مامۆستا بورهان عەلی جومعە ڕاهێنەری هەڵبژاردەی عیراق و مامۆستا هاشم مەلا حەمە ڕاهێنەری لەشجوانی هەولێر، هەڵسەنگاندن بۆ نمایشەکە دەکەن و هۆڵی لەشجوانی ڕانیە لەکێبرکێییەکەدا چوار یەکەم و دوو پلەی دووەم بەدەست دەهێنێت، بە دەستهێنانی ئەم ئەنجامە بۆ هۆڵی لەشجوانی ڕانیە بە ماوەیەکی کەم و لەگەڵ کۆمەڵێک یانەی بەئەزموون و گەورە، کارێکی گرنگ و گەورە بووە لەو سەردەمەدا.[١]

**٤- کاراتی و کۆنفۆ و وشوشاوڵین**

مێژووی وەرزشی هونەری بەرگری لە ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٨٢) دەگەڕێتەوە، کاتێک کەسێک بەناوی محەمەد خۆشناو لەسلێمانییەوە دێت بۆ ڕانیە و لە مەڵبەندی لاوانی ڕانیە هۆڵێک دەکاتەوە، بەڵام دوای (٤) مانگ محەمەد کاراتی بەهۆی ژیانی تایبەتی خۆیەوە ڕانیە جێدەهێڵێت، لەو سەردەمەدا کۆمەڵێک لاوی ڕانیە گرنگی بەم وەرزشە دەدەن، لەوانە (هاشم مەلا ڕەسول، محەمەد ڕەسول مراد، هونەر جەلال، هاوکار جەلال، فریاد رەحمان، کەمال فواد، مەحمود مەولود، سالح کەریم شکاک، کاوە محەمەد یوسف، هتد).[٢]

لە ساڵی (١٩٨٣) بۆ یەکەم جار هۆڵی کونفۆ و وشوشاوڵین لە مەڵبەندی لاوانی ڕانیە بەسەرپەرشتی سەعید قادر بە هاوکاری کەسێکی تر بەناوی مەحمود مەمۆ، لە شارەکە کراوەتەوە و بەهۆی ئەوەی ئەم وەرزشە پەیوەست بووە بە فێربوونی هونەری جەنگ وبەرگریکرن، لەگەڵ کردنەوەی گەنجێکی زۆری ڕانیە ڕوویان لەم وەرزشە کردووە، کە ژمارەیان (٥٠-٦٠) وەرزشەوان بووە، لەم ماوەیەدا بۆ ناساندن و پەرەپێدانی توانای یاریزانەکان، چەندین نمایشی کۆنفۆی جۆربەجۆریان لە ڕانیە ئەنجامداوە. لەوانە نمایشی ساڵی (١٩٨٤) لە مەڵبەندی لاوانی ڕانیە بە جولەی میوزیک و شێوەی ڕێکخراو، نمایشی ئۆتۆمبێل و ماتۆڕ لە ساڵی (١٩٨٥)دا نمایشی نواندن و بەرگریکردنی جەنگی لە یادی نەورۆز، لە ساڵی (١٩٨٨) دا، وەک بە دەستهێنانی ئەنجام و بەشداری کردن لە پاڵەوانیەتیەکانش لە ساڵی (١٩٨٥) دا کۆنفۆی ڕانیە بەشداری ڤیستیڤاڵی ساڵانەی مەڵبەندەکانی لاوانی پارێزگای سلێمانی کردووە و پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی ئەو پارێزگایە بە

[١] سەعید قادر: لەمەڵبەندی لەشجوانی ڕانیە ئاسن و گۆشت بوون بەیەک، ڕۆژنامەی ئاسۆی وەرزشی، ژمار(٥٢) ١٩٩٠/٧/٢٨، ل١.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەباح ساڵح سەعید: ٢٠١٦/٣/١٤.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هاشم ڕەسوڵ فەقێ محەمەد: ٢٠١٦/٣/٢٧، ڕانیە، لە دایک بووی ١٩٦٦ ڕانیەیەو تاقوناغی سەرەتای خوێندووە، لە ماوەی هەشتاکاندا یەکێک بووە لە یاریزانی کاراتی و کوننفۆ لە ڕانیە.

دەست هێناوە، لەسەر بەدەستهێنانی ئەنجامی تاکە کەسیش سەعید قادری ڕاهێنەر کۆنفۆی ڕانیە وەک یاریزان لە ساڵی (١٩٨٦) بەشداری کێبڕکێی خولی یانەکانی عیراقی کردووە و لە کێشی (٦٨) کیلۆگرام دا، پلەی دووەمی بەدەستهێناوە، لە ساڵی (١٩٨٧) دا بۆ جارێکی تر سەعید قادر وەک یاریزان بەشداری خولی پاڵەوانیەتی عەرەبی کردووە لە شاری بەسرە، لەکێشی (٧١) کیلۆگرام پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە لە ماوەی ساڵانی (١٩٨٨-١٩٩١) ئەم یارییە زۆر فراوان بووە و چەندین یاریزانی بەتواناو بەهێزی تێدا هەڵکەوتووە لەوانە (عەبدول لەتیف بایز، ئیسماعیل حەمەدەمین، فەرهاد حەمە عەلی، جەمال مەلا ڕەسول، ئازاد خدر، هتد)، کە بەشێکیان بوون بەکەسی زۆر ئاست بەرزو بە ئەزموون وەک ڕاهێنەر درێژەیان بەم وەرزشە داوە.[1]

جگە لەم وەرزشانەی باسکران، کۆمەڵێک وەرزشی تر هەبووە لە ڕانیە بەتایبەت یاری تۆپی سەرمێز و شەترەنج، چەند لاوێکی بەتوانا لێهەڵکەوتووە، لە بواری تۆپی سەرمێز ئەکرەم حەمەدەمین یەکێک بووە لەو لاوانەی توانیویەتی سەرکەوتنی گەورە و گرنگ بەدەست بهێنێ، لە ماوەی ساڵانی (١٩٨٤-١٩٩١) پلەی یەکەمی لە سەر ئاستی ڕانیە بەدەست هێناوە و لە ساڵی(١٩٨٤) یەکەمی سەر ئاستی سلێمانی و لە ساڵی (١٩٨٩) دووەمی سەر ئاستی ناوچەکانی حوکمی زاتی بووە. وەک یاری شەترەنجش ئومێد حەمە عەلی، یەکێک بووە لەو بەهرەمەندانەی ئەم بوارە و توانیویەتی لە ساڵانی (١٩٨٥، ١٩٨٦، ١٩٩٠) پلەی یەکەمی سەر ئاستی سلێمانی بەدەست بهێنێ.[2]

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەعید قادر سەعید: ٢٠١٦/٣/٢٧، لە ڕێگەی مۆبایلەوە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٧ ڕانیەیە و بڕوانامەی دبلۆمی هەیە لە تەکنەلۆجیادا، لە ساڵی ١٩٧٨ دەستی بەو وەرزشەی کۆنفۆکردووە، سەرەتا لە ولاتی ئیران فێری ئەم وەرزشە بووە، دواتر لە سلێمانی لە ژێرسەرپەرشتی دلێر محەمەد ئەمین، ڕاهێنانی کردووە، لە ساڵی ١٩٨٣ وە ئەم وەرزشەی هێناوە بۆ ڕانیە، وەک ڕاهێنەر دەستبەکار بووە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدولەتیق بایز خدر: ٢٠١٦/٣/٢٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٧٠ ڕانیەیە و تا قۆناغی سەرەتایی خوێندووە، لە ساڵی ١٩٨٧ دەستی بە وەرزشی کۆنفۆ کردووە ئێستا ڕاهێنەری کۆنفۆیە لە ڕانیە.

[2] حەسیب پشدەری: یاریزانێکی شەترەنج لە بناری کێوەڕەشدا، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە(١١٦٤)، ٢٠١٦/٣/٢٦، ل١٠.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەکرەم حەمەدەمین عومەر: ٢٠١٦/٣/١٦، ڕانیە، لە دایک بووی ١٩٦٥ ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگایە، لە ماوەی هەشتاکاندا یاریزانی تۆپی سەرمێز و بالە و تۆپی پێ بووە.

# بەشی سێیەم

# بارودۆخی ئابووری ڕانیە (١٩٥٨ – ١٩٩١)

باسی یەکەم: بنەما سروشتی و مرۆیەکانی ناوچەکە

باسی دووەم: چالاکی کشتوکاڵی (بەروبوومی ڕووەکی و ئاژەڵی)

باسی سێیەم: پیشەو پیشەسازی و چالاکی بازرگانی

# بەشی سێیەم: بارودۆخی ئابووری ڕانیە (١٩٥٨ – ١٩٩١)

**باسی یەکەم/ بنەما سروشتی و مرۆییەکانی ناوچەکە**

بنەما سروشتی و مرۆییەکان کۆمەڵێک خاسیەت و تایبەتمەندین، کە کۆی پرۆسەی پەرەپێدانی چالاکی ئابوری هەر ناوچەیەک پەیوەستن بە بارودۆخی ئەم بنەمایانەوە، بۆیە دەستەبەرکردن و بەگەڕخستنیان بۆ بواری بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی زانستی دروست و ڕاست کاریگەرییەکی گەورە و ڕاستەوخۆی لەسەر بوژانەوە و پەرەپێدانی جوڵانەوەی ئابووری لەو ناوچەیەدا هەیە. گرنگترین بنەما سروشتی و مرۆییەکانیش بریتین لە (بەرزی و نزمی، ئاووهەوا، دەرامەتی ئاو، خاک، ڕووپۆشی ڕووەکی، دانیشتوان و هێزی کار، گواستنەوە، بازاڕ، چالاکیە ئابورییەکان)، ناوچەی ڕانیەش وەک هەر ناوچەیەکی تری کوردستان تایبەتمەندی تایبەت بەخۆی هەیە و گرنگترین بنەما سروشتی ومرۆییەکانی ناوچەکە بە ڕەچاوکردنی ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوەکە(١٩٥٨-١٩٩١) [١]،بریتین لە:

**١- ئاووهەوا**

باشوری کوردستان بەپێی پێگەی کە کەوتۆتە نێوان دەشت و شاخ و دۆڵەکان، جیاوازی زۆر لە ئاستی بەرزی و نزمی ناوچەکانیدا هەیە، ئەم جیاوازیەش وای کردووە کە ناوچەکە کراوەبێت لە بەردەم هەموو جۆرەکانی ئاو هەوا، ئاووهەوای ناوچەی ڕانیە کەوتۆتە ناو ئەو بارودۆخە کە لە هاویندا زۆر گەرمە و لە زستاندا ساردە، لە وەرزی زستاندا بە درێژایی سێ مانگ بەفرو بارانی زۆر دەیگرێتەوە، کە هەندێک جار باران بە باوە دەبارێت تا کۆتایی مانگی ئازار بەردەوام دەبێت.[٢] شوێنی ئەسترونۆمی شاری ڕانیە کەوتۆتە نێوان هەردوو بازنەی پانی( ٠٧، ٣٦-٣٠، ٣٦)ی باکوری گۆی زەوی و نیوان هەردوو هێڵی درێژی (٤٤,٤٥,٣٠- ٤٤,٤٥,٣٥)ی خۆرهەلات، دیاریکردنی شوێنی ئەسترۆنۆمی کاریگەری زۆری هەیە لەسەر ئاووهەوا، بە تایبەت لەڕوی گۆشەی کەوتنی تیشکی خۆر و درێژی شەو ڕۆژ، بەرپرسە لەو تۆپەڵە هەوایانەی کە هەڵدەکەنە سەرناوچەکە، کاردەکەنە سەر چالاکی ئابووری ناوچەکە سەبارەت بە پلەی گەرمی شارۆچکەی ڕانیە هێڵی گەرمی یەکسانی (١٢) پلەی سەدی بەبەشەکانی باکووری و هێڵی گەرمی یەکسانی (١٤) پلەی سەدی بە بەشەکانی باشووریدا تێدەپەڕێت، زستانی ساردو باراناوییە هاوینی گەرم وشکە، بە شێوەیەکی گشتی مانگی تەموز گەرمترین مانگە لە ناوچەکە و هەندێکجاریش پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە بۆ (٤٤) پلەی سەدی، کانونی یەکەم ساردترین مانگی ناوچەکەیە کە پلەی گەرمی مانگانەی دەگات بە (٢,٩) پلەی

---

[١] لەبەرئەوەی بەشێک لە بنەما سروشتیەکان تاڕادەیەک چەسپاون و ناتوانرێت زۆر پەیوەست بکرێن بە کاتەوە، بەناچاری بەکارمان هێناون، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕەچاوی ماوە مێژوویەکەمان کردووە و لە شوێنێک زۆر پێویست نەبووبێ لە چوارچێوە مێژووییەکە دەرنەچووین، لە بەکارهێنانی سەرچاوەکانیش رەچاوی ئەم خاڵەمان بەوردی کردووە.

[٢] هنري فيلد: جنوب كردستان دراسة انثروبولوجية، ت، جرجيس فتح الله، دار اراس، اربيل، ٢٠٠١، ص٤٤-٤٥.

سـەدی و هەنـدێک جـاریش ژێـر پلـەی سـفرەوە.[1] لـە ڕوی دابارینـەوە ئـاو هـەوای ڕانیـە لـە ژێـر کاریگەریی ئاوهـەوای دەریـای نـاوەڕاست دایـە، واتـا زسـتانی فێنـک و باراناوییـەو هاوینیشـی گـەرم و وشکە، بە شێوەیەکی گشتی تێکرای باران بارینی ساڵانەی لە نێوان (٩٠٠-١٠٥٠) ملم، جگـە لـە ڕێـژەی بەفر بارین، تێکرای ساڵانەی پلەی گەرمی لـە (١٦) پلـەی سـەدی تێناپـەڕێت و پلـەی گـەرمی فێنکترین مانگی لە (٢٢) پلەی سەدی تێپەڕناکات.[2] بە هـۆی نـەبوونی وێـستگەی کەشناسـی لـە ڕانیـە لـەماوەی لێکۆڵینەوەکـەدا، پشـتمان بـە داتـای بـاران بـارینی پارێزگـای سـلێمانی بەسـتووە، کـە تـا ڕادەیـەک لـە ئاووهـەواو دابـارینی ڕانیـە نزیکـە لـە مـاوەی سـاڵی (١٩٥٨-١٩٩١) لـە تێکـرا بـاران بـارینی سـاڵانە جیاوازیەکی زۆر هـەبووە، نزمتـرین ئاسـتی بـاران بـارین لـە سـاڵی (١٩٦٦) نزیکـەی (٤٠٠) ملـم بـووە، بەرزترین ڕێژەی دابارینیش لە ساڵی (١٩٦٩) تۆمارکراوە کە نزیکە (١٢٠٠) ملم بووە.[3]

## ٢- تۆبۆگرافیا

### أ- ناوچەی شاخاوی

چیاکانی ڕانیە کەوتونەتە ناوچەی چیا نزمەکان کە چیاکان لە جۆری (پێچاوپێچ، ئاڵوز، ساکارن) بەرزاییـەکانیان لـە نێـوان (١٠٠٠-٢٠٠٠) مـەتر دەبێـت، زنجیـرە چیاکـانی ڕانیـە- قەمچوغـە، کەوتونەتـە ژێرکاریگــەریی داڕوتــان و لەتبونــەوە، ئــەم ناوچانــە بەنیشــتەنییەکی ئەســتوور داپۆشــراون و نوشـتاونەتەوە،[4] چیـای کێـوەڕەشـی نزیـک ڕانیـە درێژکـراوەی زنجیـرە شـاخی بـوتین-کێـوەڕەشـە و بەرزییەکەی دەگاتە (٢٠٣٤)م لەئاستی ڕووی دەریاوە.[5] بە شێوەیەکی گشتی ناوچـەی ڕانیـە هـەردوو تایبەتمەنـدیی دەشـتایی و شـاخاویی بـە خۆیـەوە گرتـووە، ناوچـە شـاخاوییەکانی ڕانیـە لـە بـاکوور و باکووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای شارۆچکەکە دەگرێتەوە، سنورەکەی لـەباکورەوە هاوسنورە لەگـەڵ زنجیرە چیای کارۆخ و لـە ڕۆژهـەڵاتیـەوە دۆڵـی پیرانـان و لـە بـاکوری ڕۆژئـاواوە لەگـەڵ چیـای شـێخ وەسانان و لە بەشی باشووری ڕۆژئاواش لەگەڵ کامووسەک و لە باشووریش لەگەڵ دەشتی بیتوێن هاوسنورە، ئاراسـتەی بـەرزی چیاکانیشـی لـە بەشـی باشـوری شـارۆچکەکە لـە(١٠٠٠)م دایـە، تـاوەکو بەرەو باکور بڕۆین بەرزیەکەی زیاددەکات، تا دەگات بە(٢٥٠٠)م گرنگترین زنجیرە چیاکانی باکووری خۆرهەڵاتی بریتین لە کێوەڕەش و ماکۆک، کە دۆڵێکی فراوان دەکەوێتە نێوانیان بە ناوی دۆڵـی ئـاکۆ- شاور، لە بەشی باکووری خۆرئاواش زنجیرە شـاخەکانی نێـوە (١١١٦)م، سـەردۆڵ ( ١٥١٢)م،

---

[1] د. کامەران تاهیر سەعید: بنەما سروشتیەکانی پەرەپێدانی چالاکی کشتوکاڵی لە قەزای ڕانیە، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، ژ(٢٥)، کانونی یەکەمی ٢٠١٢، ل٢٢١، ٢٢٤؛ پشتیوان شەفیق ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٤-١٦٥.

[2] پشتیوان شەفیق ئەحمەد: ڕەهەندی جوگرافیای قەزای ڕانیە، گۆڤاری ستاندەر، ژ(١٤)، نیسانی ٢٠٠٧، ل٦٢.

[3] حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان: وەزارەتـی کشـتوکاڵ و سـەرچاوەکانی ئـاو، بەڕێوبەرایـەتی کشـتوکاڵی ڕانیـە، بەشـی پلاندانان، داتای ڕێژەی باران بارینی ساڵانە لە پایزگای سلێمانی، ٢٠١٦/٦/١٨.

[4] کۆمـەڵێک مامۆسـتای زانکۆ:جوگرافیـای هـەرێمی کوردسـتان، و: سـەنتەری برایـەتی، پێداچونـەوەی ئاسـۆکەریم، چ٢، هەولێر، ١٩٩٩، ل٥٢-٥٣.

[5] محمد علی قادر: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤.

شیشـار(١٦٥٠)م، بەشی باکوریشی پێکهاتووە لە چیاسەختەکانی بێترخێن (٢٥١٢)م، کەژۆست (٢٢٥٠)م، لەگەڵ کۆمەڵێک دۆڵی وەک (ئاکۆ،شاور، پڵینگان، دۆڵە ڕەقە).[١]

**ب- ناوچەی دەشتایی**

دەشتی ڕانیە دەکەوێتە باکوری دەریاچەی دوکان، کە ڕووبەرەکەی نزیکەی (٢٨٠)کم٢،[٢] دەشتەکە زۆربەی ئەو زەوییانە دەگرێتەوە کە ئاوەڕۆی زێی بچووک پێش ڕێژگەکەی لە بەستی دوکان پێدا ڕەتدەبێت، زنجیرە چیای کێوەڕەش دەشتی ناوچەکە دەکات بە دوو بەشەوە، بەشی ڕۆژهەڵاتی پێی دەوترێت دەشتی پشدەر و بەشی ڕۆژئاواشی پێدەوترێت دەشتی بیتوێن کە درێژیەکەی(٣٠)کم ڕوبەرەکەی (٨٠٠)کم٢.[٣] بە شێوەیەکی گشتی بەرزی دەشتی ڕانیە لە نێوان (٥٠٠-١٠٠٠) مەتردایە لەسەر ئاستی ڕوی دەریاوە، لە پاش تەواوکردنی بەنداوی دوکان لەساڵی (١٩٥٩)ەوە دەریاچەی دوکان ناوچەیەکی بەرفراوانی دەشتی شارۆچکەی ڕانیەی داپۆشیوە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بەرزی ئەم بەستە کە (٥٢٥)م بەرزە لە ئاستی ڕوی دەریاوە، توانای ئاوگلدانەوەی دەگاتە (٦,٨ ملیار/م٣، نزیکەی (٢٨٠)کم٢ زەوی بەهۆی بەنداوەکە کەوتۆتە ژێر ئاوەوە.[٤]

**٣- ڕووپۆشی ڕووەکی:**

ڕووپۆشی ڕووەکی دابەشدەبێت بۆ دوو جۆر:

**أ- رووەکی سروشتی**

ئەم ڕووەکە بەرهەمی سروشتی بەیەکداچوونی کەش و هەواو بەرزی و نزمی خاک و خۆڵە، لە باشووری کوردستاندا دوو جۆر ڕووەکی سروشتی هەیە گژوگیا و دارستانەکان، بوونی ڕووپۆشی ڕووەکی بەشی زۆری پەیوەندی بە باران بارینەوە هەیە، بەشێکی تر پەیوەندی بە ئاوی ڕوبارەکانەوە هەیە،[٥] لە ساڵی (١٩٤٧) دا کۆی ڕووبەری زەویی دارستانی سروشتی شارۆچکەی ڕانیە (١١٦٩٠٠) هێکتار بووە، بۆ زانیاری زیاتر سەیری خشتەی(١٢) بکە:

---

[١] پشتیوان شەفیق ئەحمەد: شیکردنەوەی جوگرافیا، ل١٦٠-١٦١.

[٢] هێمن حسێن ئیسماعیل: توانستە ئاوهەواییەکانی پارێزگای سلێمانی بۆ بەرهەمهێنانی گەنم و جۆ، نامەی ماستەر(بڵاونەکراوە)، فاکەڵتی پەروەردە، زانکۆی کۆیە، ٢٠١٥، ل١٨.

[٣] خەبات عەبدوڵڵا: بنەما تیوریەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور، چ٢، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٤٦-١٤٧.

[٤] جاسم محەمەد عەلی: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠-٤١.

[٥] شاكر خصباك: المصدر السابق، ص٧٧.

**خشتەی (١٢) ڕووبەری زەوی دارستانی سروشتی، بە پێی چڕی دارستان و بەرکەوتەی تاک**

| ناوچە | دانیشتوان | ڕووبەری دارستان هێکتار | چڕی دارستان | بەرکەوتەی تاک هێکتار/کەس |
|---|---|---|---|---|
| ڕانیە | ٢٦٨٧٢ | ١١٦٩٠٠ | ٠,٢٣ | ٤,٣٥ |

Source: Jamil Jalal Mohmaed: Natural Rsources and its utilization for agricultural development in Sulaimani governorate, (PhD) college of agriculture, university of Sulaimani, 2008, page79.

ڕووبـەری گژوگیـای سروشـتی لـە ڕانیـە تـا سـاڵی (١٩٩١) دا کـە کۆتـایی لێکۆڵینەوەکـە دەکـات (٧٥١٠٨) دۆنـم بـووە، ڕووبـەری دارسـتانی سروشـتی (٥٤٨٤٢) دۆنـم بـووە.[١] گرنگتـرین گژوگیـاو ڕووەکی ناوچەکە بریتیی بووە لە (ڕەشکە، هەرزن، گوڵە هێرۆ، دۆڕێ، گرگاس، کاردو، کنگر، کوزەڵە، پەڵپینـە، پنگ، هتـد)، گرنگتـرین دارودرەختـی خۆڕسکی ناوچەکـەش بریتـی بـووە لـە (مـازوو، بـەڕوو، قـەزوان، کرۆسـک، گێـوژ، هتـد)، ڕووەکـی سروشـتی لـە ڕانیـە بۆ چـەندین مەبەسـت بـەکارهاتووە، لـە بـواری تەندروسـتی و دروسـتکردنی دەرمـان، دروسـتکردنی بنێشـت و بـواری بیناسـازی، وەک سووتەمەنی بۆ خۆگەرمکردنەوە، بواری سامانی ئاژەڵ وەک لەوەڕگا، ڕێگریکردن لە ڕاماڵینی خاک و پارێزگاری کردن لە زەوی.[٢]

**ب- دارستانی دەستکرد (دەستچێنراو)**

لـە مـاوەی سـاڵانی (١٩٧٥-١٩٧٦) دا پـڕۆژەی دارسـتانی دەسـتکردی کێـوەڕەش بـە ڕووبـەری (٦٠٠) دۆنم بە داری سنەوبەر لە ڕۆژهەڵاتی ڕانیە داچێنراوە، لە ڕووی ژینگەیی و ئاوهـەواوە سـود و جوانییـەکی زۆری بەسروشـتی ناوچەکـە بەخشـیوە،[٣] ئـەم دارسـتانە لـە سـاڵی (١٩٨٧) ڕوبـەڕەکـەی زیـادبووە گەیشـتۆتە (٨٥٨) دۆنـم، ڕێژەی(٣,١%) ڕووبـەری گشـتی زەوی کشـتوکاڵی ناوچەکـە بـووە، زۆربـەی دارەکـانی لـە جـۆری دار سـنەوبەر و سـەروون، تـا سـاڵی (١٩٩١) تاکـە دارسـتانی دەسـتکرد بووە لە ناوچەکە.[٤]

---

[١] حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان: وەزارەتـی کشـتوکاڵ و سـەرچاوەکانی ئـاو، بەڕێوبەرایـەتی کشـتوکاڵی ڕانیـە، هۆبـەی پلاندانان، ٢٠١٦/٧/٢٨.

[٢] چاوپێکـەتنی تـوێژەر لەگـەڵ عـەلی حەمـە ئیبـراهیم: ٢٠١٦/٧/٢٩، ڕانیـە، نـاوبراو لـە دایـک بـووی ١٩٥١ پشـدەرە، دەرچـووی ئامـادەیی کشـتوکاڵە، ئـەزموون و شـارەزای هەیـە لەسـەر زەوی وزاری ناوچەکـە، پێشـتر بەڕێوبـەری فەرمانگەکە و لێپرسراوی هۆبەی زەوی و زار بووە لە ڕانیە، ئێستا خانەنشینە.

[٣] بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە، هۆبەی پلاندانان، ٢٠١٦/٧/٢٨.

[٤] د. سەلاحەدین حەفید: ئابوری کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٥٧؛ بەڕێوبەرایـەتی کشـتوکاڵی ڕانیـە، هۆبـەی پلاندانان، ٢٠١٦/٧/٢٨.

## ٤- دەرامەتە کانزاییەکان

دەرامەتە کانزاییەکان دوو جۆریان هەیە، فلزیی ئەو کانزایانە دەگریتەوە، کە دەردەهێنرێن و دەتوێنرێنەوە، لەگەڵ نافلزیەکان (کانزای سووتەمەنی و ناسوتەمەنیەکان وەک:فۆسفات، باریت، هالایت، کانزاسروشتیەکانی بیناکاری) دەگریتەوە، لە ڕووی کانزای نافلزیەوە، لە ساڵی (١٩٦٢) دا دوو زانا بە ناوەکانی (بولینکۆف و نیکولاییف)، لە ناوچەی ڕانیە بە دوای کانزادا گەڕاون، مادەی مس و کوارتزیان لە ناوچەکە دۆزیوەتەوە، جگە لەم مادەیە کانزای نیکل لە گڵەزەردی نزیک ڕانیە لە (٩) شوێن دۆزراوەتەوە،[١] لەگەڵ بوونی کانزای کرۆم و یۆرانیۆم، کە لە ناوچەکە بوونیان هەیە،[٢] لە ڕووی کانزای نافلزیشەوە، بەهۆی بوونی زێی بچووک لە ناوچەکە، ڕانیە دەوڵەمەندە بەم کانزایە، بەتایبەت لە کانزا سروشتییەکانی چەوولم هەروەها بەردە بەنرخەکانی وەک قسل و مەڕمەڕ، کە بۆ بواری بیناسازی بەکاردەهێنرێن.[٣]

## ٥- خاک

خاک پێکهاتەیەکی سروشتییە بەردەوام لە پەرەسەندندایە، لەئەنجامی کردارەکانی شیکاری و کارلێکە کیمایی و فیزیایی و زیندەگیەکانەوە لە نێوان چوار بەرگە سەرەکیەکەدا دروستبووە، کە سیستەمی باڵا لە زەویدا پێکدەهێنن، بەرگەکانیش بریتین لە: بەرگی بەردین، بەرگی گاز، بەرگی ژیانی یان زیندەگی، بەرگی ئاوی، کە شوێنی مانەوە و خۆراک و ئاووهەوای پێویست بۆ هەموو جۆرەکانی ڕوەک و هەندێک لە ئاژەڵەکان ئامادەدەکات.[٤] لە ڕانیەدا کۆمەڵێک جۆری خاک هەیە، یەک لەم جۆرانە خاکی کەستەنەیە، ئەم جۆرە خاکانە لە بنی بنەوەی دۆڵەکان و دەشت و ئەو حەوزانەی لە نێوان چیا بڵندەکاندا پەرشو بڵاون و هەن، ڕەنگێکی تێری قاوەییان هەیەو سەرەوەیان فشەڵە و دەنکۆڵەکانی نەرم و دەوڵەمەندن بە کانزای ئەندامی کە ڕێژەی (١-٤%) مادەی ئەندامیان تێدایە، کەڵەکە کلسیەکانی زۆر بچووک و لێک دوورن، سەرەڕای قووڵی لە هەندێک ناوچەکەدا دەگاتە چەند مەترێک، بۆیە ئەم جۆرە خاکە بە پیتترین جۆری خاک دادەنرێت لە ناوچەکە، لە ڕووی کشتوکاڵەوە بەرهەمی زۆر دەهێنێت.[٥]

لە ڕووی پێکهاتەی خاکەوە ناوچەی ڕانیە گڵەکەی قورس نیەو تێکەڵەیەکە لە لم و بەرد، لە هەندێک شوێنەوە توشی ڕاماڵینی خاک هاتووە و بەردو لم بەسەر ڕووی خاکەکەیەوە دەرکەوتووە،

---

[١] کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤، ١٥٨-١٦١؛ ئاوێستا خالید محەمەد، هەوار تاهیر کەریم، ئەتڵەسی پارێزگای سلێمانی، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٤٣.

[٢] د.محمد شکر محمود: الصناعات الانشائية في محافظة السليمانية (دراسة فى جغرافية الصناعة)، السليمانية، ٢٠١٣، ص١٠٠.

[٣] هناء عزيز احمد العيدي: حوض نهر الزاب الصغير في العراق، رسالة ماجستير(غير منشورة)، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٧، ص١٦٦؛ د.محمد شكر محمود، المصدر السابق، ص٩٨-٩٩.

[٤] د. هاوڕێ یاسین محەمەدئەمین:جوگرافیای خاک، ناوەندی غەزەلنوس، سلێمانی، ٢٠١٤، ل١١.

[٥] کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٤.

ڕێژەی کلس لە خاکەکەیدا ( ٦٩%) یە، لە چینی سەرەوەی لە هەندێک شوێن لە چینی سێیەمی دەگاتە (٦٧%)، ڕێژەی لم لە چینی سێیەمی (٧٩%)، لە چینی چوارەمی (١٧%)یە، بەشێوەیەکی گشتی خوڵ و قوڕی ڕانیە بەکەڵکە بۆ کشتوکاڵ و پرۆژەی ئاودێری،[1] زۆربەی زۆری خاکی دەشتی بیتوێن لە جۆری شابەڕوویییە( قاوەیی تۆخ)، ئاوێتەی قوڕێکی زۆرەو پێکهاتەکەی قوڕینی لیتەییە و بەتوخمە خۆراکییەکانی ڕوەک دەوڵەمەندە، بە زۆری خاکێکی تفتە، پلەی ئاوێتەبوونی لە (٨) نزیکە و چەند تفتە و توخمێکی وەک پۆتاسیۆم و مەگنیسیۆم و سۆدیۆمی تێدایە، مادەی ئۆرگانیشی دەگاتە نزیکەی (١,٥%) و ڕێژەی کالسیۆم و کاربۆنی دەگاتە نزیگەی (٣,٣٢%)، ئەم خاکە سوێریش نیە و ڕێژەی سوێرایەتی لە (٠,٣٢%) مللیموز/سم تێناپەڕێت، بە گوێرەی لێکدانەوەی زانستی خاک، دەشتی بیتوێن یەکێکە لە خاکە هەرە باشەکانی باشووری کوردستان و بەرهەمهێنانی بەروبوومی کشتوکاڵ.[2] جگە لەم جۆرە خاکانە بەشێک لە خاکی ڕانیە ڕووبەڕوی ڕامالینی زۆر بۆتەوە، لێژی تێدایە بەڕێژەی (٢٦%-٦٠%)، خاکێکی زۆر تەنکە، بەکارهێنانی شیاو نیە بۆ کشتوکاڵکردن، بەلام بۆ دارستان و لەوەڕگا بەکاردێت،[3] بۆ زانیاری لەسەر جۆری خاک و پێکهاتە فیزیای و کیمیاییەکانی و گونجانی بۆ جۆری بەرهەمی کشتوکاڵ، بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٩).

**٦- دەرامەتە ئاوییەکان**

بڕی داهاتی ئاو لە هەرێمی کوردستان جێگیر نیە لە ساڵێک بۆ ساڵێکی تر دەگۆڕێت، لە ڕووی جوگرافیشەوە بڕی ئاوی هەر ناوچەیەک بەپێی زۆری و کەمی بارانی ساڵەکە دەگۆڕێت، بە شێوەیەکی گشتی سێ شێوە داهاتی ئاو هەیە کە بریتین لە ئاوی سەرزەوی (ڕووبار و دەریاچەکان)، ئاوی ژێر زەوی (کانیاو بیر و کارێزەکان)، ئاوی دابارین(باران و بەفر) کە بڕی باران و بەفری تواوە کاردەکاتە سەر ئاوەڕۆکانی سەرزەوی و ئاوی ژێر زەوی.[4] ڕانیە بە هۆی باران بارینی زۆر لەوەرزی زستان بە سامانی ئاو دەوڵەمەندە، کەڵەکە بوونی بەفر لە شاخەکانی قەندیل و کاروخ و بێدان، پاشان توانەوەیان لە وەرزی هاوین سودی زۆر بە ئاوی ژێر زەوی و سەرزەوی ناوچەکە دەگەیەنێت،[5] بابەتی دابارین پێشتر باسی لێوەکرا، لێرەدا باس لە ئاوی سەرزەوی و ژێر زەوی ڕانیە دەکرێت:

---

[1] د.عباس فاضل السعدي: منطقة الزاب الصغير في العراق، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧٦، ص١٠٣.

[2] لەیلا قارەمان محەمەد: بەرهەمی کشتوکاڵی لە دەشتی بیتوێن، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە ٢٢، کۆتایی ساڵی ٢٠٠١، ل١٣.

[3] هێمن حسێن ئیسماعیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥-٢٧.

[4] کۆمەڵێک نوسەر: گیروگرفتی ئاو لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا، و: ئەنوەر مستەفا، ئەوانی تر، بەسەرپەرشتی، فەریدئەسەسەرد و د. ئومێد حەمەئەمین، کتیبی یەکەم، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٩٦.

[5] پشتیوان شەفیق ئەحمەد: ڕەهەندی جوگرافیای قەزای ڕانیە، ل٦٣.

**أ- ئاوی سەرزەوی**

ئاوی سەرزەوی ئاوی چەمەکان و ڕووبارەکان و دەریاچەکان دەگریتەوە بە شێوەی وەرزین یان هەمیشەیی، ئاوی سەرزەوی دەکەوێتە ژێرکاریگەری دابارینی ساڵانە، بە شێوەی گشتی ڕوبارەکان سەرچاوەی سەرەکی ئاوی سەرزەوین و دابینکەری پێداویستیەکانی ڕۆژانەی مرۆڤن لە چالاکی ئابوری و خزمەتگوزارییەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی و گواستنەوەدا.[1] گرینگترین سەرچاوەکانی ئاوی سەر زەوی لە ڕانیە بریتین لە مانەی خوارەوە:

-زێی بچووک

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەڵدەقوڵێت، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی قەڵادزێ دێتە ناو خاکی باشوری کوردستانەوە، خاکی پشدەر دەبڕێت و دەچێتە ناو ڕانیەوە، لە ڕانیە چەمی هیزۆپ و قەشانی تێدەڕژێت، لە سنوری گوندی قەمتەران دەگات بە دەریاچەی دوکان.[2] ڕوبەری ئاوزێڵی ئەم زێیە لە سنوری ناوچەی ڕانیەدا (٣٠٥١ کم٢)،[3] هەرچەندە بە هۆی دروستکردنی بەنداوی دوکانەوە ئەم زێیە خاکێکی زۆری ناوچەکەی ژێر ئاوخستوە و کەمتر بۆ کشتوکاڵ سودی لێوەردەگیرێت، بەڵام لە ڕوی ئابووری وەک ڕاوکردنی ماسی سودی لێوەرگیراوە، جگە لەوە سیمایەکی جوانی گەشتوگوزاری بە ناوچەکە بەخشیوە، گرنگترین ئەو ڕووبارانەی کە لە سنوری ناوچەی ڕانیە دەڕژێنە ناو ئەم زێیە بریتین لە:

- **ڕووباری هیزۆپ**

ڕووبارێکی گرنگی ناوچەکەیە و کەوتۆتە نیوان شاخی هەریر و سەفین و هەیبەتسوڵتانەوە، ڕووبەری ئاوزێڵەکەی (٤٥٤.٩٣٩)کم٢، لە دوولقی سەرەکی پێکدێت نازەنین و ئاوی سماقوڵی کە لەناوچەی جەلی بەیەک دەگەن و ڕووباری هیزۆپ پێکدێنن، ڕووباری هیزۆپ لە گوندی مەلا عومەر دەڕژێتە دەریاچەی دوکانەوە[4].

- **ڕووباری قەشان**

دەکەوێتە نێوان چیای ماکۆک و کاموسەک، ڕوبەری حەوزەکەی (٤٤١،٨١٠)کم٢، لە هەردوو ناوچەی سەروچاوە و بێتواتەوە هەندێک ئاوی دەڕژێتە ناو، لە باشووری ڕۆژئاوای چوارقورنە دەڕژێتە ناو دەریاچەی دوکان[5].

---

[1] هێمن حسێن ئیسماعیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

[2] هاورێ یاسین محەمەدئەمین: لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، ل١٨٠.

[3] ناهدة الطالباني: المياة الجوفية في منطقة مابين الزابين في العراق و استغلالها، مطبعة ياد، السليمانية، ٢٠٠٩، ص٧١.

[4] احمد فليح فياض على الهيبي: حوض دوكان فى المنطقة الجبلية من شمال العراق (دراسة جيومورفولوجية تطبيقية)، أطروحة دكتوراه(غير منشوره)، كلية العلوم الانسانية، جامعة الانبار ، ٢٠١٥، ص١٥١-٥٢.

[5] نفس المصدر، ص١٥١-١٥٢.

- **ڕووباری قائیمقایم**

ئـەم ڕووبـارە لـە بەشـی بـاکوری خۆرهـەڵاتـی شـارۆچکەی ڕانیـەوە درێژدەبێتـەوە بـۆ بەشـی باشووری خۆرئاوای، لـە گونـدی دیمـانی سـەرکەپکان سـەرچاوەدەگرێت، بۆیـە لـەم بەشـەی بـەم نـاوە نـاونراوە، لـە دۆڵـە ڕەقـە و شـاور چەنـدین لقـی تێدەڕژێت، دوای تێپەڕبوونی بەگونـدی سـەرکەپکان، دەچێتە ناوچەی حاجیاواو لەوێشەوە بەرەو شارەدێی چوارقورنە، ناوەکەی دەبێتە ڕوبـاری قایمقائیم، ئەم ڕوبارە بەهۆی کەمی دابارینەوە زۆربەی ساڵ لە هاویندا وشک دەبێت.[١]

**ب- ئاوی ژێرزەوی**

ئەو ئاوەیە، کە لە بۆشایی نـاو چینـە بەردینـەکانی ژێـر زەوی پـەنگی خواردۆتـەوە و بـە شـێوەی بیر و کارێزی دەستکرد یاخود بە سروشتی لە شێوەی کانیاودا دێتە دەرەوە.[٢] ئاوی ژێرزەوی چەنـد جـۆرێکی هەیـە، وەک (بیـر و کـارێز) بیـر کـە خـۆی دەبینێتـەوە لـە بیـری ئـاسـایی و بیـری ئیرتیـوازی، کارێزیش، کەناڵێکە کۆمەڵێک بیر سـەر بـەرەو ژێر، کانیاوەکـان بـەیەکـەوە دەبەسـتێتەوە.[٣] ئـاوی ژێـر زەوی ڕانیە لە ڕووی ڕووبەری سود وەرگرتنەوە (٤٩٠)کم٢، قوڵی گەیشتن بە ئاو لـە نێوان (١٥-٣٠) مەترە، بەرهەمی لە دەقیقەیەکدا (٦٠-٢٠٠) گاڵونە، لە ڕوی سوێریەوە ڕێژەکەی (١٧٠-٢٥٠) میلیگرامـە لـە لیترێکدا، لـە ڕووی بەکارهێنانـەوە بـۆ هـەموو بوارەکـانی ژیـانی مـرۆڤ و بوارەکـانی تـری ژیـان گونجاوە،[٤] لە مـاوەی (١٩٥٨-١٩٩١) دانیشـتوانی ڕانیـە جگـە لـە سـود وەرگـرتن لـە ئـاوی کانیاوەکـان، شێوازی بیریشیان بۆ سـود وەرگـرتن لـە ئـاو بـەکارهێناوە، وەک بیـری نـاعور، کـە بـە ئـاژەڵ لێدراوە، بیری دەستی کە بەدەست لێدراوە، بیری ئیرتیوازی کە بە ئامێر هەڵکەندراوە، لە ساڵی (١٩٨٦) دا (١١) بیری ئیرتیوازی لە ناوچەکە هەبووە، هەروەها بیری ئامێری بـە هـۆی نزیکـی ئاسـتی ئـاو لـە زەوی لـە ناوچەکە بە ئامێری شۆڤڵ و حەفارە لە دەشتەکان لێدراوە.[٥]

---

[١] پشتیوان شەفیق ئەحمەد: شیکردنەوەی جوگرافیا، ل١٧٢.

[٢] ناهیـدە تاڵـەبانی: زانیـاری سـەرەتای دەربـارەی جـۆری کانیاوەکـانی کوردسـتان، گۆڤـاری سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی ستراتیجی، ژ(٣)، ساڵی هەشتەم، ئابی ٢٠٠٠، ل٤٨.

[٣] د. جـەزا تۆفیـق تالیب: داهـاتی ئـاو لـە هـەرێمی کوردسـتان، گۆڤـاری سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی سـتراتیجی، ژ(٣)، سـاڵی چواردەهەم، تشرینی دووەمی ٢٠٠٦، ل١٧-١٨.

[٤] خليـل محمـد براخـاس: التبـاين المكـاني لانتـاج الحاصـيل الزراعيـة الغذائيـة الصـيفية فـي محافظـة السـليمانية، رسـالة ماجستير (غير منشورة)، كلية العلوم الانسانية، جامعة السليمانية،٢٠١٠، ص٦٤.

[٥] حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان: وەزارەتـی کشـتوکاڵ و سـەرچاوەکانی ئـاو، بەڕێوبەرایـەتی کشـتوکاڵی ڕانیـە، بەشـی پلاندانان، ٢٠١٥/١٢/١٩؛ گەشتی هاوکاری لە ڕانیە، ڕۆژنامەی هاوکاری: ژمـارە(٧٨٠)، ل٤؛ بـۆ زانیـاری لەسـەر نـاو و ژمارەی کانی و سەرچاوەکانی ئاو، تایبەتمەندی فیزیایی گرنگترین کـانی و سـەرچاوەکانی ئـاوی لەبـەر ڕۆیشـتوو لە شارۆچکەی ڕانیە. سەیری پاشکۆی ژمارە (١٠) و پاشکۆی ژمارە(١١) بکە.

**٧- دەستی کار**

یەکێک لە سەرچاوە مرۆییەکان، بریتییە لە قەبارەی هێزی کار بۆ هەر وڵاتێک، کاریگەری ئەو سەرچاوەش لە هێزی کار پشت دەبەستێ بە ئاستی فێرکردن و ڕاهێنان، تا ئاستی هونەری و لێهاتوویی ئەو سەرچاوە مرۆییە بەرزبێت بەرهەم زیاد دەکات لە ئابووری وڵاتدا وکاریگەرترین بنەمای هێزی ئابوریە، هەرچەندە گەشەی دانیشتوان پەیوەندی بەگەشەی ئابوریەوە هەیە، بەڵام هەندێک جار کاریگەری خراپی هەیە و دەبێتە هۆی زۆربوونی هێزی دەستی کار، بۆیە پێویستە ئەم زۆربوونە مرۆییە بە شێوازی زانستی سودی لێوەربگیرێت و بەکارببرێت، چونکە تا مرۆڤ زیاد بکات پێویستیشی زیاد دەکا و جوڵەی ئابووری بەهێز دەکات.[١]

لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) بەشی زۆری دانیشتوانی ڕانیە، بە پیشەی کشتوکاڵ خەریک بوون و یەکێک بووە لە سەرچاوە گرنگەکانی پەیداکردنی بژێوی ژیان و جوڵەی ئابوری لە ناوچەکەدا، لە هەندێک کاتدا تاکە سەرچاوەی ئابووری بووە، خەڵکێکی زۆر پێوەی سەرقاڵ بووە و بەشێکی زۆری هاوڵاتیانی شارەکە جوتیار بوون، بەهۆی پشت بەستن بە کشتوکاڵی سەرەتایی و سوودوەرگرتن لە ئاوهەوای وەرزەکانی ساڵ، لە پاڵ کاری جوتیاری کاری تر و پیشە جۆربەجۆرەکانی تریان کردووە. ڕێژەی جوتیار بە جۆرێک بووە لە کۆتایی وەرزی بەهار تا سەرەتای وەرزی پایز خەڵکی شارەکە بەخێزانەوە چوون بۆ سەرزەوییەکانیان لە دەووربەری شار و شاریان چۆڵکردووە یان بەسیستەمی دووماڵەکی درێژەیان بەکاری کشتوکاڵی داوە، هەر لە منداڵێکی تەمەن بچووکەوە، کە توانای کارکردنی هەبووبێ تا دەگات بە مرۆڤێکی پێگەیشتوو بە شێوەی کاری هەرەووزی کاریان لە کێڵگەکانیان کردووە.[٢]

**٨- بازاڕ**

بازاڕ ئەو شوێنەیە، کە بەرهەمە کشتوکاڵی (ئاژەڵی و ڕووەکی) و بەرهەمە پیشەسازییەکانی تیایدا ساغ دەکرێتەوە،[٣] یەکێکە لە گرینگترین بنەما مرۆییەکانی چالاکییە ئابورییەکان، سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی پرۆژە پیشەسازییەکانی ڕاستەخۆ پابەندە بەبازاڕەوە.[٤] شارۆچکەی ڕانیە لە ماوەی (١٩٥٨-١٩٩١) بازاڕی تایبەت بەخۆی هەبووە تاکە سەرچاوەی مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی بەرهەمە کشتوکاڵی و پیشەیی و جوڵەی بازرگانی و ئابوریە جۆربەجۆرەکانی تر بووە لە ناوچەکەدا، بازاڕی ڕانیە جگە لەوەی ناوەندێکی ئابووری بووە بۆ دانیشتوانی شارەکە، لە هەمانکاتدا مەڵبەندێکی

---

[١] د. حمد بن ال الشيخ: الموارد الطبيعية و البيئه، مكتبة العبيكان، المملكة العربية السعودية، الرياض، ٢٠٠٧، ص٢٨١.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ پیرۆت حوسێن مراد: ٢٠١٦/٧/٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٩ ڕانیەیە، دەرچووی شەشی سەرەتاییەو لە ماوەی ١٩٥٨-١٩٩١ پیشەی جوتیار بووە لە ڕانیە؛ بۆ زانیاری لەسەر ژمارەی دانیشتوانی ڕانیە لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بڕوانە بەشی دووەم، باسی یەکەم.

[٣] صالح محمود وهبي: اصول الجغرافية الزراعية، الطبعة الاولى، مطبعة بلا، دمشق، ٢٠٠٠، ص١٢٠.

[٤] كفايه عبدالله عبد العباس العلي: الصناعات الانشائية في محافظة البصره واقعها وآفاقها المستقبلية، اطروحة دكتوراه (غير منشورة)، كلية الاداب، جامعة البصرة، ٢٠٠٥، ص١٤٥.

سـەرەکیش بـووە بـۆ دانیشـتوانی گونـدەکانی دەوربـەری و شـارەدێکانی وەک چوارقورنـە و بێتواتـەو هەندێک جار بنگرد و خەلەکان.[١]

تا ساڵی (١٩٩١) بازاڕی ڕانیە لە گەڕەکی قولە و قەڵاتەوە درێژ بۆتەوە بۆ گەڕەکی سـەرا، لەگـەڵ ڕێگا گشتییەکانی ناوەندی شار، لـە سـاڵی (١٩٧٠) جوڵـەی ئـابووری بـازاڕ زۆر لاواز بـووە، بـەجۆریک هەنـدێک کـات هـەموو ئـەو مرۆڤانـەی بەمەبەسـتی مامەڵـە ڕوویـان کردۆتـە ناوبـازاڕ ژمارەیـان نەگەیشتۆتە (٢٠) کەس، جۆری پێکهاتەی بیناسازی دوکانەکانیش زۆر سـادەبوون زۆریـان بەخشـت و قـوڕ دروسـتکرابوون، زۆرێـک لـە دوکانـەکان لـە مـاوەی سـاڵانی هەشـتاکاندا کـراون بـە چیمـەنتۆ و کۆنکرێت، بە شێوەیەکی گشتی بازاڕ لـە ڕانیـە لـە دوای سـاڵی (١٩٨٠) بـەرەو فراوانـی چـووە، ئەمـەش پەیوەندی بە گەشەی دانیشتوان و دۆخی سیاسی و ئابوری ناوچەکەوە هەبووە.[٢]

**٩- ڕێگەوبان**

ڕێگەوبان وگواستنەوە هۆکارێکی گرنگـە لـە ژیانی مرۆڤدا و کاریگـەری زۆری لەسـەر شـێوازی ژیان و چالاکیەکانی هەیە، بە شێوەیەکی گشتی تا ساڵی (١٩٦٨) لە زۆربەی ناوچەکانی عێراق بـەهۆی خراپـی ڕێگـەوبان ئـاژەڵ بـەکارهاتووە، دواتـر حکومـەتی عێـراق دەسـتی کـردوە بـە چاکسـازی لـە ڕێگەکانی هاتوچۆداو کۆمەڵێک کاری ئەنجامداوە.[٣] لە ماوەی (١٩٥٨-١٩٩١) بەشێکی ناوچەی ڕانیـە و شارەدێ و گوندەکانی، ڕێگەی خاکی ئۆتۆمبیلیان هەبووە بە تایبەت ناوچە تەخت و دەشتییەکان،[٤] لـە ساڵی (١٩٥٠) ڕێگەی خاکی ئۆتۆمبیل لە نێوان ڕانیە و سلێمانی هـەبووە تـا سـاڵی (١٩٧٠) لـە ناوچـەی ڕانیە (٦٩) کم ڕێگەی خاکی هەبووە، دواتریش بە هـۆی خۆمـاڵیکردنی نـەوتی عێراق لـە سـاڵی (١٩٧٢) دا، حکومەتی عێراق، گرنگی زیاتری بە بواری خزمەتگوزاریەداوە.[٥]

لـە دوای سـاڵی (١٩٧٠) ڕێگـەی ڕانیـە یـەکێک بـووە لـە ڕێگـە گرنگـەکانی پارێزگـای سـلێمانی و بەسـتنەوەی ناوچـەی پشـدەر و گەیشـتن بـە سـنورەکانی وڵاتـی ئێـران.[٦] لـە سـاڵی (١٩٧٥) بەرهـەمی کارگەی قیر لە شارەدێی چوارقوڕنە دامەزراوە، کە سـەر بـە یەکـەی ڕێگاوبـانی سـلێمانی و کـەرکوک بووە، ئیش و کارەکانی بریتی بووە لە قیرتاو کردنی ڕێگاوبانەکانی سنوری شـارۆچکە ڕانیـە و قـەزای

---

[١] چاوپێکـەوتنی تـوێژەر لەگـەڵ توفیـق ئیبـراهیم توفیـق: ٢٠١٦/٧/٤، ڕانیـە، نـاوبراو لـە دایـک بـووی ١٩٥٧ ڕانیەیـە و بەکالۆریۆسی هەیە لە بواری کشتوکاڵدا، ئێستا فەرمانبەرە.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ توفیق حوسێن کەریم: ٢٠١٦/٧/١٣، لە ڕانیە، ناوبراو لـە دایک بـوی ١٩٤١وە پێنجوێنـە لـە ساڵی ١٩٥٤ دانیشتوی ڕانیەیە و خوێندی حوجرەی خوێندوەو ئێستا پیشەی دوکانداریيە لە ناوبازاڕی ڕانیە.

[٣] د. خطـاب صـگر العـاني: جغرافيـة العـراق (ارضـا- وسـكانا- ومـوارد اقتصـادية)، دار الحكمـة و النشـر، بغـداد، ١٩٨٨، ص١٨٩.

[٤] بـەڕێوەبەرایـەتی کشـتوکاڵی ڕانیـە: هۆبـەی پلانـدانان، ٢٠١٦/٧/٢٨؛ بـۆ زانیـاری لەسـەر ڕێگەوبانـەکانی ڕانیـە بڕوانـە پاشکۆی ژمارە(١٢).

[٥] شـاد حەمیـد محەمـەد: ڕێگاکـانی ئۆتۆمۆبیـل لـە پارێزگـای سـلێمانی، نامـەی ماسـتەر(بڵاونەکراوە)، کـۆلێژی زانسـتە مرۆڤایەتیەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠، ل ١٥،١٨،٣٠.

[٦] د. شاکر خصباک: المصدر السابق، ص ٥٠٧-٥٠٨.

پشدەر، بەشێک لە ڕێگەو بانی ناوچەکە لە ڕێگەی خاکیەوە کراون بە ڕێگەی قیرتاو[1] لە ساڵی (١٩٧٨) ڕێگەی نێوان ڕانیە و ناوچەی پلێنگانی ڕۆژئاوای ڕانیە بە درێژی (٢١)کم قیرتاو کراوە تا ساڵی (١٩٩٠) زۆرێک لە ڕێگا گشتیەکانی ڕانیە قیرتاوکراون، لە ماوەی جەنگی عیراق- ئێراندا لە ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٨) دا کۆمەڵێک ڕێگای خاکی و قیرتاو لە ناوچەکە دروستکراوە کە زیاتر مەبەست لێی سوود وەرگرتن بووە بۆ بواری سەربازی.[2] بەو جۆرە تا ساڵی (١٩٩١) کۆمەڵێک ڕێگەی قیرتاو لە ڕانیە هەبووە، وەک (ڕانیە- پلنگان، ڕانیە- چوارقورنە، ڕانیە- بێتواتە- ڕانیە - قەڵادزێ، ڕانیە- دوکان- سلێمانی، ڕانیە- کۆیە- هەولێر).[3]

## باسی دووەم/ چالاکی کشتوکاڵی(بەروبوومی ڕووەکی و ئاژەڵی)

### یەکەم/ بارودۆخی چالاکی کشتوکاڵی لە ڕانیەدا

کشتوکاڵ یان پیادەکردنی چالاکییە بەرهەمە کشتوکاڵیەکان لە چەمکە تەسکەکەیدا بە مانای کارپێکردنی زەوی دێت، بۆ بەرهەمە کشتوکاڵییە دیاریکراوەکان، لەگەڵ بایەخدان بە ئاژەڵ بۆ دەستەبەرکردنی کەرەستەی خواردەمەنی.[4] کشتوکاڵ گرنگی دانە بەچاندنی زەوی و هەموو ئەو ئیشوکارانە دەگرێتەوە کە جوتیار پێی هەڵدەستێت لە کێڵانی زەوی و چاندن بۆ بەرهەمهێنانی بەروبوومی ڕووەکی و بەخێوکردنی ئاژەڵ بۆ بەرهەمێنانی شیرەمەنی و خوری و گۆشت و پێستەو بەخێوکردنی پەلەوەر و هەنگ و کرمی ئاوریشم، هەروەها کشتوکاڵ هەموو ئەو بەرهەمانە دەگرێتەوە کە لە کێڵگە ئامادە دەکرێت بۆ بازاڕ.[5]

ناوچەی ڕانیە یەکێکە لە ناوچە کشتوکاڵییە بەپیتەکانی کوردستان لە سەرجەم بوارە سروشتیەکان، بەرزی و نزمی و ئاوهەواو جوری خاک و سەرچاوەی ئاو، ناوچەیەکی گونجاوە و لەبارە بۆ بەگەڕخستنی توانا کشتوکاڵیەکان،[6] لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا شارۆچکەی ڕانیە لە ڕووی کشتوکاڵەوە، ڕووبەرێکی فراوان زەوی لەخۆ گرتووە، بە هەموو بوارە جۆربەجۆرەکانیەوە، لە خشتەی (١٣) دا ڕوبەری زەوی کشتوکاڵی ناوچەکە خراوەتەڕوو بە گوێرەی دواین گۆڕانکارییە کارگێڕیەکان.

---

[1] بەڕیوەبەرایەتی ڕیگاوبانی ڕانیە: ٢٠١٥/١١/١٠.

[2] شاد حەمید محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢، ٣٦، ٣٧.

[3] بەڕیوەبەرایەتی ڕێگاوبانی ڕانیە: ٢٠١٥/١١/١٠.

[4] د. کەمال خەیات: و:نەژاد شمقار، ئابوری کشتوکاڵ (لەگەڵ ئاماژە بۆ ئابوری کشتوکاڵ لە هەرێمی کوردستانی عێراق)، سلێمانی، ٢٠١٣، ل ٤١.

[5] د. عبدالوهاب مطر الداهري: اقتصاد الزراعي: ط٢، دارالكتب، جامعة الموصل، ١٩٨٧، ص٤٣.

[6] ڕەحیم ئیبراهیم ئەحمەد: توێژینەوەی کەرتی کشتوکاڵی لە دەڤەری بیتوێن، کۆنفرانسی پەرەپێدانی دەروازەی ڕاپەڕین، بەهاری ٢٠١٠، ل٩٩.

**خشتەی(١٣) ڕووبەری زەوی کشتوکاڵی شارۆچکەی ڕانیە**

| ژ | جۆری زەوی | ڕووبەربەر بە دۆنم |
|---|---|---|
| ١ | بەراو | ٤١١٠٣ کەرتی گشتی- ٩٧٤٢ کەرتی تایبەت |
| ٢ | دێم(پشتاو)[١] | ٧٤١٨٢ کەرتی گشتی– ١٨٨٨٩ کەرتی تایبەت |
| ٣ | ژێرئاو(مەغمورە) | ٤٦٤٩٢ |
| ٤ | بەردەڵان[٢] | ٦٨١٨٥ |

[١] بەختیار مستەفا محمەد بابان: خاوەندارێتی و کێشەکانی زەوی و زار لەهەرێمی کوردستان و چۆنیەتی چارەسەرکردنی، بێ ناوچاپ و شوێنی چاپ، ٢٠٠٧، ل ٦٠. بەشێک لەم داتایانەی کە بەکارهاتوون هی ساڵی ١٩٨٨.
[٢] بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە: هۆبەی پلاندانان، ٢٠١٦/٧/٢٨.

لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) پیشەی کشتوکاڵ یەکێک بووە لە سەرچاوە گرنگەکانی پەیداکردنی بژێوی ژیان و جوڵەی ئابووری لە ناوچەکەدا، زۆرێک لە جووتیارەکان ئەو زەویەی کاریان تێدا کردووە هی موڵکدارە گەورەکان بووە، بەڕێژەی چواریەک و سێ یەک و نیوە بەرهەم، کاریان تێداکردووە هەندێک لە موڵکدارەکان پارەی کشتوکاڵ کردنیشیان داوە بە جووتیار، بەڵام جووتیار قازانجی کردبێت یاخود نا موڵکدارەکان پارەی خۆیان بە قازانجەوە وەرگرتۆتەوە، بۆیە زۆرجار بە هۆی خراپی بەرهەمهێنانەوە یان زیانی کشتوکاڵی جووتیار چەندین ساڵ کەوتۆتە ژێر باری قەرزداریەوە، بەشێک لە جووتیارەکانیش بەهۆی دابەشکردنی زەویەوە بوون بە خاوەن زەوی، تا ڕادەیەک ژیانیان باشتربووە لە جوتیارانی تر و بەشێوەیەکی گشتی ژیانی جووتیار تا ساڵی (١٩٧٥) لە ڕانیە ژیانێکی هەژارانە بووە نەمردن نە ژین، بەڵام دواتر بەهۆی گۆڕانکاری سیستەمی ئابووری و گۆڕانکاری لە سیستەمی ئەو خۆراکەی، کە دەوڵەت لە ڕێگەی بریکارەکانەوە دابەشی کردووە تا ڕادەیەک باشتربووە.[١]

بازاڕ و مامەڵە بە بەرهەمە کشتوکاڵیەکان کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ هەبووە، چونکە بازاڕ لایەنی دووەمە لە لایەنەکانی بەرهەمهێنان، کە لایەنی یەکەم بریتیە لە کێڵگە بەشێوەیەکی گشتی بەرهەمهێنان پشت بە بازاڕ دەبەستێ.[٢] شارۆچکەی ڕانیە بە هۆی ئەوەی لە ماوەی (١٩٥٨-١٩٩١) دا بازاڕی تایبەت بەخۆی هەبووە و لە ڕووی ڕێگاوبان و گواستنەوە تاڕادەیەک باش بووە، شوێنێک بووە بۆ ساخکردنەوەی بەرووبومە کشتوکاڵییەکانی ناو ڕانیە و شارەدێ و گوندەکانی دەوروبەری، هەرچەندە بەهۆی خراپی ڕێگاوبانەوە تا ساڵی (١٩٧٥) زۆربەی کات تەنها ئاژەڵ بۆ گواستنەوەو مامەڵەی بەرووبومە کشتوکاڵییەکان بەکارهاتووە، دواتر بەهۆی زیادبوونی ئۆتۆمبیل و تراکتۆر، گواستنەوە بە ئاژەڵ کەمیکردووە، وەک ئاشکرایە بەشێک لەو

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەلیم سلێمان تۆفیق: ٢٠١٦/٨/٥، ڕانیە، ناوبراو لە دایکبوی ١٩٤٣ڕانیەیە، تا قۆناغی ناوەندی خوێندووە، لە ماوەی ١٩٥٨-١٩٩١ پیشەی دوکانداری و جوتیار بووە لە ڕانیە.
[٢] د. خطاب صگر العاني: المصدر السابق، ص١٨٩.

بەرهەمە کشتوکاڵیەی کە لەناوچەی ڕانیە کراوە زیاتر بەرهەمێکی خۆبژێوی بووە، جووتیار تەنها کە بەرهەمی زیادبوبێت فرۆشتوویەتی، لەڕانیە تا ساڵی (١٩٧٥) مامەڵەی بەروبوومی کشتوکاڵییە خۆراکیەکان شمەک بەشمەک بووە، ئەم مامەڵە بە جۆرێک بووە هەندێک کات بەرووبومێکی کشتوکاڵی بەرامبەر کەلوپەلێکی پێویستی ژیان بووە و هەندێک جاری تریش هەبووە بەرامبەر بەرهەمێکی تری کشتوکاڵی بووە، وەک (گەنم و جۆ بە میوە) کە لەنێوان دۆڵی خوشناوەتی و شاوریێ خەڵکی دەشتی بیتوێن زۆرباوبووە، لە دوای ساڵی (١٩٧٥) جگە لەم جۆرە مامەڵەیە، مامەڵەی دراوی پەرەی سەندووە فروشتن ڕاستەوخۆ بە دراو بووە، جووتیار بە دوکاندار و ئەویش بە کڕیار.[١]

جۆری زەوی و ویستی جووتیار هەمەچەشنی داوە بە بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی ڕانیە، بەشێک لە گوندەکانی دەوروپشتی ڕانیە، شیرەمەنیان بۆ ناو شار هێناوە و بەشێکی تریان سەوزە و میوەو بەروبوومە دانەوێڵەکانیان هێناوە، بۆ نمونە گوندی بۆسکێنی نزیک ڕانیە یەکێک بووە لە دابینکەرەکانی بەرووبومی سەوزەی تەماتە لە هاویناندا، هەندێک جاریش هەبووە بەرووبومی کشتوکاڵی لە ناوچەکانی تەقتەق و پردێوە هاتووە بۆ ڕانیە بەتایبەت سەوزە، لە دوای ساڵی (١٩٨٠) حکومەت بۆ ڕێکخستنی کاروباری بەرهەمە کشتوکاڵییەکان عەلوەی لە ڕانیە کردۆتەوە، بەڵام دواتر داخراوە.[٢]

لەڕووی گرنگیدانی دەوڵەت بەکەرتی کشتوکاڵ، ڕانیەش وەک هەر ناوچەیەکی تر عێراق کەوتۆتە ناو ئەو سیاسەتی ئابووریەی کە حکومەتە یەک لە دوایەکەکانی عێراق لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٩١) پەیڕەویان کردووە، هەرچەندە مێژووی دامەزراندنی بەشێک لە فەرمانگەکان دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی (١٩٥٨) و لە ساڵی (١٩٤٢) لیژنەی پشکنینی تووتن لەڕانیە دامەزراوە، دواتر لە ساڵی (١٩٥٦) فەرمانگەی کشتوکاڵی لە ڕانیە کراوەتە بەمەبەستی گرنگیدان بە بواری کشتوکاڵی لە ناوچەکەدا.[٣] لە سەردەمی کۆماریشدا لەساڵی (١٩٧٠) بنکەی شەتڵگەی تووتنی ڤەرجینی لە گوندی گردجانی نزیک ڕانیە کراوەتەوە، بە مەبەستی دابینکردنی شەتڵی تووتن بۆ جووتیارانی ناوچەکە و بەم کارە خزمەتێکی زۆری جووتیارانی ناوچەکەیان کردووە.[٤]

لە ساڵی (١٩٧٩) لقی بانکی ڕەشید لە ڕانیە کراوەتەوە و ئەم بانکە لە ڕێگەی مامەڵەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی ناوچەکە وەک خاڵی گەیاندنی پێوستییە دراوییەکان وابووە لە نێوان جووتیار و حکومەتدا، جووتیاران سودیان لێی بینیوە،[٥] لە چوارچێوەی کارەکانی حکومەتدا لە ماوەی ساڵانی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر جیهاد سدیق: ٢٠١٦/٨/٥، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤٧ ڕانیەیە و تاقوناغی ئامادەی خوێندووە، پیشەری جوتیار و فەرمانبەری بووە، ئێستا خانەنشینە.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ توفیق ئیبراهیم توفیق:٢٠١٦/٧/٤.

[٣] فەخریە ئیسماعیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠؛ بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە، بەشی پلاندانان، ٢٠١٥/١٢/١٥.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ڕەحیم ئیبراهیم ئەحمەد:٢٠١٦/٧/٣٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٥ پشدەرەو بەکالۆریۆسی هەیە لە کشتوکاڵدا، ئێستا بەڕێوبەری وێستگەی توێژینەوەی کشتوکاڵی گردجانە.

[٥] عمر محمد امین: دیدارێکی بانکی ڕەشیدی ڕانیە، ڕۆژنامەی پاشکۆی عێراق، ژ(١١٣)، ١٩٨٩/١١/٢٩، ل٤.

(١٩٧٥-١٩٧٦) پرۆژەی دارستانی دەستکردی کێوەڕەش بە ڕووبەری (٦٠٠) دۆنم بە داری (سنوبەر، سەروو) لە رۆژهەڵاتی ڕانیە داچێنراوە لە ڕوی ژینگەییەوە جوانیەکی زۆری بەناوچەکە بەخشیوە.[١] لە دوای ساڵی (١٩٧٥) حکومەتی عێراق بەکاریگەری بیری شۆسیالستیی هەستاوە بە دروستکردنی کۆمەڵەی هەرەوەزی، لەم چوارچێوەیەدا لە ڕانیە (٦) کۆمەڵەی هەرەوەزی دروستکراوە، زەوی و سەرمایە و ئامێرەکشتوکاڵییەکان دراوە بە جووتیاران بە شێوەی هەرەوەزی و دابەشکاری لە بەرهەمی گشتی کاریان تێیدا کردووە، تا ماوەیەک بە ردەوامی هەبووە، بەڵام دواتر سەرکەتوو نەبووە و کۆتایی پێهاتووە.[٢] لە ڕوی ئاودێریشەوە لە ساڵی (١٩٨١-١٩٨٣) حکومەت هەستاوە بە دروستکردنی پڕۆژەی ئاودێری کۆنکرێتی ئاوی قولە، بە مەبەستی بەراوکردنی زەویەکانی دەوربەری ڕانیە، بە چوار جۆگەی کۆنکرێتی ئەم کارەی کردووە جۆگەی شێخ حسێن بۆ بۆسکێن، پڕۆژەی سەیداوا بۆ بۆسکێن، پڕۆژەی قەڵات بۆ پیاوکوژان، قەڵات بۆ سەیداوا، لە ساڵی (١٩٨٦) دوو پڕۆژەی ئاودێری کۆنکرێتی تری دروستکردووە، پڕۆژەی کویرەکانی- گردەدێمە و پڕۆژەی سەروچاوەی کانی ماران، لەگەڵ دروستکردنی چەندین پڕۆژەی تری قوڕ لەم ماوەیەدا.[٣]

بە شێوەیەکی گشتی سیاسەتی حکومەت بۆ بواری کشتوکاڵ لە ڕانیە لە ئاستێکی ناوەنددابووە بە پێی ماوە و ساڵ گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، خزمەتگوزاری حکومەت لەم ماوەدا زیاتر خۆی لە دابینکردنی پەینی کیمیایی و تۆیی ڕووەکی و دەرمانی کشتوکاڵی بینیوەتەوە، هەندێک جاری تر لە دابینکردنی ئامێری کشتوکاڵی بە تایبەت لە دوای ساڵی (١٩٧٠) ەوە ئەو جووتیارەی کە مەرجی تێدا بوایە و ئەندام بووە لە کۆمەڵەی هەرەوزە کشتوکاڵیەکان، کە بەشێک بووە لە فەرمانگەی کشتوکاڵی ڕانیە، پشتگیری دراوەتێ بۆ کۆمپانیای گشتی ئامێرە کشتوکاڵییەکان کە مەڵبەندەکەی لە ئەسکندەریەی بەغدا بووە و ئامێری پێدراوە، قەرزی بانکی کشتوکاڵیش بە هەمان شێوە لە ڕێگای کۆمەڵەی هەرەوزی جووتیاری پێشینەیان پێدراوە.[٤]

لە ڕووی کێشەی کشتوکاڵەوە ئەم ناوچەیەش وەک هەر ناوچەیەکی تر کۆمەڵێک کێشەی هەبووە، زیانە سروشتیەکانی وەک کەمی باران بارین یان زۆری دابارین و دروستبوونی لافاو، لە ساڵی (١٩٦٢) لافاوێکی گەورە ڕانیەی گرتۆتەوە و زیانێکی زۆری بە کشتوکاڵ و زەویە کشتوکاڵییەکان گەیاندووە، لافاو دووجاری تریش لە ساڵانی حەفتاکان ڕوویداوە، لەگەڵ دیاردەی نەخۆشی بەروبومی کشتوکاڵی و هاتنی بەڵای کشتوکاڵی لە هەندێک ساڵدا، وەک دابارینی حەشەرەی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مەولود سوفی بابەکر: ٢٠١٦/٧/٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٣ بنگردەو دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵە، ئێستا فەرمانبەرە لە بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە.

[٢] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ عەلی حەمە ئیبراهیم: ٢٠١٦/٧/٢٩.

[٣] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیە، بەشی پلاندانان، ٢٠١٥/١٢/١٩.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سالح حوسێن سالح: ٢٠١٦/٧/١٣، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٧ ڕانیەیە و بەکالۆریۆسی هەیە لە کشتوکاڵ، ئێستا بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی ڕانیەیە.

کولله له کۆتایی پەنجاکاندا، کە بەشێوەیەک بووە ئاسمانی ناوچەکەی داپۆشیووە و حکومەت بە هێلیکۆپتەر دەرمانی ڕشاندووە، گیروگرفتێکی تر بریتی بووە لە کەمی مەوادی کیمیایی و جۆرەکانی جووتیاری ناچارکردووە پەینی ئاژەڵ بەکاربهێنێ. ئەمە جگە لە نەبوونی و کەمی ئامێری کشتوکاڵی، هەرچەندە لە ساڵی (١٩٤٨) تراکتۆر و لە ساڵی (١٩٥٤) دەڕاسە لە لایەن شێخ حوسێنی بۆسکێن هێنراوە بۆ ڕانیە، بەڵام ڕێژەی ئامێری کشتوکاڵ زۆر کەم بووە، تا ساڵی (١٩٧٠) ئاژەڵی گاجووت و گوێدرێژ بۆ کێڵان بەکارهاتووە، کشتوکاڵ زۆر سەرەتایی بووە، بە شێوەیەکی گشتی گیروگرفتە کشتوکاڵییەکانی ناوچەکە بریتی بووە لە:(کەمی بەکارهێنانی ئامێر، کەمی پەینی کیمیایی، پەیڕەونەکردنی شێوازی زانستی، نەبوونی تۆ لەجۆری باش، کەمی دەرمان، داڕمان و نەخۆشی خاک، کەمی بەرهەمهێنان، خراپی دۆخی جوتیار، چەوسانەوەی چینایەتی و کێشەی موڵکداری، هتد)،[1] هۆکارە سیاسییەکانیش ئاستەنگێکی تربوون لەبەردەم بەرەو پێشچوونی کشتوکاڵ لە ناوچەکە، لە ماوەی ساڵانی (١٩٦١-١٩٧٠) ناوچەی ڕانیە بەردەوام شەڕی تێدا بووە و زیانێکی زۆری مرۆیی و سروشتی بە بواری کشتوکاڵ گەیاندووە،[2] لە نێوان ساڵی (١٩٧٥-١٩٧٧) دا ڕێژەی کۆچکردنی دانیشتوانی گوند بۆ شار لە ڕانیە دا(-٠,٦%) بووە بەڕێژەیەکی بەرچاوکەم بووە،[3] بەڵام دواتر بە هۆی سیاسەتی ڕاگواستن، بەشێکی زۆری گوندە سنوورییەکانی کوردستان چوڵکران و لەبەرهەم هێنانی کشتوکاڵ دوورخرانەوە و لەئوردوگا زۆرەملێکان نیشتەجێکران.[4] لە ڕانیە، ئۆردوگای ڕانیە و چوارقورنە دروستکراوە، ئەو جوتیارانەی کە ڕاگوێستراوون لەناو شارۆچکەکە کراون بە فەرمانبەری حکومی، فەرمانگەی وا هەبوو لە ڕانیە پێنج کەسی بەناوی کارگوزارەوە بۆ دامەزراوە، بە مەبەستی ڕازی کردنی خەڵک و دورخستنەوەیان لە پیشەی کشتوکاڵی، ئەم کارە لە ڕووی ئابوورییەوە پێی وتراوە: (البطالة المقنعة)، کە زیانی زۆری لە کشتوکاڵی ناوچەکە داوە.[5]

هەرماوەی ساڵانی (١٩٨٠- ١٩٨٨) لە ڕانیەدا بەهۆی شەڕی عێراق-ئێران ئەم کەرتە لەلایەن حکومەتەوە تەواو پشتگوێ خراوە و بەرەو لاوازی ڕۆیشتووە،[6] لە ساڵی (١٩٨٨) حکومەتی عێڕاق لە کاتی ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال و لێدان لە بزووتنەوەی نەتەوەی کوردی، بە ناوی پاراستنی ئاسایش کۆمەڵێک هەنگاوی نا، کە زیانی زۆری بەر کەرتی کشتوکاڵ لە ناوچەکەدا گەیاندوە،

---

[1] مەحمود عومەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥؛ د.كمال محمد سعيد الخياط، القطاع الزراعى فى العراق، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٧٠، ص ١٢٠-١٦٠؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ پیرۆت حوسێن مراد: لە ٢٠١٦/٧/٩.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سالح حوسێن سالح: ٢٠١٦/٧/١٣.

[3] د.خليل اسماعيل محمد: الاستيطان الريفي فى العراق، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٣، ص٥٥.

[4] د.فائیق گوڵپی: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧٦.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدولرەحمان حەسەن عوسمان: ٢٠١٦/٧/١١، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٤ ڕانیەیە و بەکالوریۆسی هەیە لە ئابوری و ئاماردا، پیشەی فەرمانبەرە لە بەڕێوبەرایەتی ئاماری ڕانیە.

[6] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سالح حوسێن سالح: ٢٠١٦/٧/١٣.

هەنگاوەکانیشی بریتیی بوون لە مینرێژکردنی کەرتە کشتوکاڵییەکانی(٣٤/چولیاوا، ٤٣/گەرمکە داڵ، ٢٥/سەرخمە، ٣٨/قورە بەرازە، ١١/گولەک، ٣٩/پوکە)، وێرانکردنی (١٢) گوند لە ڕانیە و بێتواتە.[١]

بە شێوەیەکی گشتی سیستەمی موڵکدارییەتی زەوی لە باشووری کوردستان تا ساڵی (١٩٥٨) سیستەمێکی دەربەگایەتی بووە، جووتیار کەمترین مافی هەبوو و بۆ بژێوی ژیانی ناچار بوو هەموو بەرهەمی خۆی بدات بە خاوەن موڵک و دەلاڵ و سووخۆر و بازرگانەکان، کێشەی زۆر هەبووە لە نێوان جووتیار و دەرەبەگەکان بە تایبەت لە گوندەکان،[٢] ئەوەی پەیوەستبووە بە چاکسازی کشتوکاڵ و کیشەی زەوی و زار لە ناوچەکە، لە ساڵی (١٩٥٨) کاتێک سیستەمی سیاسی عێراق لە پادشایەوە بۆ سیستەمی کۆماری گۆڕا، سەرکردەی شۆڕش عەبدولکەریم قاسم ئاماژەی بەوەدا ئەم قۆناغە قۆناغی کۆتای هاتنە بە سیستەمی دەرەبەگایەتی لە عێراق،[٣] لە (١٩٥٨/٩/٣٠) حکومەتی کۆماری یاسای ژمارە (٣٠) چاکسازی کشتوکاڵی دەرکرد، کە تیدا خاوەنداریەتی زەوی بە (١٠٠٠) دۆنم بۆ بەراو یان (٢٠٠٠) بۆ پشتاو دیاریکرد، بەڵام ئەم یاسایە بەهۆی تێکچونی دۆخی سیاسی و زاڵبونی سیستەمی دەربەگایەتی لە ڕانیە و ناوچەکە نەتوانراوە جێبەجێبکرێت.[٤]

لە ساڵی (١٩٧٠) حکومەت جارێکی تر هەستاوە بە دەرکردنی یاسای ژمارە (١١٧) و جێبەجێ کردنی ئەم یاسایە تەوای عێراقی گرتەوە،[٥] بەڵام لە ڕانیە و کوردستان بەتەواوەتی جێبەجێ نەکرا، بۆیە حکومەتی عێراق جارێکی تر لە ساڵی (١٩٧٥) یاسای ژمارە (٩٠) تایبەت بە ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان دەرکرد، کە ئەم یاسایە لەم قۆناغەدا بە تەواوەتی لە ڕانیە جێبەجێ کراوە، زەوی دابەشکراو بە شێوەی (سند تملیک) دراوە بە جوتیاران، بەهۆی زاڵبوونی دەسەلاتی ناوەندی و لاوازبوونی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی یاساکە، لەگەڵ دەرچوونی بەزۆرەملێ کراوە و هیچ بواریکی تێدا نەبووە هەڵبژاردن بدات، بەرزترین ڕێژەی خاوەنداریەتی زەوی لە موڵکدارە گەورەکانی بۆ (٤٠ )دۆنم بەراو یان (٣٠٠) دۆنم پشتاو کەم کردۆتەوە، ئەو زەویانەش کە بە هەر هۆیەک بێت دابەشکردن نەی گرتبوونەوە واتا (بحث و توزیع) تێدا نەکراوە، زەویەکە بە پەیوەست بە جووتیاران دراوە. بە شێوەیەکی گشتی لە ماوەی ساڵی (١٩٥٨-١٩٩١) دا لە ڕوی پێکدادانی نێوان جووتیار و

---

[١] بەختیار مستەفا محمەد بابان: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦، ٦٤.

[٢] ا.م.مینتیشاشڤیلی: کورد(کورتەی پەیوەندی کۆمەلایەتی و ئابوری و ڕۆشنبیری گوزەران)، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٨، ل٢١٦.

[٣] الان ممتاز نوری: مشكلات الملكية الزراعية و دورها في اعاقة التنمية الزراعة في اقليم كردستان العراق للسنوات ١٩٩١-١٩٩٥، رسالة ماجستير(غير منشوره)، كلية الادارة و الاقتصاد، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٦، ص ٩٤.

[٤] قانون الاصلاح الزراعي رقم: (٣٠)، المصدر السابق.

[٥] د. صلاح الدين محمد: اسماعيل علي شكر: القطاع الزراعي و اهمية فى تحقيق الامن الغذائي، دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠، ص ٢٦-٢٧.؛ بۆ زانیاری زیاتر لە سەر برگە و مادەکانی قانونی (١١٧) بڕوانە: قانون الاصلاح الزراعي، رقم (١١٧)، الوقائع العراقية، العدد (١٨٨٤) في ١٩٧٠/٥/٣٠.

مۆلکدار کەمترین بەریەکەوتن هەبووە، ئەمەش بەهۆی ناجێگیری باری سیاسی کە بواری بەم کارە نەدەدا و جووتیار بە ناچاری غەدری مولکداری قبولکردووە.[١]

**دووەم/ بەروبوومە کشتوکاڵیەکان(ڕووەکی و ئاژەڵی)**

بەرهەمهێنانی بەروبوومی کشتوکاڵی بەسەر سێ کۆمەڵەی بنچینەییدا پۆلێن دەکرێت، کە بریتین لە: (بەروبوومی کێڵگە، بەروبومی باخداری، بەروبوومی ئاژەڵی)،[٢] ڕانیە و دەشتی بیتوێن یەکێکە لەو ناوچانەی بە هەمەجۆری بەروبوومی کشتوکاڵی ناسراون، بەڵام لە ماوەی ساڵی (١٩٥٨-١٩٩١) لە ڕانیە بە شێوەیەکی سەرەکی چوارجۆر بەروبومی داچێنراو هەبووە، (گەنم و جۆ، توتن و گوڵەبەڕۆژە)،[٣] گرنگترین بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی ڕانیە دابەش دەبن بە سەر چەند جۆرێکدا، کە گرنگترینیان بریتین لە:

**١- بەرهەمە خۆراکیەکان**

**أ- گەنم**

یەکێکە لەگرنگترین دانەوێڵە جیهانیەکان و لە زۆرێک لە ناوچەکانی عێراق دەچێنرێت و لە بەروبومە ستراتیژییەکانی باشووری کوردستانە،[٤] دەشتی ڕانیە لە ڕووی ئاوهەواوە یەکێک بووە لە ناوچە گونجاوەکان بۆ چاندنی گەنم،[٥] کە بە یەکێک لە گرنگترین دەشتەکانی بەرهەمی گەنم دادەنرێت.[٦] هەتا لە کاتی وشکەسالیشدا بەرهەمی گەنمی هەر هەبووە لە ساڵی (١٩٧٧) ڕووبەری بەگەنم چێنراو لە ڕانیە (٣٢٩١) دۆنم بووە، بەهۆی گونجاوییەوە لە ساڵی (١٩٩٠) ڕووبەری زەوی بەگەنم چێنراو گەیشتۆتە (٥٩٦١١) دۆنم، لە ساڵی (١٩٩١)دا بە هۆی گەمارۆدانی ئابووری بۆ (٢٦٥٢١٣) دۆنم بەرزبۆتەوە، کە ئەمەش بەپێتی ناوچەکە دەردەخات بۆ چاندنی ئەم بەرووبومە،[٧] دانەوێڵەی گەنم لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا سەرەکیترین بەرووبومی چێندراو بووە، بە شێوەی پشتاو و بەپشت بەستن بە ئاوی باران داچێنراوە و تاکە سەرچاوەی خۆراک بووە لە ناوچەکەدا، بە چەندین

---

[١] قانون الاصلاح الزراعي: رقم(٩٠)، الوقائع العراقية: رقم العدد (٢٤٧٥) في١٩٧٥/٦/٩.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەلی حەمە ئیبراهیم: ٢٠١٦/٧/٢٩.؛ بۆ زانیاری زیاتر لە ڕێکخستنەکانی حکومەت لە زەویە کشتوکاڵییەکانی ڕانیە لە ڕووی جۆر و ناوچەو ژمارەی کەرتەوە، بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١٣) کە بەشێک لە پۆلێنکاریەکان بۆ سەردەمی پاشایەتی لە عێراق دەگەڕێتەوە.

[٢] د. مخلف شلال مرعي: د.ابراهيم محمد حسون القصاب: جغرافية الزراعية، دار بن الاثير، الموصل، ١٩٩٦، ص١٤٢.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سالح حوسێن سالح: ٢٠١٦/٧/١٣.

[٤] مەحمود کەریم ئەحمەد: بەرهەم هێنانی گەنم لە هەرێمی کوردستان(١٩٨٩-١٩٩٨) پارێزگای سلێمانی وەک نمونە، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٣٨.

[٥] لەنجە سەلاح عەبدولکەریم: شیکردنەوەیەکی جوگرافی بۆ بەرهەم هێنانی گەنم و جۆ لە پارێزگای سلێمانی لە نێوان ساڵانی ١٩٩٧-٢٠٠٥، چاپخانەی ئاوێنە، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٤٩، ٥٣.

[٦] ساکار محەمەد حەسەن گەردی: ڕۆڵی دانەوێڵە لە دەستەبەرکردنی ئاسایشی خۆراک لە هەرێمی کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٧٣-٧٤.

[٧] لەیلا محەمەد قارەمان: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.

شێوە سوودی لێوەرگیراوە، وەک (گەنمە کوتاو، ساوار، نانی ئارد، برویش، هتد)، ئەو برە داهاتەی کە جوتیار پێویستی پێبووە بۆ خۆی هەڵیگرتووە، وەک بنە تۆ و خۆراک، ئەوەی تری خستۆتە بازاڕ، یان لە لایەن لیژنەی کڕینی دەوڵەتەوە گەنمەکە لە جووتیاران کڕدراوەتەوە، گرنگترین جۆرەکانی گەنم لە ڕانیە بریتی بووە لە: (قەندەهاری، گەنمە گەورە، گوڵ ڕەش، سابیر بەگ، مەکسیپاک، گوڵ ڕووت)،[1] شێوازی بەرهەمهێنانی گەنم لە ڕانیە لە ئاستێکی زۆر پێشکەوتودا نەبووە تا ساڵی (١٩٧٠) زیاتر ئاژەڵ بۆ کێڵان و داس و مەڵەغانیش بۆ دروێنە بەکار هاتووە، بەڵام دواتر ئامێری تراکتۆر و دەڕاسە بەکارهاتووە.[2]

**ب– جۆ**

یەکێکە لە بەروبوومە زستانییە گرنگەکان، چاندنی جۆ لە عێراقدا لە دوای گەنم بە پلەی دووەم دێت و وەک مادەیەکی بنەڕەتی بەکاردێت بۆ ئالیکی ئاژەڵ، هەندێ جاریش مرۆڤ وەک خواردەمەنی بەکاری دەهێنێت.[3] لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨–١٩٩١) دوو جۆر جۆ لە ڕانیە داچێنراوە جۆی ڕەش و جۆی سپی، ساڵانەش بنەتۆی لێگیراوە و دووبارە داچێنراوەتەوە،[4] لە سەیرکردنی خشتەی(٢) ئەوە دەردەکەوێت لە ساڵانی (١٩٦١–١٩٦٢) ڕووبەری داچێنراو بە جۆ لە ڕانیە و شارەدێی سەنگەسەری سەر بە ڕانیە (١٠٠٠٠) دۆنم بووە، لە ساڵانی (١٩٦٢–١٩٦٣) بە ڕانیە و شارەدێی سەنگەسەر و چنارانی سەر بە شارۆچکەی ڕانیە زەوی داچێنراو بەرز بۆتەوە بۆ (١٠٥٠٠)دۆنم، بەڵام لە ساڵی (١٩٧٧) ئەم ڕێژەیە کەمی کردووە ڕووبەڕی بە جۆ داچێنراو لە ڕانیە دابەزیووە بۆ (١٠٨٦) دۆنم، ئەم بەرزی و نزمیەش لە داچاندندا بو هۆکاری سیاسی و ئابوری و خواستی جووتیار دەگەڕێتەوە.

**ج– برنج**

برنج بەگشتی پێویستی بە پلەی گەرمی بەرز هەیە و هەندێک جار گەر پلەی گەرمی لە (٢٠) پلەی سەدی کەمتر بوو باش گەشەناکات، پلەی گەرمی گونجاو بۆ برنج لە نێوان (٢٤–٢٧) پلەی سەدییە، پێویستی بە ئاوی زۆر و پەینی کیمیایی هەیە و بەردەوام دەبێت ئاوی لێنەبڕێت و ئاوی لە ناودابێت، ماوەی (٤) مانگی پێویستە تاپێدەگات،[5] لە ڕانیە دا برنج لە شێوەی چەڵتووک لە بەهاراندا داچێنراوە، لە هەندێک شوێن بە شێوەی ڕووبەری (٦) دۆنمی بووە، لە ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوەکەدا، لە گوندی بۆسکین و سەرکەپکان و دەوروبەری گردجان و کانیماران و سەروچاوە، بە شێک لە

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، عومەر جیهاد سدیق: ٢٠١٦/٨/٧

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ، پیرۆت حوسێن مراد: لە ٢٠١٦/٧/٩؛ بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ڕووبەری زەوی داچێنراو بەگەنم لە ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوەکەدا سەیری خشتەی (٢) بکە.

[3] هێمن حسێن اسماعیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عومەر جیهاد سدیق: ٢٠١٦/٨/٧.

[5] د. محمد محمود ابراهيم الديب: الجغرافية الاقتصادية، مكتبة الانجلوا المصرية، ١٩٩٢، ص٢٠٥.

شاردێکانی سەر بە شارۆچکەی ڕانیەدا داچێنراوە، گرنگترین جۆرەکانیشی گوڵ سور و گوڵ سپی، دەنک خڕ بووە، بەشێک لە چەڵتووک لە شارەزوورەوە بۆ ڕانیە هێنراوە.[1]

بەسەرنجدان لە خشتەی (١٤) دەردەکەوێت کە داچاندنی برنج لە ساڵانی (١٩٥٩–١٩٦٠) لە شاردێی میرزا ڕۆستەم و سەنگەسەری سەر بە ڕانیە (٦٥٠) دۆنم بووە، لە ساڵانی (١٩٦١–١٩٦٢) بە سەنتەری ڕانیە و شارەدێی سەنگەسەر کەم بۆتەوە بۆ (٨٠) دۆنم، چاندنی برنج بەردەوامی هەبووە، لە ساڵانی (١٩٧٤–١٩٧٥) بە هەردوو شارەدێی چوارقورنە و بنگردی سەر بە شارۆچکەی ڕانیە ڕووبەری داچێنراو بە برنج بۆتە (١٧٦) دۆنم، هۆکاری بەرزی و نزمی داچاندنی برنج لە ڕانیە دەگەڕێتەوە بۆ خواست و خستنەڕووی بەرهەم و هۆکاری ئاووهەوا و دۆخی سیاسی و گۆڕانکاریە ئیداریەکان لە ناوچەکە وەک لابردنی هەندێک شارەدێ لە سەر کارگێڕی شارۆچکە کە.

**خشتەی (١٤) بەرهەمی چێنراوی دانەوێلە لە شارۆچکەی ڕانیە**

| شارۆچکە | ساڵ | شارەدێ | بەروبووم | ڕووبەری چێنراو بە دۆنم | بەرهەم بە تەن |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕانیە | ١٩٥٩- ١٩٦٠ | میرزا رۆستەم | برنج | ١٠٠ | ١٤.٤٠٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٥٥٠ | ٣٥٨.٥٠٠ |
| | | | کۆ | ٦٥٠ | ٣٧٢.٩ |
| | ١٩٦١- ١٩٦٢ | سەنتەر | جۆ | ٦٠٠٠ | ١٥٠٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٤٠٠٠ | ١٠٠٠ |
| | | سەنتەر | برنج | ٥٠ | ٢٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٣٠ | ١٢ |
| | | کۆ | | ١٠٨٠ | ٢٥٣٢ |
| | ١٩٦٢ – ١٩٦٣ | سەنتەر | گەنم | ١٠٠٠٠ | ١.٥٠٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٦٠٠٠ | ٩٠٠ |
| | | چناران | | ٣٥٠٠ | ٤٥٥ |
| | | سەنتەر | جۆ | ٥٠٠٠ | ٣٠٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٣٥٠٠ | ١٢٢ |
| | | چناران | | ٢٠٠٠ | ٦٠ |
| | | کۆ | | ٣٠٠٠٠ | ٣٣٣٧ |
| | ١٩٧٣ – ١٩٧٤ | سەنتەر | گەنم | ٣١٥٩ | ٣٥٤.١ |
| | | سەنتەر | جۆ | ١١٤١ | ٢٤٦.١ |

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مەحمود سەعید سابیر: ٢٠١٦/٧/٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٤١ ڕانیەیە و تا قۆناغی سەرەتای خوێندووە، لە منداڵیەوە پیشەی جوتیاری بووە لە ڕانیە، ئێستا خانەنشینە.

| شارۆچکە | ساڵ | شارەدێ | بەروبووم | ڕووبەری چێنراو بە دۆنم | بەرهەم بە تەن |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | کۆ | | ٤٣٠٠ | ٦٠٠.٢ |
| | ١٩٧٤- ١٩٧٥ | سەنتەر | گەنم | ٢٦١٦ | ٣٦٠.٧ |
| | | سەنتەر | جۆ | ١٤٩٨ | ٢٠٢.٠ |
| | | ٢چوارقوڕنە | چەلتوک | ١٧٦ | ٣٠١.٢ |
| | | بنگرد | | | |
| | | کۆ | | ٤٢٩٠ | ٨٦٣.٩ |
| | | | | | |
| | ١٩٧٧ | سەنتەر | گەنم | ٣٢٩١ | ٣٢٦.٠ |
| | | سەنتەر | جۆ | ١٠٨٦ | ٢٣١.٨ |
| | | کۆ | | ٤٣٧٧ | ٥٥٧.٨ |

مصدر:وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام،١٩٦٠، ص٨١؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام، ١٩٦١-١٩٦٢، ص ١٩-٩٠؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام، ١٩٦٢-١٩٦٣، ص٣٠-٣٤؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام،١٩٧٣-١٩٧٤، ص١١،٢٤؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام، ١٩٧٤-١٩٧٥، ص١٦،٤؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام، ١٩٧٧، ص١٠،٢١.

**د- پاقلەمەنیەکان**

بەشێوەیەکی گشتی لە شارۆچکەی ڕانیەدا، جگە لە بەرووبومی گەنم و جۆ و برنج، چەندین جۆری دیکەی بەرووبومی کشتوکاڵی بەرهەم هاتووە، یەکێک لەو بەروبوومانەش بەرووبومە پاقلەمەنییەکانن کە پێکهاتووە لە بەرهەمی پاقلەمەنی هاوینە وەک (ماش و لۆبیا)، هەروەها بەرهەمی پاقلەمەنی زستانە وەک (نۆک و نیسک)، لێرەدا بەپێی ئەو زانیاریانەی دەستمان کەووتوە، لەخشتەی (١٥) دا دەخەینەڕوو، لە وەرزی چاندنی (١٩٥٩- ١٩٦٠) تەنها بەرهەمی ماش چێنراوە، کە کۆی ڕوبەری چێنراو بە شارۆچکەی ڕانیە و شارەدێی سەنگەسەر(٣٥) دۆنم بووە، بەڵام لەوەرزی چاندنی (١٩٦١ - ١٩٦٢) کۆی ڕوبەری چێنراو بە بەرووبومە پاقلەمەنییەکان بە ڕانیە و شارەدێی سەنگەسەر (١١٥) دۆنم بووە، لە ڕووی ڕووبەری داچێنراو بەرهەمی ماش بە پلەی یەکەم هاتووە، (٥٥) دۆنم بووە و نیسک (٤٠) دۆنم و لۆبیا لەپلەی کۆتایی بووە تەنها (٢٠) دۆنم بووە، سەبارەت بەوەرزی چاندنی (١٩٧٣ -١٩٧٤) دا بە ڕانیە و شارەدێی بنگرد و چوارقورنە (٢٢٠٠) دۆنم داچێنراوە، لەو روبەرەش بەرهەمی نۆک لە پلەی یەکەم بووە بە هەردوو شارەدێی (چوارقوڕنە و بنگرد) (١٣٧٥)

داچێنراوە، هەروەها ڕوبەری داچێنراو بە بەرهـەمی نیسـک بەهـەردوو شـارەدێی چوارقورنـە و بنگـرد (٨٢٥) دۆنـم بـووە. لـە وەرزی (١٩٧٤ – ١٩٧٥)دا کـۆی ڕووبـەری داچێنـراو بـە ڕانیـە و شـارەدێی چوارقورنەو بنگرد بەرزبۆتەوە بۆ (٢٨٠٧) دۆنم، ڕووبەری داچێنراو بە بەرهەمی نۆک لە پلەی یەکەم بووە بە هەردوو شارەدێی(بنگرد و چوارقوڕنە) ڕووبەری داچێنراوی نۆک (٢٦٤٣) دۆنم بووە، بەڵام بەروبومی ماش تەنیا لە شارەدێی سەنتەر (١٦٤) دۆنم داچێنراوە. لە ئاماری لەساڵی (١٩٧٧) دا، تەنها بەروبومی نۆک بەبڕی (١٩٣٩) دۆنم لە شارەدێی سەنتەر داچێنراوە.

جگە لەو بەروبومانەی باسکرا، بەروبوومی تریش هەبووە وەک فاسولیا، پاقلە کەمتر چێنراون و لـە سـەرژمێریەکان ئاماژەیـان پێـدراوە، بـەڵام ئـەوەی جێگـەی سـەرنجە لـەم خشـتانەی کـە ئاماژەی پێدرا، ڕووبـەری داچێنرا و جۆری بەرووبومـەکان و بڕی بەرهـەم لـە وەرزێکەوە بۆ وەرزێکی تـر جیاوازە، هۆکاری ئەم جیاوازیە دەگەڕێتـەوە بۆ چـەند هۆکارێک لەوانـە سـنوورداری بەرهـەمهێنان و کـەمی جوتیـاری تایبەتمەنـد بـەم بەرهەمـە، هـەروەها گرنگی بـەرووبومی دانەوێڵـە بـە بـەراورد بـەم بەرووبوومانـە وایکـردووە جووتیـاران کـەمتر گرنگـی بـەم بەرووبومـە بـدەن، جگـە لـە گۆڕانکارییـە سیاسی و کارگێڕییەکان.

**خشتەی (١٥) بەرهەمی چێنراوی پاقلەمەنیەکان لە شارۆچکەی رانیە**

| شارۆچکە | ساڵ | شارەدێ | بەروبووم | ڕووبەری چێنراو بە دۆنم | بڕی بەرهەم بە تەن |
|---|---|---|---|---|---|
| رانیە | ١٩٥٩- ١٩٦٠ | سەنتەر | ماش | ١٥ | ٢.٧٠٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٢٠ | ٣.٦٠٠ |
| | | کۆ | | ٣٥ | ٦.٣٠٠ |
| | ١٩٦١- ١٩٦٢ | سەنتەر | نیسک | ٢٠ | ٣.٥٠٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٢٠ | ٣ |
| | | سەنتەر | ماش | ٣٠ | ٥ |
| | | سەنگەسەر | | ٢٥ | ٤ |
| | | سەنتەر | لۆبیا | ١٠ | ١ |
| | | سەنگەسەر | | ٥ | ٠.٧٥٠ |
| | | چناران | | ٥ | ٠.٦٠٠ |
| | | کۆ | | ١١٥ | ١٧.٨٥ |
| | ١٩٧٣- ١٩٧٤ | چوارقوڕنە | نۆک | ١٣٧٥ | ١٥١.٧ |
| | | بنگرد | | | |
| | | چوارقوڕنە | نیسک | ٨٢٥ | ١٧٤.٤ |
| | | بنگرد | | | |

| شارۆچکە | ساڵ | شارەدێ | بەروبووم | ڕووبەری چێنراو بە دۆنم | بڕی بەرهەم بە تەن |
|---|---|---|---|---|---|
| | | کۆ | | ٢٢٠٠ | ٣٢٦.١ |
| | ١٩٧٤-١٩٧٥ | چوارقوڕنە | نۆک | ٢٦٤٣ | ٢٨٨.٠ |
| | | بنگرد | | | |
| | | سەنتەر | ماش | ١٦٤ | ٣٥٩.٨ |
| | | کۆ | | ٢٨٠٧ | ٦٤٧.٨ |
| | ١٩٧٧ | سەنتەر | نۆک | ١٩٣٩ | ١٣٤.٠ |
| | | کۆ | | ١٩٣٩ | ١٣٤.٠ |

مصدر: وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام،١٩٦٠ ، ص٨١؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام،١٩٦٠-١٩٦١ ص ٣٨، ٩٠، ١٠٥؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام،١٩٧٣-١٩٧٤، ص ٣٩، ٤٧؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام، ١٩٧٤-١٩٧٥، ص٢، ٥٧؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية العام، ١٩٧٧، ص ٢٩.

**٢- بەروبومە سوود لێوەرگیراوەکان لە پیشەسازیدا**

مەبەستمان لە و بەروبومانەیە کە دەتوانرێت گۆڕانکاری لە بەرهەمی بەروبوومەکانیدا بکرێت و لە ڕێگەی کارگەوە بخرێنە بواری پیشەسازیەوە، ئەمە جگە لەوەی بەشێکیان ڕاستەوخۆ بۆ خواردن گونجاون و بەکاردەبرێن، بەڵام زیاتر تایبەتمەندی بەروبوومێکی پیشەسازییان تێدایە، گرنگترین بەروبومەکانی ڕانیە لەماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوەکە بریتین لە:

**أ- تووتن**

تووتن بەرهەمێکی کشتوکاڵی هاوینیە، لە سەردەمی پاشایەتیدا لە عیراق، ناوچەی بیتوێن زۆربەی کات پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی ناوچەکانی سلێمانی وەرگرتووە، دوڵی شاوڕێ لە ڕانیە یەکێک بووە لە ناوچە بەناوبانگەکان، ئیدمۆندس لەم بارەیەوە وتوویەتی:(شاور تووتنی باش و بەناوبانگی هەیە، توتنە باشەکانی عێراق بە تووتنی شاور دەناسرێن).[1] لەساڵی(١٩٥٩) تووتنی ڕانیە لە ڕووی گونجاوی و ناوچەی باشیەوە پلەی سێیەمی وەرگرتووە لە سەر ئاستی ناوچەکانی کوردستانی عێراق،[2] داچاندنی تووتن بەچڕی تا ساڵی (١٩٩١) لە ڕانیە بەردەوامی هەبووە، جووتیار هەموو ساڵێک لە سەرەتای مانگی مایس ئامادەسازیان بۆ کردووە لە ڕوی زەوی چاکردنەوە، ئەگەر

[1] وەرگیراو لە: د. بەختیار سەعید مەحمود: لیوای سلێماتی ١٩٢١-١٩٥٨ لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی لە باودۆخی ئابوری، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٨٣.

[2] علی ناجی عطار: گیروگرفتی توتن، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٥٩، ل٤٦.

بنەتۆیان هەبوایە بەکاریان هێناوە ئەگینا لە شارەزوور و کۆیە شەتڵیان بۆی هێناوە، لە کۆتایی مانگی تەموز و سەرەتای مانگی ئاب دەست بە لێکردنەوەی تووتن کراوە، سەرەتا لێکردنەوە دواتر پێوەکردن، کە دوو جۆری هەبووە بە داو و بە داردارکرن، کە جۆری بەداوداکردن لە دۆڵی شاور بەکاربراوە شێوەی باشتر و بۆندار بووە، دواتر بە چوارداخ هەڵیانواسیوەو لەبەر هەتاو وشکیانکردۆتەوە، تا مانگی ئەیلول ئەم کارە درێژەی کێشاوە، دواتر لە چاڵی زەوی سێ بە چوار بە قووڵی دوو مەتر هەڵگیراوە، لە دوای ئەم کارەش لە سندوقی پەستێوراوە خراوەتە ناو گونیەوە بۆ بەبازاڕکردن.[١]

گرنگترین جۆرەکانی تووتن لە ڕانیە بریتی بووە لە (تۆ ڕەشە، سپی چاڵ، ڕەشەڵار، بۆندار، گرژە کە زۆر بڵاو بووە)،[٢] بە هۆی بەربڵاوی کاری تووتنەوانی لە ڕانیە لە ساڵی (١٩٧٠) دا حکومەت کێڵگەی تووتنی ڤێرجینی، لە گوندی گردجانی نزیک ڕانیە کردۆتەوە کە کاری ئەو کێڵگەیە ئامادەکردنی شەتڵی تووتن بووە، لە جۆری کۆکەری (٢٥٤) و (٣٤٧) کە زۆر گونجاو بوون بۆ چاندن لە ناوچەکە و بە شێوەی بێبەرامبەر بەسەر جووتیاراندا دابەشکراوە،[٣] کۆکەر (٣٤٢) زۆر لە ناو جووتیاراندا باو بووە و قەبارەی گەورەیەو درێژی (١٤٠-١٨٠) سم بووە، گەڵاکەی سەوزە و ژمارەی گەڵاکانی (٤٠-٥٤) گەڵایە.[٤] بۆ زانیاری لەسەر ڕووبەری بە دۆنم داچێنراوی تووتن لە ڕانیە لە ماوەی ساڵی (١٩٥٨-١٩٦٧) سەیری خشتەی (١٦) بکە.[٥]

**خشتەی (١٦) ڕووبەری بە دۆنم داچێنراوی تووتن لە ڕانیە لە ماوەی ساڵی (١٩٥٨-١٩٦٧)**

| ژ | ساڵ | ڕوبەری داچێنراو بە پێی پێوەری دۆنم |
|---|---|---|
| ١ | ١٩٥٨ | ٣٩٠٠ |
| ٢ | ١٩٥٩ | ٤٥٠٠ |
| ٣ | ١٩٦٠ | ٥٥٠٠ |
| ٤ | ١٩٦١ | ٥٥٠٠ |
| ٥ | ١٩٦٢ | ٥٥٠٠ |
| ٦ | ١٩٦٣ | ٥٨٠٠ |
| ٧ | ١٩٦٤ | ٧٠٠٠ |

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەلال قادر مینە: ٢٠١٦/٧/١٣.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەلیم سلێمان توفیق: ٢٠١٦/٨/٥.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ڕەحیم ئیبراهیم ئەحمەد: ٢٠١٦/٧/٣٠.

[٤] هەلەت رشید عبدالله: علاقة المناخ بأنتاجية التبغ في محافظة السليمانية، رسالة ماجستير(غير منشورة)، كلية التربية، جامعة الموصل، ٢٠٠٦، ص٦٧.

[٥] بەداخەوە بەهۆی نەمانی فەرمانگەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە و لە ناوچوونی زانیاریەکان و نەبوونی داتا لە سەرژمێریە کشتوکاڵیەکان تەنها ئەو داتایانەمان بەردەست بوو، کە بەکارمانهێناوە.

| ژ | ساڵ | ڕوبەری داچێنراو بە پێی پێوەری دۆنم |
|---|---|---|
| ٨ | ١٩٦٥ | ٧٠٠٠ |
| ٩ | ١٩٦٦ | ٧٠٠٠ |
| ١٠ | ١٩٦٧ | ٧٠٠٠ |

سەرچاوە: کاری توێژەر پشت بەستن بە: د. عباس فاضل السعدي: المصدر السابق، ص٣٤٠.

**ب- گوڵە بەڕۆژە**

بەروبوومێکی وەرزییە، پێویستی بە ئاو و خاکی باش هەیە، لە سەرەتای حەفتاکاندا لە لایەن وەزارەتی کشتوکاڵی عێراقەوە چەند تۆیەکی لە جۆری باش بەسەر جوتیاراندا دابەشکراوە، وەک توخمەکانی ڕیکۆرد و پرادۆڤیک، دەشتی ڕانیە یەکێکە لە ناوچە گونجاوەکان بۆ داچاندنی بەرووبومی گوڵەبەڕۆژە.[١] چاندنی گوڵەبەرۆژە یەکێک بووە لە چوار بەرووبومە کشتوکاڵیە زۆر خواست لەسەرەکانی ناوچەی ڕانیە، جگە لە زەوی تایبەت و تەرخانکراو و هاوتەریب لەگەڵ توتنیش داچێنراوە لە ڕانیە زیاتر بۆ خواردن بەکارهاتووە، بەشێکیشی چۆتە بواری پیشەسازیەوە.[٢]

جگە لەو بەروبوومە پیشەسازیانەی کە باسکران، هەندێک بەروبوومی داچێنراوی تریش هەبووە لە ڕانیە بەڵام ڕێژەی چاندنیان بە شێوەی بەردەوام نەبووە کەمتر بووە، بەروبومەکانیش بریتی بوون لە:(پەمۆ، ڕەشکە، گەنمەشامی و کونجی).[٣]

**سێیەم/ باخداری و ڕەز و میوە، بێستان، بەرهەمی سەوزە**

بەشێوەیەکی گشتی باخداری لە ناوچەی سلێمانیدا وەک پێویست گرنگی پێنەدراوە ڕووبەرێکی کەم داچێندراوە، لە ساڵی (١٩٧١ )سەرجەم ڕوبەڕی ڕەز و باخ لە کۆی شارۆچکەی ڕانیە (٢٦٥) دۆنم بووە،[٤] لە دوای ساڵانی (١٩٥٠) چەند باخێکی بەراو لە ڕانیە داچێنراون کە تاساڵی (١٩٧٠) بەرهەمیان هەبووە، وەک باخەکانی (قادری باخچەوان، حەوێزی بەرید، محەمەد وەسمان، تۆفیق چاوشین، سەعید بەگ، حاجی پیرۆت، سابیر قەساب، عبدالرحمان لێوڕەش، مام خورشید، برایم بەگ)، باخەکان زیاتر بەڕووبەری (٥) دۆنمی بوون لە شێوەی بەراو، بەئاوی قولە و کوێرەکانی ئاو دراوون، بەروبوومەکانیشیان بریتی بووە لە: (قەیسی، خۆخ، هەنجیر، هەڵوژە، هەنار، سێو)، جگە لەم میوەی ئەم باخانە بە شێوەیەکی گشتی میوە لە ڕانیە لە دۆڵی شاورێ و ئاکۆ و خۆشناوەتی، بۆ ڕانیە دابین کراوە لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، ڕەز لە ناو ڕانیە و دەوروبەری نەبووە تەنها لە دۆڵی

---

[١] چیمەن عەبدوڵلا ئەحمەد: پەیوەندی ئاو هەوا بە بەرهەمهێنانی بەروبومە پیشەسازییەکانەوە لە پارێزگای سلێمانی، چاپخانەی بینای، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٢٤، ٢٧، ٢٨، ٣١.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ سەلیم سلێمان توفیق: ٢٠١٦/٨/٥.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مەحمود سەعید سابیر: ٢٠١٦/٧/٨.

[٤] د. سەلاحەدین حەفید: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧.

شـاور و خۆشـناوەتی هـەبووە ڕەزەکـانیش لـە جـۆری تـرش و تـرێ و چوالـە بـووە.[١] دەربـارەی بـەربوومی بێسـتانیش ئـەم بەرهـە کشـتوکاڵییە لـە ڕانیـە پەیوەسـت بـووە بـە کشـانەوەی ئـاوی زێـی بچـووک و بـەرزی و نزمـی لـە ئـاوی دەریاچـەی دوکـان، بـە درێـژی مـاوەی لێکۆڵینەوەکـە، لـە وەرزی هاوین لەگەڵ کشانەوەی ئاو لەو زەویانەی، کە پێی دەڵێن زەوی ژێر ئاوکـەوتوو، بێسـتانی کاڵـەک و شـوتی و تـرۆزی و خـەیار داچێنـراوە و بـەهۆی بـەپیتی خاکەکـەوە یـەکێک بـووە لـە هـەرە بەرهەمـە کشتوکاڵیە باشەکانی ڕانیە.[٢]

سەوزەش لە ڕانیە زیاتر بە هاوینان کراوە، کەمتر گرنگی بـە سـەوزەی زسـتانە داوە و بەشـێکی زۆری سـەوزەی زسـتانی وەک: (شێلم، سلق، توور، کەرەوز، کـەوەر، تـەرەتیزە، سـیر، پیـازی ووشـک، تەرەپیاز) لە وەرزی هاویندا کراوە بەرێگەی ئاودان.[٣] تا ساڵی (١٩٧٠) سەوزە لە ڕانیە داچاندنی کـەم بووە بەشێکی سەوزە لە ناوچەی تەق تەق و پردێوە هاتووە بۆ ڕانیە، جگە لەو سەوزانەی کە باسکرا سـەوزەی تـریش هـەبووە، وەک:(تەماتـە، کولـەکـە، بامیـە، باینجـان، هتـد) بەتایبـەت تەماتـە کـە ڕێـژەی داچاندنی بەشێوەیەکی بەردەوام بووە لـە مـاوەی سـاڵانی لێکۆڵینەوەکـەدا.[٤] بـە پێـی خشـتەی (١٧) لـە سـاڵی (١٩٥٩-١٩٦٠)دا ڕووبـەری زەوی بـەپیازی وشـک داچێنـراو بـە ڕانیـە و میـرزا ڕۆسـتەم و سەنگەسـەر تـەنها (٤٣) دۆنـم بـووە، لـەم ڕوبـەرەش لـە نـاو ڕانیـە تـەنها (١٥) دۆنـم بـووە، لـە سـاڵی (١٩٦١-١٩٦٢) ڕوبەری زەوی بە پیازی وشک داچێنراو بە ڕانیـە و شـارەدێی سەنگەسـەر (٦٠) دۆنـم بووە، لەناو ڕانیەش تەنها (٣٠) دۆنم ڕووبەری داچێنراو هەبووە، وەک لە سـەرەتا ئامـاژەی پێکرا ئـەم کەمیـە لـە جـۆر و ڕووبـەری داچێنـراو دەگـەڕێتـەوە بـۆ کـەمی گرنگیـدانی خـەڵکی ناوچەکـە بـۆ ئـەم بەرووبومە.

**خشتەی(١٧) ڕوبەری چێنراوی سەوزە لە شارۆچکەی رانیە**

| شارۆچکە | ساڵ | شارەدێ | بەروبووم | ڕووبەری چێنراو بە دۆنم | بڕی بەرهەم بە تەن |
|---|---|---|---|---|---|
| رانیە | ١٩٥٩- ١٩٦٠ | مەرکەز | پیازی ووشک | ١٥ | ١٨ |
| | | میرزا رۆستم | | ٨ | ٩.٦٠٠ |
| | | سەنگەسەر | | ٢٠ | ٢٤ |
| | | | کۆ | ٤٣ | ٥١.٦٠٠ |

[١] چاوپێکەوتنی تـوێژەر لەگەڵ، عومـەر جیهـاد سـدیق: ٢٠١٦/٨/٧؛ چاوپێکـەوتنی تـوێژەر لەگەڵ مـەولود سـوفی بابـەکر: ٢٠١٦/٧/٩.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مەولود سوفی بابەکر: ٢٠١٦/٧/٩.

[٣] لەیلا محەمەد قارەمان: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ مەحمود سەعید سابیر: ٢٠١٦/٧/٨.

| شارۆچکە | ساڵ | شارەدێ | بەروبووم | ڕووبەری چێنراو به دۆنم | بڕی بەرهەم بە تەن |
|---|---|---|---|---|---|
| | ١٩٦١- ١٩٦٢ | سەنتەر | پیازی ووشک | ٣٠ | ٣٣ |
| | | سەنگەسەر | | ٣٠ | ٣٣ |
| | | | کۆ | ٦٠ | ٦٦ |

مصدر: وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية عام،١٩٦٠، ص٦٥؛ وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة- قسم الاقتصاد الزراعي، نشرة الاحصائية الزراعية عام،١٩٦١-١٩٦٢، ص٤٩.

**چوارەم/ بەروبوومی ئاژەڵ**

وەک ئاشکرایە بواری ئاژەڵداری تەواوکەری کشتوکاڵە، ناوچەی ڕانیە یەکێکە لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی سامانی ئاژەڵ بە هەردوو بواری ئاژەڵ و پەلەوەر.[١] بە شێوەیەکی گشتی دەشتی ڕانیە یەکێکە لە باشترین لەوەڕگاکان بۆ بە خێوکردنی ئاژەڵ، چونکە دەتوانرێت سود لە دۆڵ و لاپاڵی چیاکانیش وەربگیرێت، ناوچەکە ڕووەکی کورتەگیای زۆرە، چڕی ئەم گیایانەش پەیوەست بووە بە ڕێژەی دابارین.[٢] بە هۆی بایەخی ناوچەکە بە بەخێوکردنی ئاژەڵ حکومەتی عێراقی لە ماوەی ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠) بنکەی ڤێترنەری لە ڕانیە کردۆتەوە، ئەم بنکەیە سەرەتا کە کراوەتەوە بچوک بووە و کارمەندی کەم و خزمەتگوزاریەکانی سنووردداربووە و ڕەنگدانەوەی دۆخی کارگێڕی ئەوکات بووە و کارەکانیان بریتی بووە لە پێدانی دەرمان و کوتانی ئاژەڵ و چارەسەری نەخۆشیە جۆربەجۆرەکان، بە درێژانی ماوەی لێکۆڵینەوەکە ساڵانە لیژنەی دەرچوون هەبووە بۆ کوتانی ئاژەڵ و پەلەوەر جگە لەوەی لە بنکە و فەرمانگەکەش ڕۆژانە کاریان کردووە.[٣] هەر لە چوارچێوەی کارەکانی حکومەتدا لە پێناو بڵاونەبوونەوەی نەخۆشی و سەربڕینی ئاژەڵ بەشێوەیەکی تەندروست، وەک پێداویستییەک بۆ ناوچەکە سەربڕخانە لە ناو ڕانیە کراوەتەوە،[٤] بەڵام بە شێوەیەکی گشتی خزمەتگوزاری حکومەت بۆگرنگی دان بە سامانی ئاژەڵ لە ڕووی دابینکردنی جێگا و پێدانی ئالیک و بوارەکانی تردا، وەک پێویست نەبووە لە ئاستێکی لاوازدا بووە.[٥] لە ڕانیە بەروبومی ئاژەڵ دابەشدەبیت بەسەرسێ جۆردا:

**أ- مەڕوبزن، مانگاو گامێش**

لە ڕانیە تا ساڵی (١٩٧٠) زۆرێک لە ماڵەکانی ناو شار لە پاڵ کاری جوتیاری ئاژەڵیان ڕاگرتووە، ئاژەڵەکانیش بریتی بوون لە (گامێش، مانگا)، ڕۆژانە گاڕانی ئاژەڵ لە نزیک باخی گشتی لە ناوبازاڕ کۆکراوەتەوەو بردراوەتە دەرەوەی شار، کاری گاوانیش بەسەرە بووە، بەڵام دواتر حکومەت

---

[١] ڕەحیم ئیبراهیم ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٦.

[٢] أحمد فليح فياض علي اللهيبي: المصدر السابق، ص١٨٤.

[٣] فەرمانگەی ڤێتەرنەری ڕانیە: بەشی کارگێڕی، ٢٠١٥/١١/٣٠.

[٤] گەشتی هاوکاری بە ڕانیەدا: ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە(٧٩٦)، ل٦.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ڕەسوڵ سلێمان خدر: ٢٠١٦/٧/١٦، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٤ پشدەرەو لە شەستەکانەوە کەوتۆتە ڕانیە و لەمنداڵیەوە کاری ئاژەڵداری دەکات و تا ئێستا بەردەوامە.

ئاژەڵداری لەناو شار قەدەغە و سنووردار کردووە، ئەم کارە کەمی کردووە و زیاتر لەدەوروبەری شار هەبووە،[1] شێوازی بەخێوکردنیش گۆڕاوە بۆ دروستکردنی ئاغەڵ[2] و حکومەت هیچ ڕێگریەکی نەکردووە لەم کارە، تا ساڵی (١٩٩١) لەناو گەڕەکە جیاوازەکانی ڕانیە (١٩) ئاغەڵی ئاژەڵ بەخێوکردن هەبووە، جۆری ئاژەڵەکانیش بریتی بووە لە(گامێش، مەڕ، بزن، مانگا)، ئیشکردن لەم ئاغەڵانەدا پیشەی سەرەکی کەسەکە بووە و بە شێوەی خێزانی کاریان تێدا کردووە، سودیان لە گۆشت و شیرەمەنی و خوریەکەی وەک سەرچاوەی بژێوی ژیان وەرگرتووە.[3] لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بەخێوکردنی ئاژەڵ لە ڕانیە و دەوربەری لە ڕوی جۆریەوە پەیوەست بووە بە ژینگە و بنەماکانی ئاو هەواوە، بەخێوکردنی ئاژەڵی مەڕوبزن و مانگا و گامێش لە ناوچەکە بەم شێوە بووە:

١- گوندەکانی دەوروبەری ڕانیە گوندەکانی قورەگۆ، تیتۆکە، کونەسێ و هەنجیرە، بەناوبانگ بوون لە بەخێوکردنی مەڕوبزن، سەرچاوەی دابینکەری بەرووبومی شیرەمەنی بوون بۆ ناو ڕانیە، لە گوندی بۆسکێنی نزیک رانیە بە هۆی بوونی سەرچاوەی ئاو ژمارەیەکی زۆر گامێشی هەبووە لەگەڵ مەڕو بزن و مانگا، هەبووە لە ناوچەکەدا.

٢- لە شارەدێی چوارقورنە و ئۆردوگای چۆمان و سەرکەپکان مەڕو بزن و مانگا بەخێوکراوە، لەگوندەکانی گردجان و قەرەنی ئاغا و کانی ماران قولەی کانی ماران، سەر بەم شارەدێیە گامێش و مانگا بەخێوکراوە.

٣- لە شارەدێی بێتواتە و ئوردوگای شکارتە ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵی مەڕ و بزن و مانگا هەبووە.[4]

**ب- پەلەوەر**

لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بەخێوکردنی پەلەوەر لە ڕانیە بە دوو شێوە بووە لە ماڵدا وەک حەز و بە مەبەستی سوودوەرگرتن لە گۆشت و هێلکەکەی، هەروەها بەشێوەی پرۆژەی پەلەوەری وەک پیشە و خستنە بازاڕبووە، گرنگترین ئەو پەلەوەرانەی کە لە ڕانیە بەخێوکراون بریتی بوون

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ پیرۆت حوسێن مراد: لە ٢٠١٦/٧/٩.

[2] ئاغەڵ: شوێنێک بووە بە درێژای وەرزەکانی ساڵ،ئاژەڵی تێدا بەخێوکراوە لە دروستکردنیدا کەرەستەی قوڕو و چیمەنتۆ بەکارهاتووە، ڕووبەری زەویەکەی لە نێوان ٤٠٠-١٠٠٠ مەتر بووە بەپێی پێویستی ئاژەڵدار، لە چەند ژوورێک پێکهاتووە وەک ژووری (ئالیک، زاوزێ، کادێن، مۆلکردن).

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ڕەسوڵ سلێمان خدر: ٢٠١٦/٧/١٦. بۆ زانیاری لە سەر ئاغەڵەکانی ڕانیە لەڕووی خاوەنداریەتی و شوێن و گەڕەکەوە بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١٤).

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ساڵح خدر فەقێ ئەمین: ٢١٦/٧/٩ ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٤ ڕانیەیە، دەرچووی سەرەتاییە بەشداری چەندین خولی ڤێتەنەری کردووە ئێستا فەرمانبەرە لە فەرمانگەی ڤێتەنەری ڕانیە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەزیز عومەر ئەحمەد: ٢٠١٦/٧/٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٢ پشدەرە، دەرچووی سەرەتاییە و بەشداری چەندین خولی ڤێتەنەری کردووە ئێستا خانەنشینە.

لە(مریشک، قاز، مراوی، تاوس، کۆتر، کەو، بولبول، کەناری، هتد)،[1] تا ساڵی (١٩٨٩) کۆمەڵێک پرۆژەی پەلەوەری لە ڕانیە و ناوچەکەدا هەبوون، بڕوانە خشتەی(١٨).

**خشتەی(١٨) ناوی پرۆژە پەلەوەرەیەکانی ڕانیە لەڕووی جۆر و شوێن خاوەندارییەتیەوە**

| ژ | ناوی پرۆژە | جۆری پەلەوەر | شوێن | جۆری پرۆژە | خاوەنداریەتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | پرۆژەی سەیداوە | مریشک | ڕانیە | حکومی | هەرەوەزی کشتوکاڵی |
| ٢ | پرۆژەی بۆسکێن | مریشک | ڕانیە | حکومی | هەرەوەزی کشتوکاڵی |
| ٣ | پرۆژەی چوارقورنە | مریشک | ڕانیە | حکومی | هەرەوەزی کشتوکاڵی |
| ٤ | پرۆژەی گردجان | مریشک | ڕانیە | حکومی | هەرەوەزی کشتوکاڵی |
| ٥ | پرژەی ڕانیە | مریشک | ڕانیە | تایبەت | سەلیم نوری خدر |
| ٦ | پرۆژەی حاجیاوا | مریشک | حاجیاوا | تایبەت | جاجی مەولود ڕەسول |
| ٧ | پرۆژەی بێتواتە | مریشک | بێتواتە | تایبەت | ئەنوەر ڕەشید بەگ |

سەرچاوە: چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ عەلی حەمە ئیبراهیم: ٢٠١٦/٧/٢٩.

توانای بەخێوکردنی ئەم پرۆژە پەلەوەریانە لە نێوان (٤٠٠٠-٦٠٠٠) مریشکدا بووە،[2] لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، کەمترین نەخۆشی و دەرد و بەڵای ئاژەڵی و پەلەوەری لە ناوچەکەدا هەبووە، کە کاریگەری لەسەر ژیانی مرۆڤ هەبووبێ لە شارۆچکەدا، وەک ئەو نەخۆشیانەی ئێستا لە ئاژەڵ و پەلەوەردا هەیە کە هەندێک جار ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی گیان لە دەستدانی مرۆڤ.[3]

**ج- سامانی ماسی**

ماسی بەیەکێک لە لایەنە گرینگەکانی پەرەپێدانی سێکتەری کشتوکاڵی دادەنرێت، چونکە یەکێکە لەگرنگترین سەرچاوە خۆراکیەکان لەسەر ئاستی ناوخۆیی و جیهانی.[4] بوونی زێی بچوک لە ڕۆژهەڵاتی شارەکە دروستبوونی بەنداوی دوکان، وای کردووە ڕانیە ببێتە ناوچەیەکی دەوڵەمەند لە بەرووبومی ماسی، لە دوای ساڵی (١٩٦٠) تورکمانەکان لە کەرکوک و تەلەعفەر و پردێوە بەلەمیان هێناوە بۆ ڕانیە و بە تۆڕ و قولاب کاری ڕاوە ماسی و بازرگانی ماسیان کردووە، لە ناوچەکە، تا ساڵی (١٩٧٠) خەڵکی ناوچەی ڕانیە تەنها وەک ڕاوکردنی تاکەکەسی و وەک خولیا ئەم کارەیان

---

[1] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ عومەر ڕەسوڵ ئەحمەد: ٢٠١٦/٧/٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٣ ڕانیەیە، دەرچووی ئامادەییە و بەشداری چەندین خولی ڕاهێنانی کردووە لە بواری ڤێتەنەریدا و ماوەی ٣٩ خزمەتی هەیە لە فەرمانگەی ڤێتەنەری ڕانیە، ئێستا خانەنشینە.

[2] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ عەلی حەمە ئیبراهیم: ٢٠١٦/٧/٢٩.

[3] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ عومەر ڕەسوڵ ئەحمەد: ٢٠١٦/٧/٩.

[4] دارا عبدالرحمان کلهوري: محمد عمر سكينة: دراسة المشاكل التي تواجه مربي الاسماك في الاحواض السمكية في محافظة السليمانية، مجلة جامعة تكريت للعلوم الزراعية، مجلد ١٣، عدد٣، ٢٠١٣، ص١٤٤.

کردووە، بەڵام دواتر بەهۆی بەرەو پێشچوونی، ئەم کارە بۆتە پیشەی سەرەکی کۆمەڵێک کەس لە ڕانیە و بنگرد، لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بە بەردەوامی مامەڵە و کاری بازرگانی پێوەکراوە، گرنگترین جۆرەکانی ماسی بریتی بوون لە (سوورە، بزە، زەردە، حکومەتی، شەبووت، پانکە، زەویلکە، مارماسی، تیرە، گۆلکە، قوڕاوی) باشترین جۆری ماسیش ماسی بزە بووە، کە کێشی تا (١٠٠) کیلۆگرام ڕۆیشتووە، سیاسەتی حکومەت بەرامبەر بەرهەمی ماسی لە ئاستێکی لاواز دابووە لە سەرەتای حەفتاکاندا تەنها یەکجار گەرای جۆرێک لە ماسی بڵاوکردۆتەوە، کە لای هاوڵاتیان بەحکومەتی ناسراوبووە، کارێکی تری حکومەت بریتی بووە لە قەدەغەکردنی ڕاوی ماسی لە مانگی (٥) تا (٧)، بەڵام بڕیارەکەی حکومەت بە شێوەی زارەکی بووە خەڵک هەر بەردەوام بووە، ڕێگری نەکردووە لە ڕاوکردنی هاوڵاتیان و بە قاچاخ هاتنی بۆمبی پلێتی، کە بۆ ڕاوکردن بە کارهاتووە و زیانێکی زۆری لەو بەروبوومەداوە.[١]

## باسی سێیەم/ پیشە و پیشەسازی و چالاکی بازرگانی لە ڕانیەدا

### تەوەری یەکەم/ پیشە و پیشەسازی

بەشێک لە پێداویستیەکانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و کەلوپەلی ناوماڵ، بە دەستی پیشەگەرەکان لە دارتاش و ئاسنگەر و تەنەکەساز و ...هتد دروست دەکرێت، بەشێکی تریش بە ئامادەکراوی لە شوێنێکی ترەوە لە ڕێگەی بازرگانی لە بازاڕ دەست دەکەوێت.[٢] وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا پیشەی سەرەکی خەڵکی ڕانیە کشتوکاڵکردن بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کاری تریشیان کردووە، بەشێکیان لەوەرزی زستاندا دوکاندار بوون هاوینان جوتیار، بەشێکیشیان تەنها کاری پیشەگەری و دوکانداریان کردووە، لە ماوەی (١٩٦٠-١٩٧٠) جگە لە کەمێک دوکانی پیشەگەری، زۆربەی دووکانەکانی ناو ڕانیە لە شێوەی فرۆشگای بچوکی هەمەچەشندا بوون واتا لە یەک دوکاندا کەلوپەلی ناوماڵ و قوماش، خۆراکی وشکە و سەوزە و میوە هتد، هەبووە گرنگترین دوکاندارە دیارەکانی ئەوکاتیش بریتی بوون لە (زاهیر فەقێ تەها، سالح ئیسماعیل، حاجی عەبدوڵا وەیس، مەلا ئەحمەد مستەفا، حاجی هەمزە، سالح ئیسماعیل، سەید فەیزوڵا ڕەشید، سەید عەبدوڵا فەیزوڵا، ڕەشید حەویز)،[٣] بەشێک لە دوکانەکان گڵ و قور بوون. لە ماوەی (١٩٧٠-١٩٨٠) بەشێکی زۆری دوکانەکان بوون بە چیمەنتۆ و کۆنکرێت، لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا ئەم پیشانە لەناو ڕانیەدا هەبوون: (مسگەری، تەنەکەچی، پینەچی، ناڵچی، نانەوا، چەرچی، عەتاری، ناڵبەندی، کرێکاری، وەستای خانوو، حەمامچی،

---

[١] چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ عەبدوڵلا عەلی ئیبراهیم: ٢٠١٦/٨/٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٦ ڕانیەیە و نەخوێندەوارە، لەماوەی ١٩٧٠-١٩٩١ پیشەی ڕاوکردنی ماسی بووە لە زێی بچووکی نزیک ڕانیە.؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدولڕەحمان خدر محەمەد: ٢٠١٦/٨/٧، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٥ بنگردە نەخوێندەوارە و لە منداڵیەوە پیشەی ڕاوکردنی ماسی بووە لە زێی بچوکی نزیک ڕانیە، شارەزای باشی هەیە لەم بوارە.

[٢] عەبدوڵلا غەفور: کورد لێکۆڵینەوەیەک لە کەلتووری ماددی سەردەمدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، ل٨١.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدولڕەحمان حەسەن عوسمان: ٢١٠٦/٧/١١.

سەرتاش، قەساب، هەڵاجی، کورتاندروو، جۆڵایی، زێڕنگەری، فیتەری، چایچی، دارتاشی، ئاسنگەری، کەبابچی، شۆفێری، ئوتوچی، ڕادیۆچی و تەلەفزیۆنچی، قوماشفرۆش، بەرگدورو، بازرگان، کاروانچیەتی، سەعاتچی، وێنەگری، خۆشنوسی).[1]

هەندێک پیشە لە ڕانیە هەبووە مێژووەکەی بۆ پێش ساڵی (١٩٥٨) گەڕاوەتەوە، وەک کاری ناڵبەند و مسگەر و چەرچی و زێڕنگەری، وێنەگری، بۆ نمونە پیشەی وێنەگری لە ساڵی (١٩٥٤) دا، لە لایەن مەلا فاتح عەسکەری و تۆفیقی مەلا سدیق هاتۆتە ڕانیە، پیشەکان بەپێی خواست و پێشکەوتنی ئابوری و کۆمەڵایەتی گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە و هەندێک پیشە بەهۆی نەمانی خواست لە ناو ڕانیە نەماون و هەندێک پیشەی تر لە بری ئەوان پەیدابوون، پیشەی ناڵبەند و مسگەر و چەرچی لە دوای ساڵی (١٩٧٠) ەوە لەناو شارۆچکەکەدا نەماوە، لە بری ئەم کارانە کاری وەستای خانوو، نانەواو، سەمونخانە پەیدابووە، پیشەی جولایش لە دوای ساڵی (١٩٨٩)دا بە هاتنی خەڵکی گوندی کانی توو چنارنەی بەری مەرگە هاتۆتە ناو شارەکە، جگە لەو پیشانەی باسکران هەندێک پیشەی تریش هەبووە، بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر وەک کاری بەڵێندەرایەتی، کە محەمەد مەجید هاوار و حاجی ئەحمەد سەعید، دوو بەڵێندەری ناسراوی ئەم شارە بوون، لەگەڵ هەندێک کاری تری پیشەگەری وەک دروستکردنی سەبەتە، بێژنگ، خوان، تیرۆک و چەقو کە لایەن قەرەج و دۆمەکانەوە دروستکراوە، ئەم دۆم و قەرەجانە نیشتەجێی ڕانیە نەبوون و ساڵانە لەوەرزی بەهاردا هاتوون بۆ ڕانیەو لە دەوربەری شار خێمەیان هەڵداوە و بۆ ماوەیەک ماونەتەوە لە شوێنی مانەوەیاندا کاریان فروشتنی ئەم جۆرە دروستکراوانە بووە.[2]

ڕانیە هەرچەندە شارۆچکەیەکی بچووک بووە و بەردەوام دۆخی سیاسی و ئابوری ناجێگیربووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤی بەهرەمەندی تێدا هەڵکەوتووە یەکێک لەو بەهرەمەندانە بەناوی جەلالی خورشیدە فەندی لە سەرەتای پەنجاکانەوە تا سەرەتای حەفتاکان وەک کاری تاکەکەسی کۆمەڵێک داهێنانی پیشەیی کردووە، وەک (دروستکردنی ڕادیۆ و تەشویش خستنەسەر، موبەڕیدە، شەحنی پاتری، تەزووی کارەبا لە ڕێگەی پاسکیلەوە، ڕیمۆت کۆنترۆڵ، ئاگادارکردنەوەی ئەلکترۆنی، حاسەی ڕووناکی)، بەڵام خراپی دۆخی سیاسی لەم ماوەیەدا ڕێگربووە لە بەردەم گەشەکردنی، جگە لە داهێنانەکانی هەر لەم ماوەیەدا چەندین ئامێری وەک (ماتۆڕسکێل، تەلەفزیۆن، ڕیکۆردەر، میوزیکی کەمان)ی هێناوە بۆ ڕانیە،[3] بە شێوەیەکی گشتی پیشەگەری لە ڕانیە لە ئاستێکی پێشکەوتوودا نەبووە، گەر کاری میکانیکی بە نمونە وەربگرین لە دوای ساڵی (١٩٦٠) کاری فیتەری و

---

[1] بۆ شارەزابوون لە سەر شێوازی ئەم پیشانەی باسکران. بڕوانە: عەباس چنارانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٥-١٥.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدول کەریم فەیزوڵلا ڕەشید: ٢٠١٦/٨/١٦، ڕانیە، ناوبراو لە دایکبووی ١٩٦٢ ڕانیە و دەرچووی ئامادەییە دوکانی ئوتوکردنی هەیە لە بازاڕی ڕانیە تا ئێستا بەردەوامە لە ئیشەکەی.؛ چاوپێکەتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد مەحمود خدر: ٢٠١٦/٧/١٣.

[3] هونەر جەلال: جەلالی خورشیدە فەندی، گۆڤاری ڕانیە، ژمارە(٥)، ئابی ٢٠٠٣، ل١٨، ١٩.

لەحیمچی و ڕۆنگۆڕ و پەنچەرچی لە ڕانیەدا پەیدابووە، بەڵام بەهۆی پشتگوێخستنی حکومەت لە دابینکردنی ناوچەی پیشەسازی و پێدانی ئامێر و کردنەوەی خولی ڕاهێنان، تەنها کاری سادە و بچووک لەم بوارەدا کراوە هەرچەندە لە دوای ساڵی (١٩٨٠) وەکیلی کەلوپەلی میکانیکی لە ڕانیە کراوەتەوە بەڵام وەک پێویست نەبووە، تا ساڵی (١٩٩١) زۆربەی کات لەکاتی تێکچوونی ئۆتۆمبیلی بچووک و گەورە و ئامێری کشتوکاڵی، بەناچاری نێردراوە بۆ شارەکانی هەولێر و سلێمانی.[١]

لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، کارکردن و شێوازی کارکردن لەڕوی پابەند بوون بە کات و کارامەیی و کارزانیەوە، ئیشەکان نارێکخراو بوون، حکومەتیش کەمترین هەنگاوی ناوە لەم بارەوە هەرچەندە لە ساڵی (١٩٥٨) یاسای کار دەرچووە کۆمەڵێک تایبەتمەندی بۆ کارکردن تێدا خراوەتە ڕوو، لە یەکێک لە خاڵەکانی ئاماژەی بەوە کردووە، کە نابێت کرێکار ڕۆژانە لە (٨) کاتژمێر زیاتر کار بکات، بەڵام ئەم بڕیارانە نەخراونەتە بواری جێبەجێ بوونەوە، خراپی دۆخی سیاسیش ڕێگر بووە لە بەردەم ئەم کارە لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، تەنها یەک جوڵانەوەی پیشەگەری هەبووە ئەویش لە ساڵی (١٩٥٩) دا بووە، کە کۆمەڵێک کرێکاری خەڵکی ڕانیە بەهۆی ماوە درێژی لەکارکردن، خۆپیشاندانیان دژ بەو لیژنە شوێنەواریە کردووە کە کاری پشکنینیان بۆ شوێنەواری شمشارە ئەنجامداوە.[٢]

لە دوای بەیاننامەی (١١)ی ئاداری (١٩٧٠) تا ساڵی (١٩٨٠) بەهۆی بەرزی ڕێژەی نەوت و خواست لەسەر فرۆشتنی، حکومەتی عێراق لەڕووی ئابووریەوە پەرەسەندنی بەرچاوی بەخۆیەوەبینیوە، ئەم بەرەوپێشچونەش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر ئابووری باشووری کوردستان، حکومەت هەوڵی ئەوەی داوە، کە کوردستان لە هەرێمێکی کشتوکاڵییەوە بۆ ناوچەیەکی کشتوکاڵی و پیشەسازی پێشکەوتوو بگۆڕێت، لە چوارچێوەی کارەکانیدا لە ڕێگەی بانکی پیشەسازییەوە قەرزی بە هاوڵاتیان داوە، بەڵام دواتر بە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی نێوان عێراق و ئێران زۆربەی کارەکانی وەستاوە،[٣] دەربارەی سیاسەتی ئابووری پیشەسازی حکومەت لەڕانیە سیاسەتیکی مەرکەزی بووە، کەسێک کە ئارەزووی پڕۆژەیەکی پیشەسازی کردبێت لە ناوچەکە دەبوایە بە کۆمەڵێک فلتەردا بڕوات، سەرەتا لە ڕێگەی پێدانی پشتگیری جێنشینی شارۆچکەی ڕانیە و پاشان ئاراستەکردنی بۆ پارێزگای سلێمانی، بۆ فەرمانگەی پیشەسازی پارێزگای سلێمانی دواتر ئاڕاستەکردنی بۆ وەزارەتی پیشەسازی کە لە شاری بەغدا بووە، دوای ئەم کارانە خاوەنی کارگە پێناسی ژوری بازرگانی و پیشەسازی لە سلێمانی پێدراوە، ئەگەر کارگەکەیان پڕۆژەکە گەورە بوایە و سەرمایەیەکی زۆری تێدا بەکارهاتبایە حکومەت زەوی پێداوە لەگەڵ پێدانی ئامێر و کەل و

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ زەینەڵ عەبدوڵڵا زەینەڵ: ٢٠١٦/٧/١٤ ڕانیە، ناوبرا و لە دایک بووی ١٩٤٤ پشدەرە و لە ساڵی ١٩٥٢ لە ڕانیە نیشتەجێیە، لە ساڵی ١٩٦٠ بۆتە شوفێری تراکتۆر و دواتر دەستی بەکاری فیتەری کردووە لە ڕانیە، شارەزای زۆری هەیە لەم بوارەدا.

[٢] قانون العمل: رقم (١)، الوقائع العراقية، رقم العدد(٤١١٥)، في ١٩٥٨/٣/١٦.؛ یەکەم مانگرتنی کرێکاران لە ناوچەی بیتوێن: گۆڤاری شمشارە، ژمارە(٥١)، ئەیلولی ٢٠١٠، ل١٩-٢٠.

[٣] دحام لقمان اسماعیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

پەلەکانی بەنرخێکی گونجاو،[1] هاوکاری حکومەت بۆ کەرتی پیشەسازی هەرچەندە سنورداربووە، بەڵام تاڕادەیەک باش بووە بەتایبەت بۆ کارگەکان ئەویش بەپێدانی (چیمەنتۆ، ڕۆن، گاز، هایدرۆلیک، مەوادی یەدەگ، ماتۆری کارەبا، هتد) بۆ کرێکاریش زەمانەتی تایبەتی هەبووە لە قەرەبووکردنەوەی لە ڕوودانی حاڵەتی نەویستراو، ساڵانەش لە ڕێگەی لیژنەیەکی کەشفەوە، سەردانی کارگەکانی کردووە لەو کەلوپەلانەی پرسیوەتەوە، کە بەخشویەتی.[2] لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا لە ڕانیە دوو جۆر پیشەسازی هەبووە، پیشەسازی خۆراکی و بیناسازی، کە لە خوارەوە باسیان دەکەرێت:

**أ- پیشەسازیی خۆراکی**

**١- ئاشی لێکردنی دانەوێڵە**

لە ساڵی (١٩٥٠) دا بۆ یەکەم جار هاوڵاتیەکی شارەکە بەناوی (سالح مستەفا پیرۆت) بەکۆمەڵێک کەلوپەلی سادە ئاشێکی ئاوی لە گردە دێمەی خوار گەڕەکی قەڵاتی ڕانیە دروستکردووە، بە سود وەرگرتن لە ئاوی ڕۆیشتووی سەرچاوەی قولە کار بە ئاشەکە کراوە، ئەم ئاشە تا ساڵی (١٩٧٠) بەردەوام بووە و تەنها دانەوێڵەی گەنمی(باراش) لێکردووە و کردویەتی بە ئارد.[3] لە ساڵی (١٩٦٠) لە خانەقینەوە دوو ئامێری (ڕۆستن- Ruston) ئینگلیزی لە لایەن قادر محەمەد سەعید و شێخ حوسێنی بۆسکێن هێنراوە بۆ ڕانیە، دانەیەکیان لە گەڕەکی قولە و ئەوی تریان لە گەڕەکی مامۆستایان نزیک فەرمانگەی کشتوکاڵ خراوەتەکار، ئەم ئامێرانە بە نەوتی ڕەش کاریان کردووە و هێزەکەیان (٧٥-kv) بووە.[4] لەکاتی کارکردندا دەنگێکی بەرزیان هەبووە، ئەم ئاشە گەنم و جۆ و ساوەر، برویش و چەلتووکی لێکردووە، یەک تەنەکە گەنم نرخەکەی پەنجا فلس بووە، چەلتووکیش سەد فلس، تا ساڵی (١٩٧٠) ئەم جۆرە ئاشە بەردەوامبووە خزمەتێکی زۆری ڕانیە و دەوربەری کردووە،[5] لە ساڵی (١٩٧١) هەردوو ئاشەکە لە هەمان جێگەی خۆیان گۆڕدراون بە ئاشی کارەبایی و لە ڕووی کارکردن و توانـاوە باشترو خێراتر بوون وەک دوو تاکە ئاشی ناوچەکە تا ساڵی (١٩٩١) بەردەوام بوون لە کارکردن.[6]

---

[1] چاوپێکەوتن لەگەڵ خالد مستەفا محمدئەمین: ٢١ / ٨ / ٢٠١٦، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ساڵی ١٩٤٨ ڕانیەیە و تا قۆناغی ناوەندی خوێندووە، خاوەنەی ئەو کارگەیە بووە لە ڕانیە، ئێستا کاری بازرگانی دەکات.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ وەهاب ئەحمەد مەولود(حاجی وەهاب): ٢٠١٦/٧/٢٠، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٣ ڕانیەیە و لە ١٩٨٠ خەریکی کاری بیناسازییە، ئێستا کاری بەڵێندەرایەتی بیناسازی دەکات.

[3] چاوپێکەوتن توێژەر لەگەڵ پیرۆت حوسێن مراد: ٢٠١٦/٧/٩.

[4] چاوپێکەوتن توێژەر لەگەڵ سەعید قادر محەمەد سەعید: ٢٠١٦/٧/١٢، لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٢ ڕانیەیە و تا قۆناغی ئامادەیی خوێندووە و بازرگانە و سەرپەرشتیاری کارگەی ئاش و سەهۆڵی کردووە لە ڕانیە و ئێستادا کاری بازرگانی دەکات.

[5] چاوپێکەوتن توێژەر لەگەڵ حوسێن سالح حوسێن: ٢٠١٦/٦/٢٤، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٣٨ بناری کۆسرەتە، وەستای کارپێکردنی ئەو ئاشە بووە.

[6] چاوپێکەوتن توێژەر لەگەڵ سەعید قادر محەمەد سەعید: ٢٠١٦/٧/١٢.

### ٢- کارگەی سەهۆڵ

هاتنی کارگەی سەهۆڵ بۆ ڕانیە بۆ ساڵی (١٩٦٠) دەگەڕێتەوە، کاتێک کەسایەتیەکی شارەکە بە ناوی قادر محەمەد سەعید، ئامێرێکی جۆری (کرۆسلی - Crossly) ئینگلیزی لە خانەقینەوە دەهێنێت بۆ ڕانیە، ئەم ئامێرە بە نەوتی ڕەش کاری کردووە و لە کەرکوکەوە نەوتی بۆ هاتووە، ڕۆژانە توانای بەستنی (٤٠٠) قالبە سەهۆڵی هەبووە، لە ساڵی (١٩٧٠) کارگەی سەهۆڵی ڕانیە، گۆڕدراوە بۆ ئامێری کارەبایی، لە ساڵی (١٩٨٢-١٩٨٣)دا شارەوانی ڕانیە کارگەیەکی تری کارەبای هێناوە بۆ شارەکە و لە ڕێگەی بەکرێدانی ساڵانەوە بە هاوڵاتیان خستوویانەتەکار، ئەم دوو کارگەیە تاساڵی (١٩٩١) بەردەوامبوون لە دابینکردنی سەهۆڵ بۆ ڕانیە و دەوروبەری.[١]

### ٣- کارگە پیشەسازییە خۆراکیەکانی تر

لە ساڵی (١٩٧٩)دا کەسێکی خەڵکی سلێمانی کە لەڕانیە بە ناوی (کەریم کۆکا) ناسراو بووە، کارگەیەکی بچوکی دروستکردنی خواردنەوەی غازی لە شارۆچکەکە کردۆتەوە بە ئامێرێکی تایبەت زۆرێک لە خواردنەوە جۆربەجۆرە غازییەکانی بەرهەم هێناوە،[٢] هەر لە هەمان ساڵدا کارگەیەکی فرنی کارەبایی لەلایەن دەروێش حمە سالح لە ڕانیە کراوەتەوە، ئەم کارگەیە کاری دروستکردنی سەموون بووە لە شارەکە، نرخی تێچوونی کارگەکە (١٩) هەزار دیناری عێراقی بووە، تاکە سەمونخانە بووە لە شارۆچکە و ناوچەکەدا، لە ساڵی (١٩٨١) لە لایەن ئەمیر عارف حەمە عەلی کارگەیەکی کارەبای چلوورە دروستکردن بەتێچووی (٢٠) هەزار دیناری عێراقی هێنراوە بۆ ڕانیە و بەناوی کارگەی چلوورەی هیوا کاری چلوورە دروستکردنی کردووە.[٣] لە ساڵانی (١٩٨٠) و (١٩٨٣) دا دوو کارگەی فرنی کارەبای دروستکردنی شەکری کلۆ و لوقم، بەناوی مەنگوڕ و سەنگاو لە گەڕەکی قولە و دەروازەی ڕانیە کراوەتەوە، ئەم کارگانە لە لایەن دووبراوە بە ناوەکانی (خدر ڕەسول ئەحمەد، ئەحمەد ڕەسوڵ ئەحمەد) سەرپەشتیکراون، کارکردن تێیاندا لە دوو کاتی جیاواز دابووە، ڕۆژانە ئافرەتان کاریان تێداکردووە و شەوانەش پیاوان ژمارەی کرێکاری هەر شیفتێک (١٠) کرێکار بووە، کۆی سەرجەمی کرێکارەکانیش (٤٠) کرێکار بووە، بەرهەمی رۆژانە لە نێوان (٨٠-١٠٠) فەردەی شەکر بووە، جگە لە دابینکردنی شەکری کلۆ بۆ ڕانیە و پشدەر، بەشێک لە بەرهەمەکەی نێردراوە بۆ هەولێر و دەوڵەتی ئێران، تا ساڵی(١٩٩١) ئەم دوو کارگەیە لە کارکردن بەردەوامبوون.[٤]

---

[١] هەمان سەرچاوە.

[٢] چاوپێکەوتن توێژەر لەگەڵ عەبدول کەریم فەیزوڵڵا ڕەشید: ٢٠١٦/٨/١٦.

[٣] حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی پیشەسازی و بازرگانی، ژووری بازرگانی و پیشەسازیی سلێمانی، بەشی پیشەسازیی، ئاماری کارگە پیشەسازیبەکانی گەورەو مام ناوەند و بچووک لە پارێزگای سلێمانی، وەرگیراوە لە ٢٠١٣/١٢/٨.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئەحمەد ڕەسوڵ ئەحمەد: ٢٠١٦/٧/١٥، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٥٢ سەنگەسەرەو تا قۆناغی سەرەتای خوێندووە، بە هاوبەشی لەگەڵ براکەی ئەم کارگەیان بەڕێوە بردووە.

لە سالّی (١٩٨٣) دا کارگەیەکی تری دروستکردنی شەکری کلّۆ و لوقم لە لایەن کەسێک بەناوی (ئەنوەر سالح عەزیز) لە دەروازەی شارۆچکەکە کراوەتەوە، ئەم کارگەیە بەکارەبا ئیشی کردووە و دروستکراوی ولاّتی عێراق بووە و توانای بەرهەمی ڕۆژانەی (٦٠) فەردە بووە و (٣٠) کرێکار ڕۆژانە بە شێوەی شیفت کاریان تێداکردووە، زۆرێک لە بەرهەمی ئەم کارگەیە بۆ بواری بازرگانی بەکار هاتووە، بەتایبەت بازرگانی قاچاخ بۆ پێشمەرگە و ولاّتی ئێران.[١]

**ب- پیشەسازی بیناسازی وپلاستیک و نایلۆن**

**١- کارگەی بلۆک**

لە سالّی (١٩٦٠) دا دەزگای بلۆکی دەستی چیمەنتۆ هاتۆتە شارەدێی چوارقورنە، بەلاّم بەکارهێنەری کەم بووە، لەگەلّ بەرەو پێشچوونی ژیان لە سالّی (١٩٧٠) دا دوو دەزگای دروستکردنی بلۆکی گەڕۆک لەلایەن (نەبی حەمەد سلێمان و خدر ڕەسولّ حەمە، محەمەد حوسێن) بۆ ڕانیە هێنراوە، ئەم دەزگایانە دروستکراوی عێراق بوون، چیمەنتۆیان لە موسلّەوە بۆ هێناوە و بە هۆی ئەوەی گەڕۆک بوون ڕاستەوخۆ لە شوێنی کارکردن کاریان کردووە، هەردەزگایەکیش شوێنی سێ کابیسەی هەبووە، بلۆکی لە جۆی (٢٠ X٤٠ –٣٠ X٣٠) دروستکردووە و ڕۆژانە توانای بەرهەمهێانی (٤٠٠) بلۆکیان هەبووە. تا سالاّنی هەشتاکان بەردەوام بوون لە کارکردن و بەشی زۆری دوکان و خانووەکانی ڕانیە بەم بلۆکانە دروستکراون.[٢] لە سالّی (١٩٧٦) دا غەسالەیەکی چەوو لم لە نێوان گوندی گردجان و شارەدێی چوارقورنەی سەر بە ڕانیە لە لایەن حاجی ئەحمەد سەعید دانراوە پێش ئەم غەسالەیە، خەلّکی ڕانیە لە زێی بچووک بەخاکەناس و تراکتۆر بەبێ غەسالە ڕاستەخۆ چەو و لمیان هێناوە، بەلاّم دوای ماوەیەک ئەم غەسالە گوازراوەتەوە بۆ پشدەر، لە سالّی (١٩٨٠) لە لایەن هەمان کەسەوە کارگەی بلۆکی ئاسۆس لە دەروازەی ڕانیە کراوەتەوە، ئەم کارگەیە لە سەرەتادا پێکهاتووە لە ئامێرێکی (زینێت– Zenith)ی ئەلّمانی و تێکەلّکەر و شۆڤلّ و بەرزکەرەوە و کابیسە لەگەلّ (١٢) ئۆتۆمبیلی گەورە(گەلاّبە)، بە (١٢) کرێکار کاری تێدا کراوە، لە سالّی (١٩٨١) گۆڕانکاری تێداکراوە و زۆر فراوانتربووە بەرهەمەکانی ئەم کارگەیە بریتیی بووە لە بلۆک بەقەبارەی(٣٠X٣٠، ٢٠X٤٠، ١٢X٤٠، ١٥X٤٠)، کربستۆن و کاشی بەقەبارەی(٢٠ X٢٠، ٢٠X٤٠)، شایگەر(٦٠X٦٠)، ئەم کارگەیە جگە لەوەی بلۆکی بۆ ڕانیە دابینکردووە، بلۆکی بۆ پشدەر و کۆیە و

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەلّ ئاسۆس ئەنوەر سالح: ٢٠١٦/٧/١٢، لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٧٦ ڕانیەیە و بەکالۆریوسی هەیە لە ئاماراداو، کارگەکە هی باوکی بووە و خۆشی کاری تێدا کردووە، ئێستا بە خێزانەوە لە ولاّتی ئەلّمانیا نیشتەجێن.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەلّ ئەمیر نەبی حەمەد: ٢٠١٦/٧/١٨، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٣ ڕانیەیە و دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانە، باوکی یەکێک بووە لە خاوەنی ئەم دەزگایە، ئێستا سەرپەرشتیاری پەروەردەییە لە ڕانیە.

باڵەکایەتی و دیانا و حاجی ئۆمەران ناردووە، زۆرجار سەرەگرتن بۆ بلۆک بەناو نووسین بووە و شەش مانگی خایاندووە.[١]

لە ساڵی (١٩٨٧) کارگەیەکی تری بلۆک بەناوی ئاکۆ لە ڕانیە کراوەتەوە و ئەم کارگەیەش ئامێرەکەی لە جۆری زینێت (زینێت- Zenith)ی ئەڵمانی بووە، سەرەتا کابیسەکەی شەشە بلۆک بووە، دواتر کراوە بە دوانزدە بلۆک، قەبارەی بلۆکەکەکانی(١٠x ١٠-30x30-40x40) بووە، رۆژانە توانای دروستکردنی (٦٠٠٠) بلۆکی هەبووە، ئەم کارگەی بلۆکانە تا ئێستاش بەردەوامن لە کارکردن، بەڵام لە ڕوی کوالێتی و جۆرەوە گۆڕانکارییان بەسەر داهاتووە، جگە لەم کارگانەی باسکران، لە ساڵی (١٩٨٠) لە شاردێی چوارقورنەدا کارگەیەکی بلۆک دروستکراوە، کە خاوەنەکەی سەفیر ئەحمەد خاڵە بووە لە ساڵی (١٩٨٨) کارگەیەکی تر لە ئۆردوگای حاجیاوا دروستکراوە لەلایەن بەکر حەمە غەریب. بە شێوەیەکی گشتی پیشەسازی بلۆک یەکێک بووە لە پیشەسازیە هەرە گرنگەکانی ئەو سەردەمە ئەمەش بەهۆی زۆری خواست لە سەری و دروست بوونی ئۆردوگا زۆرە ملێکان لە ناوچەکە و پەرەسەندنی گەشەی دانیشتوان و کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان لە گوندەکانەوە بەرەو شارەکان.[٢]

**٢- کارگەی پلاستیک و نایلۆن**

لە ساڵی (١٩٨٤) کارگەی پلاستیک و نایلونی بیتوێن لە لایەن کەسێکی ڕانیەوە بە ناوی ئەنوەر ساڵح عەزیز لە دەروازەی شارۆچکەکە دامەزراوە، ئامێری ئەم کارگەیە دروستکراوی عێراقی بووە و بە کارەبا کاریکردووە، ئەم کارگەیە قاپ و کەلوپەلی ناو ماڵ و دەبە و مەسینەی دروستکردووە، لە هەردوو جۆری مادەی پلاستیکی و نایلۆنی، بەشەو و ڕۆژ کاری تێداکراوە بەشێوازی سێ شیفتی، ژمارەی کرێکارەکانی (٢٤) کرێکار بووە تا ساڵی (١٩٩١) بەرهەمی دروستکراوی هەبووە.[٣]

**٣- کارگەی بڕینی ئیسفنج**

ئەم کارگەیە سەر بە کۆمپانیای نیشتمانی بۆ پیشەسازی کیمیاوی و پلاستیکی بەغدا بووە، لە (١٩٩٠/٤/١٦) لە لایەن خالد مستەفا بە بڕی (٦٥٠٠) دیناری چاپی سویسری لە گەڕەکی قەڵات بەناوی کارگەی (ڕێبوار) دامەزراوە، ئەم کارگەیە بە پشتگیری جێنشینی ڕانیە بووە بۆ فەرمانگەی پیشەسازی پارێزگای سلێمانی، پاشان لە ڕێگەی پارێزگای سلێمانی بۆ وەزارەتی پیشەسازی- کۆمپانیای نیشتمانی بۆ پیشەسازی کیمیایی و پلاستیک، کە مەڵبەندەکەی لە شاری بەغدا بووە دامەزراوە، کاری ئەم کۆمپانیایە بریتیی بووە لە ڕێگەی پێدانی بەرهەمی ئسفنج بە نرخێکی دیاری کراو بە خاوەنی کارگەکانی ناوچەکانی عێراق و دواتر فرۆشتنەوەی بەنرخێکی هەرزان، کاری ئەم

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەمال حاجی ئەحمەد: ٢٠١٦/٧/٩، ڕانیە، ناوبراو لە دایک بووی ١٩٦٨ ڕانیەیە و ئێستا خاوەنی کارگەکەیە و خۆی لە منداڵیەوە ئیش لە ناو کارگەکەدا دەکات.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ وەهاب ئەحمەد مەولود (حاجی وەهاب): ٢٠١٦/٧/٢٠.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئاسۆس ئەنوەر ساڵح: ٢٠١٦/٧/١٢.

کارگەیە تایبەت بووە بە بڕین و دروستکردنی ئیسفنجی کوشنی ئۆتۆمبیل، ئیسفنجی کورسی دانیشت و قەنەفە، ئیسفنجی ڕاخستن (ماڵان)، ئیسفنجی سەرشانی جل و بەرگ، ئامێرەکانی ئەم کارگەیە دروستکراوی وڵاتی یابان بووە، کە لە لایەن وەزارەتی پیشەسازی بە خاوەنی کارگەکە دراوە بە بڕی (٥٠٠٠) دیناری عێراقی، ئەم کارگەیە بەهۆی کێشەی تەکنیکی و تێکچوونی دۆخی سیاسی لە ناوچەکە نەخراوەتە گەڕ و بێبەرهەم ماوەتەوە.[١]

**تەوەری دووەم/ چالاکی بازرگانی**

بازرگانی یەکێکە لە چالاکییە ئابوورییەکانی مرۆڤ، کە بەکاربەر دەتوانێت پێداویستییەکانی خۆی لە کەلوپەل و خزمەتگوزاری دەستەبەربکات، خاڵی بەیەکگەیشتنی بەرهەمهێن و بەکاربەرە، تا بازرگانی گەشە بکات کەلوپەل و خزمەتگوزارییەکان بە ئاسانی و تێچووی کەمتر دەکەوێتە دەستی بەکاربەر بازرگانی دابەش دەبێت بۆ دوو بەش، ناوخۆ و دەرەکی، ئەرکی بازرگانی ناوخۆ گەیاندن و دابینکردنی کاڵا و خزمەتگوزارییە بۆ بەکاربەر لە سنووری جوگرافیای دەوڵەت، هەرچی بازگانی دەرەکییە ئاڵوگۆڕی کەلوپەلی ئابووری نیشتیمانیە لە دەرەوەی سنوری جوگرافیای دەوڵەت و پرۆسەی گواستنەوەی خاوەندارێتی کاڵا لە لایەنێکەوە بۆ لایەنێکی تر کە هاوردە و هەناردەیە،[٢] ڕانیە هەر لەکۆنەوە بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافیەوە، پێگەیەکی گرنگی هەبووە، ئەو گەڕیدە و ئەفسەرە سەربازیانەی کە هاتوون بۆ ناوچەکە ئاماژەیان بەم گرنگییەداوە.[٣] بەشێوەیەکی گشتی چالاکی بازرگانی دابەش دەبێت بۆ دوو بەش، ناوخۆ و دەرەوە، کە بەجیا باسی دەکرێت:

**أ- بازرگانی ناوخۆ**

وەک زانراوە ئابوری عێراق تا ساڵی (١٩٥٠) پشتی تەنها بە کشتوکاڵ بەستووە، دواتر ئابوری نەوت پەیدا بووە بەتایبەت دوای ساڵی (١٩٧٥) کە نرخی نەوت بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی کردووە، فرۆشتنی نەوت بۆتە هۆکار بۆ گەشەسەندنی سەرجەم کەرتە ئابووریەکان لە عێراقدا.[٤] گرنگترین ئەو بەروبوومە کشتوکاڵی و کەلوپەلانەی لە ماوەی لێکۆڵینەوەکە کاری بازرگانیان پێوە کراوە بریتی بوون لە:

---

[١] چاوپێکەوتنی لەگەڵ خالد مستەفا محمد ئەمین: ٢١ / ٨ / ٢٠١٦.

[٢] ڕیبوار خالد مستەفا: پارێزگای سلێمانی (١٩٦٨-١٩٨٨) توێژینەوەیەکی مێژووی ئابوریە، نامەی ماستەر (بڵاونەکراوە)، کۆلێجی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠١٤، ل٩٦.

[3] Admiralty War Staff: A Handbook of Mesopotamia,Vol III,January 1917,Page272.

[٤] گولدران عبدالرحیم عزیز: واقع النشاط التجاری فی اقلیم کوردستان- العراق (دراسة تحلیلیة لفترة ١٩٩٣- ١٩٩٨، رسالة ماجستیر (غیر منشورة)، کلیة الادرارة و الاقتصاد، جامعة دهوک، ١٩٩٩، ص٤٣-٤٤.

### ١ - بازرگانی تووتن

ڕانیە لەکۆنەوە ناوچەیەکی کشتوکاڵی بووە، یەکێک لەو بەرهەمە کشتوکاڵیانەی، کە زۆر داچێنراوە و کاری بازرگانی پێوەکراوە بەرهەمی توتن بووە،[١] لە سەردەمی عوسمانیەکانییەوە بەرهەمی توتن لە نێوان ڕانیە و کۆیە کاری بازرگانی پێوە کراوە،[٢] لە ساڵی (١٩٣٩) دا حکومەتی عێراقی دەربارەی بازرگانی تووتن چەند یاسایەکی دەرکردووە، لە یاساکەدا تەنها ڕێگەی بەوەداوە کە بازرگانی تووتن لە ڕێگەی فەرمانگەکانی ئینحیسارەوە مامەڵەی پێوەبکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش هەستاوە بە دامەزراندنی دەزگایەک و ئەنجومەنێکی بەڕێوبردن، بەم کارەش توانیویەتی بەتەواوی دەستبگرێت بەسەر پاوانکاری کڕین و فرۆشتنی توتن لە عێراقدا،[٣] لە چوارچێوەی کارەکانی دەوڵەتدا لە ساڵی (١٩٤٢) دا لیژنەی پشکنینی توتن لە ڕانیە دامەزراوە.[٤] لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٨-١٩٨٠) دا یەکێک لە بازرگانییە سەرەکییەکانی ڕانیە بازرگانی توتن بووە، لە دوای ساڵی (١٩٦٠) چەند بازرگانێکی تووتن لە شارۆچکەکە دەرکەوتوون وەک (باقی حاجی جەلال، عەبدوڵا خەسرە و محەمەد خەسرەو)، کە کۆگای تایبەتی تووتنیان هەبووە، لە بازرگانە بەناوبانگەکانی ڕانیە بوون.[٥] کاری بازرگانی تووتن لە ڕانیە بە دوو شێوە بووە شێوەیەکیان جوتیار یان موڵکدار ڕاستەوخۆ تووتنەکەی بەفەرمانگەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە فروشتووە، جۆرێکی تری بریتی بووە لە فرۆشتنی (سەلەم)[٦] ئەم جۆرەیان زیاتر پەیوەست بووە بەو جووتیارانە کە دۆخی ئابوریان خراپ بووە و نەیان توانیوە چەندین مانگ چاوەڕێ بکەن و لە ڕێگەی فەرمانگەی پشکنینی ڕانیەوە بەرهەمەکانیان بفرۆشن، ئەم توتنەی لە ڕانیە بازرگانی پێوە کراوە ڕاستەوخۆ بردراوە بۆ کارگەکانی دروستکردنی جگەرە بە تایبەت کارگەی جگەرەی سلێمانی.[٧]

وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا بازرگانی تووتن لە لایەن حکومەتەوە سەرپەرشتی کراوە، لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی تووتنی سلێمانی، فەرمانگەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە حکومەت کارەکانی ڕاپەڕاندووە، بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارەش بەچەند هەنگاوێک کارەکانی ئەنجامداوە، سەرەتا بەر لە پێگەیشتنی تووتن لیژنەیەکی تەخمینی پێکهیناوە لە سێ کەس بۆ سەردانیکردنی زەویەکان بە پێی پێوەری (٥) فەردە بۆ یەک دۆنم، دواتریش لە ناوەڕاستی مانگی ئۆکتۆبەر تووتنەکانی لە ڕێگەی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەمال عەبدوڵڵا حەمەعەزیز: ٢٠١٦/٧/٢٠.

[٢] جەمال فەتحولا تەیب: کۆیە ١٩١٨- ١٩٥٨ (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە)، چ٢، چاپخانەی شەهاب، ٢٠٠٨، ل٥٣.

[٣] د. بەختیار سەعید مەحمود: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤-٨٥.

[٤] فەخریە ئیسماعیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەمال عەبدوڵڵا حەمەعەزیز: ٢٠١٦/٧/٢٠.

[٦] سەلەم: جۆرێکە لە بازرگانی کڕین و فرۆشتنی بەروبوومی کشتوکاڵی، لە ڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە ئەم کارە حەلاڵکراوە بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی: ڕۆژێکی پڕشنگدار، چ٨، چاپخانەی دار المعریفە، لوبنان، بەیروت، ٢٠٠٩، ل١٦٢.

[٧] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ جەلال قادر مینە: ٢٠١٦/٧/١٣.

لیژنـەیـەکی تـر کـە سەرپەرشـتیکراوە لـەلایەن کەسـێکی نێـردراوی دەوڵـەت بـە پلـەی (خـەبیر) لـە فەرمانگەی پشکنینی تووتن لە ڕانیە، تووتن لە جوتیاران وەرگیراوە بە پێی پلەبەندی، پلەکانیش بریتی بوون لە نایاب یەک و دوو، پلە یەک تا چوار، ئەوەی کە زۆر خراپ بووە ڕەتکراوەتەوە بۆ جووتیار، لـە ڕووی کێشـەوە پێویسـتبووە فـەردە کێشـی (٥٠)کگـم بێت، ڕۆژانـە (٢٥٠-٣٠٠) فـەردە وەرگیـراوە، تـوتنی ڕانیـە بـە زۆری لـە جـۆری پلـە دوو و سـێدا بـووە، جووتیـار دوای تـەواوکردنی ئـەم کـارە لـە ڕێگـەی ژمێریـارەوە چەکـەی بـانکی بـۆ کـراوە، لـە ڕێگـەی بانکـەوە پـارەی فرۆشـتنی توتنەکـەی وەرگرتووە، ئەم بازرگانی توتنە تا ساڵی (١٩٩١) بەم شێوەیە بەردەوام بووە.[١]

**٢- بازرگانی خۆراک و کەلوپەلەکانی تر**

وەک ئاشـکرایە ڕانیـە شـارۆچکەیەکی بچـووک بـووە تـا سـاڵی (١٩٩١) لـە چەنـد گـەڕەکێکی دیاریکراو پێکهاتووە، کاری بازرگانیکردنیش لە ڕانیە ڕەنگدانەوەی قەبارەو خواست و پێویستییەکانی خەڵک بوو لە ناوچەکەدا، خەڵک بەگشتی هەژار بووە و ئەو کەلوپـەلانـەی بازرگانیـان پێوە کراوە، کە پەیوەست بووە بە ژیان و گوزەران و لە ڕێگە کشتوکاڵەوە نەتوانراوە بەرهەم بهێنرێن یـان کەلوپـەلی خۆراکی کە حکومـەت کـار ئاسـانی کردووە لـە پێدانیان بـە هاوڵاتیـان، وەک (ئـارد، شـەکر، چـا، بـرنج، قوماش). لە دوای ساڵی (١٩٥٨)چەند بازرگانێک پەیدا بوون لـە ڕانیـە کە کـاری هێنانی کـەل و پـەلی خۆراک و هەندێک کەلوپەلی تریان کردووە، لەوانە (حاجی عەلی فەیسەل، مستەفا عەلی مستەفا، عەلی یـەعقوب، قـادر محەمـەد سـەعید، ...هتـد). لـە سـاڵانی شەسـتەکان حکومـەت لـە ڕێگـەی وەکیلـەکانی خۆراکەوە هەسـتاوە بـە دابەشـکردنی کەلوپەلـەکانی وەک: (ئـارد، شـەکر، ڕۆن، چـا، بـرنج، ئاوەتەماتـە، هەویری ددان، مووس) ئەم سیستەمە جگە لەوەی سەرچاوەیەکی باش بووە بۆ هاوڵاتیـان لـە هـەمان کاتـدا بۆتـە هـۆی جوڵـەی بازرگـانی لـە ناوچەکـەدا ، کۆمـەڵێک کـەس بـەهۆی هێنـانی کەلوپـەل بـۆ وەکیلەکان بوون بە بازرگان.[٢]

ئـەوەی پەیوەسـت بـووە بـە سیاسـەتی حکومـەت بـۆ بـواری بازرگـانی، کـاری بازرگـانی و گواستنەوەی کەل و پەل و پێدانی بریکار لە ڕێگەی پێدانی پشتگیری جێنشینی شـارۆچکەکەوە بـووە بۆ بانکی ڕانیە و دانانی بڕێک لە سەرمایە لەم بانکە، پاشـان ئاراسـتەکردنی نووسـراوی قایمقایمـەت و بانکی ڕانیە بۆ ژووری بازرگانی و پیشەسازی سلێمانی، پاشان ئەو کەسـە لـەو ژوورە بۆتـە ئەنـدام و پێناسـی ژوری بازرگـانی پێـدراوە، کاتێـک ئـەو بازرگانـە ویسـتی هـەبووبێ کـارێکی بازرگـانی بکـات پشتگیری کراوە بە ئاراستەکردنی نووسراوی ژووری بازرگانی و پیشەسازی سلێمانی بۆ وەزراەتی

[١] چاوپێکـەوتنی تـوێژەر لەگـەڵ مەغدیـد عەبـدولرەحمان ئەحمـەد: ٢٠١٦/٧/١١، ڕانیـە، لـە دایـک بـووی ١٩٤٦ کۆیەیـە دەرچـووی پـەیمانگای کشـتوکاڵی (تـووتن) لـە سـوریایە، لـە تەمـەنی لاوییـەوە کەوتۆتـە ڕانیـە و فەرمانبـەر و بەڕێوبەری فەرمانگەی پشکنینی توتنی ڕانیە بووە.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەبدولکەریم حەمە خاڵە ڕەش: ٢٠١٦/٧/١٨، ڕانیـە، نـاوبراو لـە دایـک بـووی ١٩٥٣ لـە ساڵی ١٩٧٠- ١٩٩١ کاری بازرگانی کردووە لە ڕانیە.

